# ڕۆژە سەختەکان



## بیرەوەریەکانی شیوعیەک لە عێراق



نووسینی: بەهادین نوری

وەرگێڕانی: ئەنوەر نەجمەدین

سپتامبر ٢٠٢٠



ناوی کتێب: ڕۆژە سەختەکان

ناوی نووسەر: بەهادین نوری

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئەنوەر نەجمەدین

تیراژ: ۲۰۰۰ دانە

چاپ: چاپخانەی زانا

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ۱۷٤۸) ی ساڵی ۲۰۲۰ ی پێدراوە.

# پێڕست


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| بۆ خوێنەر | ٦ |
| پێشەکی چاپی دووهەم / چاپی عەرەبی | ٨ |
| بەشی یەکەم | |
| ڕاپەڕینێکی شکستخواردوو | ١٠ |
| ڕووداوێکی کتوپڕ | ٣٩ |
| پاگەندەی ڕاکردوویەک | ٤٤ |
| یەکەمین دابەش بوون | ٦٣ |
| بەشی دووهەم | |
| ڕۆژە سەختەکان | ٧٥ |
| ئەمە کێیە؟ | ١٠١ |
| لە شارۆچکەیەکی سنووریدا | ١١٧ |
| سەرلەنوێ لە بەغدا | ١٢٧ |
| ئامێرێک بۆ چاپ | ١٣٧ |
| مامە نهێنیەکەی لەلا ئاشکرا دەبێت | ١٤٥ |
| یەکەمین بڵاوکراوەی لەچاپدراو | ١٥٠ |
| زیانێکی گەورە | ١٥٦ |
| لە خانوە نوێکەدا | ١٧٦ |
| بەشی سێهەم | |
| گەشتێک بۆ دەرەوەی پایتەخت | ١٨٩ |
| لە شاری ئاڵتوونی ڕەش | ١٩٣ |
| ڕێکەوتێکی خراپ | ٢٠٤ |
| شەوێک لەژێر باراندا | ٢١٧ |
| دابەشبوونێکی تر | ٢٣٠ |
| گەڕانەوە بۆ پایتەخت | ٢٣٧ |

## بۆ خوێنەر

خوێنەری بەڕێز، لەم نامیلکەیەدا، چیرۆکێکت پێشکەش ناکەم لە خەیاڵ چنرا بێت. بەڵکو شتێکت پێشکەش دەکەم کە هەندێ کەس ناوی دەبەن بە "چیرۆکێکی تۆمارکراو"، ئەمە بیرەوەریی پیاوێکە لەو پیاوانەی وایان بۆ ڕێکەوتووە، ساڵانێکی درێژی سەردەمی پادشایەتی –نیمچە فیۆدالی بەکرێگیراو، لەگەڵ خۆشی و ناخۆشی ئەم گەلەدا بژین. لە ڕاستیدا نامیلکەکە ئەو یادەوەریانەن لەسەر شێوازی شێوە ڕۆمان دارێژراوە، نووسەر هەوڵیداوە، لە بەرگی ڕۆمانێکدا بیخاتەڕوو.

فەسڵەکانی چیرۆکەکە لەم نامیلکەیەدا تەواو نەکراون، تۆمارگەی تەواوی بیرەوەریەکان نین لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بەڵکو ئەمە لە فەسڵێک لە فەسڵەکانی چیرۆکێک دەچێت کە ڕووداوەکانی بەر لەو کاتەو دوای ئەو کاتە بگرێتەوە ئەم لاپەڕانەی بۆ تەرخان کراوە. نامیلکەکە لایەنێک لەو ڕووداوانە دەگرێتەوە کە عێراق لە ساڵی ١٩٤٩ دا بەخۆیەوە بینیوە، ئەو ساڵەی زۆر سەخت و قورس بەسەر گەلەکەماندا بە گشتی و ڕۆڵە خەباتگێڕە شۆڕشگێڕەکانیدا بە تایبەتی تێپەڕی و نەوەی لاوانی خەباتگێڕیش لە هاوڕێیانمان، هیچی لەبارەوە نازانن تەنها کەمێک نەبێت لەوەی بیستوویانە یان خوێندوویانەتەوە.

هەر هەنگاوێک لەو هەنگاوانەی عێراق دەیبڕی بە ڕێگای ڕزگاری و پێشکەوتندا، بەرهەمی خەباتێکی سەخت و قوربانیدانێکی زۆری گەلە تێکۆشەرەکەمان و حیزبە پێشکەوتووخوازەکانی بوو کە لە هێزە باشەکانی جیهان و جیهانی سۆشیالیستی و دونیای پێشکەوتووەوە پاڵپشتی دەکرا. ساڵی ١٩٤٩ لاپەڕەیەکە لە لاپەڕەی ئەو خەباتە سەختەو ئەو قوربانیدانە قورسە. هیواداریشم لەم لاپەڕانەدا سەرکەوتوو بووبم لە پێشکەش کردنی چەند شتێک لەوانەدا کە سوودمەند دەبن بۆ هاوڕێیانی نەوەی نوێ.

داوای لێبووردن دەکەم لە هەر لاوازیەک کە خوێنەر تێبینی دەکات لە داڕشتن و دەرئەنجامەکان. کات یارمەتی نەدام بۆ بایەخدان بەم لایەنە، بەڵکو نەمتوانی پێداچوونەوە بە ڕەشنووسەکەی یەکەمدا بکەم کە نووسی بووم، وە هەروا پێشکەشم کردن.

نووسەر

بەغدا، ئازاری ١٩٧٥

## پێشەکی چاپی دووهەم / چاپی عەرەبی

کاتێک لە کۆتایی ١٩٧٥ دا چاپی یەکەمی ئەم کتێبەم پێشکەش کردن، دڵنیا بووم لەوەی لە جەماوەری خوێنەرەوە جێی باوەڕو پێشوازیەکی باش دەبێت.

ئەوەی ئێستا، لە دەرکردنی چاپی دەووهەمدا دەمەوێت بیڵێم، ئەوەیە کە دەتوانم نەک بە جەماوەری خوێنەری بڵێم و بەس، بەڵکو بە هاوڕێیان و برایانی نووسەری پێشکەوتنخوازیشی بڵێم. یەکەمین شتێکیش کە حەز دەکەم پەنجەی بۆ ڕابکێشم ئەوەیە کە ئەو پێشوازیە گەرموگوڕەی ئەم کتێبە لە خوێنەرانەوە، دەلیلێکە لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو شتەی پێشتر منیش و کەسانی تریش، ئیشارتمان بۆ کردبوو دەربارەی دەگمەنی ئەو نووسراوانەی خراونەتەڕوو لەسەر مێژووی خەباتی گەلەکەمان و چینە کرێکاریەکەمان، ئەو مێژووەی دەوڵەمەندە بە فاکتەو بە شانازیی و بە هەژارییش لە نووسیندا لە سەری. جەماوەری خوێنەر دەیانەوێت، ئەو دیاردە نێگەتیفە چارەسەر بکرێت. بەم مانایە، شیکردنەوەی ئەم داوایەی ژمارەیەکی بێشومار لە خوێنەری (کتێبەکە)، وای کرد بەردەوام بم لە دەرکردنی بەشی دووهەمیش. ئەوە بە باوەڕی من، بانگەوازێکە بۆ هەموو نووسەرە خەباتگێڕەکان کە دەتوانن ئەو چەکە مەزنە بەکاربهێنن ناودەبرێت بە "پێنووس"، ئەمەیش بۆ زیندووکردنەوەی کەلەپووری گەلەکەمان و خەباتە نایابەکەی و پێناسەکردنی لایەنە دیاریکراوەکانی خەباتی ئەوەی ڕابووردوو بۆ ئەوە لاوەکان.

بۆشاییەکی هەستپێکراو لە جیهانی ئەدەب و چیرۆکی شۆڕشگێڕیدا هەیە لە وڵاتەکەماندا، ئەمەیش لە نووسین و لەچاپدانی دەگمەنەوەیە دەربارەی کەلەپووری خەباتگێڕانەی گەلەکەمان. ئەو شتانەی بە پێنووسی عێراقی نووسراون دەربارەی ڕووداوەکانی عێراق و مێژووە خەباتگێڕەکەی، زۆر کەمترە لەوەی کە پێویستە بنووسرێتەوە. ئەو ژمارە کتێبەیشی وەرگێڕدراون و لە چاپ دراون، ئەو بۆشاییە پڕ ناکەنەوە، گەرچی بەسوودو پێویست بوون بۆ ڕوون کردنەوە بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەسەر ڕێڕەوی ئەو

تێکۆشانانەی میللەتانی تر بڕیوبانە. هیواداریشم پێنووسە باشەکان، هاوبەشیەکی چالاکانە بکەن لە چارەسەری ئەم دیاردەیەداو سەرکەون بەسەر ئەو قورساییانەدا کە ڕێگری وەدیهێنانی ئەم ئەرکە نیشتمانیە دەبێت بەباشی.

باشترین شتێکیش کە نووسەرێکی خەباتگێڕ چاوەڕێی دەکات، هەر ئەو پێشوازیەی جەماوەرە بۆ خوێندنەوەی ئەوەی بڵاوی دەکاتەوەو گوێیشی لە ووشە هاندەرە باشەکانیان دەبێت.

نووسەر

بەغدا، ۱۹۷۸

## بەشی یەکەم

# ڕاپەڕینێکی شکستخواردوو

سەعید لەو ژوورە بچکۆلەیەدا دانیشتبوو کە تازە گواستبوویەوە ناوی لە پایتەخت، سەرلەنوێ چاوێکی بەو پەرتووکە مارکسیستی و نامیلکە شۆڕشگێڕیانەدا خشاندەوە کە ژوورەکەیان پڕ کردبوو. بەڕاستی کتێب و نامیلکەی چاکن: هەمووی وانەو ئەزموونن. سەعید خوێندبوونیەوەو سوودێکی باشیشی لێ وەرگرتبوون. ئەو دەیزانی ئەمانە بۆ ئەوە نەنووسراون وەک قوتابی قوتابخانە لەبەر بکرێن، بەڵکو بۆ ئەوە دانراون ڕێ نیشاندەری خەباتگێڕە شۆڕشگێڕەکان بن لە چالاکیە پراکتیکیەکاندا. سەعیدیش بەو هەموو حەماسەوە، لەسەریەتی ئەوەی لەو کتێبانەوە فێر بووە، لە ژیانی پراکتیکیدا پراکتیزەیان بکات، هەر ئەمەیشە دەرچەی دەرباز بوون لەو بارودۆخە قورسەی وڵاتی تێکەوتووە، چارەسەری ئەو کێشە سەختانەیشە میللەت بە دەستیەوە دەناڵێنێت.

نزیکەی ساڵێک لەمەوبەر عێراق دەکوڵا، کوڵانێکی شۆڕشگێڕانە. دەنگی ناڕەزایەتی بەرزو بەرزتر دەبووەوە، گیانی بەرهەڵستی میللی فراوانتر دەبوو، کاژێری تەقینەوە نزیکتر دەبووەوە. قامچی تێرۆر، توانای بێدەنگ کردنی جەماوەری یاخی لە یاساو سەرکوت کردنی "ئاژاوەگێڕەکان" ی نەمابوو. معجزەکە بەتایبەتی ئا لەو کاتەدا بوو: ڕاپەڕینە میللیە مەزنەکە، هەموو نیازەکانی باڵوێزخانەی بریتانیای بەسەر سەرا هەڵگێڕایەوە، ڕێکەوتننامەی پۆرتسمۆس[1] و هەموو ئەو پەنجانەیشی پێوە شکاند کە ئامادەی واژۆ کردنی بوون. ئەی ئایا ئێستا ڕوودانی معجزەیەکی نوێ لە شێوەی ڕابووردوو، مەحاڵە؟ نەخێر، مەحاڵ نیە. سەعید دڵنیایە لەوەی دەشێت معجزەیەکی نوێ ڕووبداتەوە. وڵات هەر

---

[1]. پەیماننامەی پۆرتسمۆس پەیماننامەیەک بووە لە نێوان مەملەکەتی عێراقی و بریتانیادا مۆرکراوە لە پۆرتسمۆس لە ١٥ / ١ / ١٩٤٨ دا. ئەمیش بە ئامانجی وەدیهێنانی ئیمتیازاتێکی زۆر بۆ بریتانیا لە عێراقدا.

هەمان وولاتەو میللەت هەر هەمان میللەتەو حیزبی شیوعییش هەر هەمان حیزبەو .. و .. و .. هتد. ئیتر بۆچی ئەمە ڕوونادات؟ بەم نزیکانە بیرەوەری یەک ساڵەی ڕاپەڕینی کانونی ۱۹٤۸ دێت و جەماوەر ڕادەپەڕێتەوە. شیوعیەکانیش هیچیان لەسەر نیە دەستپێشخەری بانگەوازێک نەبێت بۆ نوێ کردنەوەی ڕاپەڕین. بێگومان کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستان بەرهەڵستی ڕاپەڕین دەکەنەوە، هەموو هەوڵێکیش دەخەنەگەڕ بۆ سەرکوت کردنی، هەروەک چۆن بەر لە ساڵێک لەمەوبەریش ئەمەیان کرد. بەڵام ئەنجامی ئەو هەوڵە هەر شکست دەبێت، هەروەک چۆن لە ڕابووردویشدا هەر شکستی خوارد. سەعید دڵنیایە لەمە، لە خراپترین حاڵیشدا دوژمن، پەنا دەباتە بەر جەنگێکی توندوتیژ دژی جەماوەری میللی و بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکەی. بەڵام نابێت ئەمە؛ خەباتگێڕە شۆڕشگێڕەکان بترسێنێت، ئەگەر دوژمنیش ویستی جەنگی قەلاچۆ کردن بەرپا بکات، دەبا بیکات.

"بەڵێ، دەبێت ڕاپەڕین لە یادی یەک ساڵەیدا نوێ بکرێتەوە" -ئەم بیرە لەلای سەعید گەڵاڵە بوو، هەر ئەوەندەیشی باسەکەی خستەڕوو، (ڕەنوف) ی هاوڕێیشی بەبێ ڕاوێژو بەبێ ڕەتکردنەوە هاوڕای بوو. جا ئەمە ڕاوێژی بۆچیە؟ ڕەنوف "سەرکردەیەکی پراکتیکیە" و قووڵبوونەوە لە کاروباری تیۆری و نەخشەسازیدا بە پێویست نازانێت. بەلای ئەوەوە وا باشە ئەو لایەنە بۆ هاوڕێ سەعید جێبهێڵێت، ئەویش خۆی تەگبیری جێبەجێ کردنی بگرێتە ئەستۆ. ئەو بەڕای خۆی، شارەزایی لەو لایەنەدا زۆر ترە، بەپێچەوانەی هاوڕێکەیەوە کە شارەزای لایەنە تیۆریەکان بوو.

ئاگاداری بە ڕێکخراوە بریندارەکانی حیزبدا بڵاوکرایەوە بۆ کارکردن لە پێناوی نوێ کردنەوەی ڕاپەڕیندا. دەبێت خۆپیشاندانی میللی ڕێک بخرێت و دروشمی شۆڕشگێڕی دژ بە کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستی تێدا بەرز بکرێتەوە، دەبێت خۆپیشاندەرانیش بە دارو کوتەک و بەرد چەکدار بکرێن و لە چاکترین ئامادەباشیدا بن بۆ بەرهەڵستی پۆلیس کە بەشێوەیەکی حەتمی هێرش دەهێنێت، دەبێت بە پۆلیسدا هەڵبژێن و تێکیان بشکێنن هەروەک ساڵی ڕابووردوو.

ڕێکخراوەکانی حیزب لەو پارێزگایەدا، لێدانی توندوتیژیان بەر نەکەوتبوو، وەک ئەوەی بەر براکانیان کەوتبوو لە پارێزگاکانی تردا، لەبەر ئەوە چاوەڕێ دەکرا بەشداریەکی چالاکانە لە پرۆسەی ڕاپەڕیندا بکرێت. هەموو دەلیلەکانیش ئەوەیان دەسەلماند کە سکرتێری ڕێکخراوەکە (فەتاح) و جێگرەکەی (نەجیب)، بە حەماس بوون لەسەر هاوبەشی کردن لەو پرۆسەیەدا. بۆیە بەهیوایەکی زۆرەوە، ئامادەکاری دەستی پێکرد بۆ ئەو خۆپیشاندانەی بە مەبەستی نوێ کردنەوەی ڕاپەڕین ڕێکدەخرا. پەیوەندی دەستی پێکرد، هاوڕێیان و تەنانەت لایەنگرانیش ئاگادار کرانەوە.

- خۆپیشاندان لە فلان کاتداو لە فلان شوێنەوە دەستپێدەکات. خۆت ئامادە بکە، هاوڕێیان و دۆستانیش ئاگادار بکە بۆ ئامادە بوون و بەشدار بوون.
- هەموو هاوڕێیانی شانەکەت ئاگادار بکە بەشداری خۆپیشاندانەکە بکەن. هەریەکەشیان دارێکیان بەدەستەوە بێت و چەند بەردێکیش بخەنە گیرفانیان. بەرهەڵستی پۆلیس دەکەین هەرکات هێرشی هێنا، وە تێکیدەشکێنین.
- خۆپیشاندانەکە بە هوتافی یەکێک دەستپێدەکات، چەپڵەیەکی بەکۆمەڵ و هوتافی تر بەدوایدا دێت هەتا قەرەباڵەغیەکە کامڵ دەبێت. بەڵام سەبارەت بە بەردەوام بوونی خۆپیشاندانەکەو بڵاوە پێکردنی، ئەو ووشەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردەکەی. بڵاوەکردن نیە بەبێ فەرمانی سەرکردەی خۆپیشاندانەکە.

ئاگاداریەکە گەیشتە هەموو لیژنەو شانە حیزبیەکان، لەناویشیانا ئەو شانەیەیش کە هاوڕێ حسێن ڕێکی دەخست. لەو شانەیەدا هەڵوێستی هاوڕێیان جیاواز بوو لەسەر کارە پراکتیکیەکان، ئەگەرچی کەسیان بە ئاشکرا بەشداری کردنیان لەو خۆپیشاندانە نزیکەدا ڕەت نەدەکردەوە. هەموویان لە قووڵایی دڵەوە، هیوای نوێ بوونەوەی ڕاپەڕینیان دەخواست، بەڵام هەندێکیان هیوایەکی زۆریان بە خۆپیشاندان نەبوو. جەبار بڕیاری دابوو بە حەماسەوە بەشداری خۆپیشاندانەکە بکات، بەڵکو هەرگیز بیری لەوە نەکردبۆوە بەشداری نەکات، ئەو شیوعیەو لەسەریەتی فەرمانی حیزب جێبەجێ بکات،

نابێت بیر له شکاندنی فەرمانەکانی حیزب بکاتەوە. ڕەسوڵ دوو دڵ بوو، تووشی حاڵەتێکی سایکۆلۆژی توند بووبوو، نەگەرچی ئەمەی لەلای ڕێکخەرەکەی نەدرکاندبوو؛ واق ووڕمابوو، نەیدەویست بەشداری بکات، بەڵکو ناوێرێت خۆی بخاتە ڕیسکی بەشداربوونەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئارەزووی شکاندنی فەرمانی حیزبی و تێکدانی زەبتورەبت ناکات، بۆیە دەبوو لە دوا چرکەساتەکاندا باشتر بیر بکاتەوەو بریار لەسەر هەڵوێستی خۆی بدات، لەوانەیە بچێت بۆ شوێنی خۆپیشاندانەکەو چاودێریەکی بارودۆخەکە بکات و لەوێ دوا بریاری خۆی بدات دەربارەی بەشداری کردن یان بەشداری نەکردن. بەڵام سەبارەت بە هاوڕێ جیهان، ئەو تەواوی ئامادەگی خۆیی دەربڕی بۆ بەشداری کردن کاتێک ڕێکخەرەکەی فەرمانی پێکرد، بەڵام دوای ئەوەی بیری لە شتەکە کردبۆوە؛ ڕای خۆیی جێگیر کردبوو کە نە ئامادە بێت و نە بەشداری بکات، خۆ کێ دەزانێت بەشداری کردووە یاننا! دوایش دەتوانێت پاگەندەی ئەوە بکات کە بەشدار بووە لە خۆپیشاندانەکەدا، یان بیانوویەک دەدۆزێتەوە بۆ بەشداری نەکردنی. ئەو جیهانەو ڕۆڵی ئەو کە شایستەی سەرسووڕمان و پیاهەڵدانە لە هاوڕێکانیەوە لە خۆپیشاندانە گەورەکاندا دوای کانونی دووهەمی ١٩٤٨، لەبیر کەس نەچۆتەوە. ئاه، ئەگەر بارودۆخەکە هەروەک ئەوسا بوایە، ئەگەر ئەو بارودۆخە بگەڕایەتەوە، ئەوکاتە دەتانبینی چۆن بە ووشە ئاگراویەکانی، حەماسی جەماوەری میللی بەرز دەکردەوە! بەڵام، بەداخێکی گرانەوە، بارودۆخەکە گۆڕراوە. لەوانەیە هەندێ کەس بە ترسنۆکی ناوبەرن ئەگەر بەشداری خۆپیشاندانەکە نەکات، بەڵام ئەو دان بەو تۆمەتەدا نانێت و خۆیشی بە ترۆسنۆک نازانێت کە نایەوێت بەشداری بکات و دواڕۆژی خۆی لەدەست بدات. وە هیچ حیکمەتێکی تێدا نیە خۆی بدات بە گرتن و ئەشکەنجەو زیندان تەنها بۆ بەشداری کردن لە خۆپیشاندانێکدا.

تۆفیقیش کە دۆستێکی حیزب بوو، پێشتر بەشداری کردبوو لە خۆپیشاندانداندا، ڕایەکی تری هەبوو، کاتێک کە دەیەویست بەشداری خۆپیشاندانەکە بکات. ئەو بەڕاستی ئارەزووی

بەشداری کردنی دەکرد، بەڵام ئەی کێ دوکانە بچکۆلەکەی بۆ دەبات بەڕێوە، کێ ژنەکەی و پێنج منداڵەکەی دەژێنێت ئەگەر لە خۆپیشاندانەکەدا گیراو زیندانی کرا؟ یان ئەویش وەک ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆڵەکانی گەل بەر حوکمی عورفی ناکەون و ناخرێنە زیندان هەر تەنها لەبەر بەشداریی کردنیان لە خۆپیشاندانەکاندا یان لە کۆبوونەوە جەماوەریەکاندا؟ کەواتە چاکتر وایە ئێستا خۆی کەنار بگرێت تا ببینێت دوایی بارودۆخەکە چۆن دەبێت.

خاڵێک لە بازاڕدا هەڵبژێردرا تا خۆپیشاندانەکەی لێوە دەستپێکبکات. ڕەنگە شوێنێکی قەرەباڵغ باشتر بێت لە بازاڕدا، سوودەکەیشی ئەوەیە ژمارەیەکی زۆرتر دەڕژێنە ریزەکانیەوە. زیاتر لەوەیش ئەو قەرەباڵغیە یاریدەدەر دەبێت بۆ خۆشاردنەوەی هاوڕێیان و برادەران هەتا کاتی بریاردراو بۆ دەستپێکردنی خۆپیشاندانەکە لەچرکەساتی خۆیدا.

لەو شوێنە لە ناوبازاڕدا، قەرەباڵغیەکی نائاسایی دەبینرا، هەرچەندە جووڵەی کڕین و فرۆشتن لە ڕۆژانی تر زیاتر نەبوو. دوو گەنج لەبەردەم دوکانەکەی مام عارفدا وەستابوون، نەیاندەویست هیچی لێبکڕن و پشتیشیان تێنەدەکرد! ئەی کەواتە ئەمانە لێرەدا چی دەکەن؟ تۆ بڵێی بیانەوێت شتێک لە دوکانەکەی ئەو یان دوکانێکی تر بدزن، یان چاوەڕێی کەسێکن؟ بەڵام بۆچی یەکێکیان جارجارە سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەکات؟

مام عارف چاوو هۆشی لای ئەو دوو لاوە غەریبە بوو کە لە تەنیشت دوکانەکەیەوە وەستابوون، کاتێک هوتافی یەکێکیان لە بۆشاییەکەی نزیک ئەوەوە، بەرز بۆوە:

بڕوخێ کۆلۆنیالیزم و داروەدەستە ناوخۆییەکانی:

ژمارەیەکی کەم وەڵامیان دایەوە: بڕوخێ. ئینجا چەپڵەیەکیان لێداو گردبوونەوە بچووکەکە دەستی بە فراوان بوون کرد. ئەو دوو لاوەی پێشتر لەبەر دوکانەکەی مام عارفدا وەستابوون، بە پەلە چوونە نێو گردبوونەوەکەوە. مام عارف بینی ئەوە خۆ یەکێکیان

لەوێ هوتاف دەکێشێت و بە حەماسەوە چەپڵە لێدەدا. ئاها، کەواتە ئەمانە لە چاوەڕوانیدا وەستابوون!

سەرکردەی خۆپیشاندانەکە هوتافی دەکێشا، دەمامکێکیشی بەدەمەوە بوو، بۆیە ئاسان نەدەناسرایەوە. بۆ چوارهەم جارو پێنجەم جارو شەشەم جاریش هوتافی دەکێشاو چاودێریی فراوان بوونی گردبوونەوەکەی دەکرد. پێنج خولەک تێپەڕی و گردبوونەوەکە گەورەتر بوو، ئەمە ئەگەرچی ژمارەیەک لە پیاوانی پۆلیس و سیخوڕ لە دەوری گردبوونەوەکە کۆبووبوونەوە، بەڵام لە چاوەڕوانیی هێزی فریاگوزاریدا، هەر تەنها چاودێرییان بە بەس دەزانی. زیاتر لە پۆلیسێکی نهێنیش، وەک پێشبڕکێ، بەرەو سەرا ڕایانکرد هەتا هەواڵی خۆپیشاندانەکە بگەیەننە ئۆفیسەری پۆلیس و مفەوەزەکان. بەڵام مەهدی وەک پۆلیسی نهێنی، جۆرێکی تر جووڵایەوە، لە سووچێکەوە بە قەڵەم و کاغەزێکەوە وەستاوە، لە دوورەوە کەوتە تۆمار کردنی ناوی ئەوانەی لە خۆپیشاندانەکەدا دەناسرانەوە.

سەرکردەی خۆپیشاندانەکە ئاراستەی ڕێپێوانەکەی دیاری کردو فەرمانیدا بە جووڵە. بەدەم جووڵەیشەوە گردبوونەوەکە بە هاتنی کەسانی تر بۆ ناوی، گەورەتر دەبوو. ژمارەیەک لە هاوڕێیان بوونە گاردی خۆپیشاندانەکە لە پێشەوەدو پشتەوە. دوکاندارەکان ئەم ڕووداوە ناکاوەیان چاوەڕێ نەدەکرد: خۆپیشاندانە! جا ئا لەم کاتەدا؟ ئەوان بەدڵەڕاوکێوەو لە نێوان ترس و دڵخۆشیەوە دەیانڕوانیە ئەوەی ڕووی دەدا. محەمەد سەعید ڕووی کردە دوکاندارەکەی تەنیشتی و گووتی:

- ئەم شیوعیانە ئەڵێی جنۆکەن، کەس نازانێت لە کوێوە هەڵدەقوڵێن! بەڵام شێرن.

خۆپیشاندانەکە بازاڕی شاری هەژاندو ڕاوێژێکی توونده خستەوە. هەندێک ستایشیان دەکردو هەندێک ڕەخنەیان دەگرت. هەندێک دڵخۆش دەبوون و هەندێکیش بە

پێچەوانەوە. ڕێپێوانەکە بەبێ وەستان دەڕۆیشت، هوتافات هەر زیادی دەکرد، زۆر کەس ئەوەیان بیردەکەوتەوە کە بەر لە کەمتر لە ساڵێک ڕوویدا:

- بڕوخێ تێرۆری ڕەشی پۆلیسی!
- بڕوخێ!
- بڕوخێ حوکمی بەکرێگیراوی کۆنەپەرستی!
- بڕوخێ!
- ئەی جەماوەری گەلە تێکۆشەرەکەمان! هەستن بۆ تێکۆشان؛ ڕاپەڕینە نەمرەکەی کانون زیندووبکەنەوە!

هاوڕێ ڕۆستەم حەزی لە خوێندنەوەی هۆنراوەیەک بوو بۆ خۆپیشاندەران؛ چووە لای سەرکردەی خۆپیشاندانەکە، مەجید، هەتا داوا بکات ڕێی پێبدەن هۆنراوەکەی بخوێنێتەوە:

- ئەتوانم ئەم چەند بەیتە بخوێنمەوە؟ ئەوەتا، ئەتوانیت بیانبینیت.
- بەداخەوە، کات بەسەرچوو.

ڕۆستەم بەو وەڵامە دڵخۆش نەبوو. ئەو شاعیرە، شیوعیە، شەونخونی کێشاوەو ئەو چەند بەیتەی داڕشتووە بۆ بەرزکردنەوەی حەماسی خۆپیشاندەران. دەشێت ئێستا ڕێی پێنەدرێت بیخوێنێتەوە؟ لەوکاتەدا کە ڕۆستەم بیری لەمە دەکردەوە، هێزەکانی پۆلیس نزیک دەبوونەوە، دیار بوو هێرش دەبەنە سەر خۆپیشاندانەکە. بەشێک لە خۆپیشاندەران خۆیان ئەدزیەوەو بەرەو کۆچەو کۆڵانەکانی دەوروەی خۆپیشاندانەکەو دەرەوەی بازاڕەکە هەڵدەهاتن. تا دەهات گردبوونەوەکە بچووک دەبووەوە، ئەمە لەکاتێکا گردبوونەوەی پۆلیس، بە ئاشکراو بە نهێنی، گەورەتر دەبوو.

ئەوا هێزێکی تریش لەبەردەم خۆپیشاندانەکەدا دەرکەوت، هێزێکی گەورەتریش لە پشتیەوەیە. هوتافات بەردەوامە. خۆپیشاندەران هوتافەکە دەڵێنەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی چاویان لەو هێزانەی پۆلیس بترووکێنن کە چواردەوریان دەگرتن. ئای لەم چرکەساتە هەستیارە! دوای چەند چرکەیەک هێرش لە دوژمنەوە دەستپێدەکات، پێکدادانێکی ناهاوتا لە ڕووی ژمارەوە دەکەوێتە نێوان هەردوولا. هاوڕێکانیش چاوەڕێی سەرکردەی خۆپیشاندانن. دواین ووشە لای ئەوە. دەبێت چی بڵێت؟ ئایا هەر سوورە لەسەر پێکدادان لەگەڵ پۆلیس، یان خۆی لەو پێکدادانە لادەدات و لە چرکەساتێکی گونجاودا فەرمان دەدات بە بڵاوەکردن و هەڵاتن؟ مەجید بڕیاری لەدەستدایە بەپێی پێویستی بارودۆخەکە هەڵسوکەوت بکات. بەڵام ئا لەو چەرکەساتانەدا ئاسان نیە بۆی کە پێویستە چی بکرێت. ئەو پێشتر سەرکردایەتی هیچ خۆپیشاندانێکی نەکردووە. ئەمە یەکەمجارە سەرکردایەتی خۆپیشاندانێکی لەوجۆرە دەکات. دەبێت چی بکەین؟ کەمێک تێڕاماو بڕیاری خۆیدا: دوای چەند مەترێک، شوێنەکە لەبارە بۆ بڵاوەکردن، سەری چەند کۆڵانێک دیارە کە دوژمنی تێدا نەوەستاوە، لەوێ فەرمان دەدات بە بڵاوەکردن بەبێ قوربانیدان. ئەم ڕێپێوانە نیمچە شارراوەیەی خۆپیشاندانی یەکەم بەسە.

- بڵاوەبکەن هاوڕێیان!

خۆپیشاندانەکە لە چەند چرکەساتێکدا بڵاوەی کرد. دوژمن سەرسام بوو بەمە. دوای بڵاوەکردن و دابەش بوونیان بەسەر چەند کوچەو کۆڵانێکدا، پۆلیس هێرشی کردە سەر خۆپیشاندەران، ژمارەیەک پۆلیس خۆپیشاندەرێکیان گرتبوو، ئەویش بەدەم ڕاکردنەوە خەریکی لوول کردنی لافیتەکەی دەستی بوو. ژمارەیەک لە خۆپیشاندەران پیاوانی پۆلیسیان بەردەباران کردو ناچاریان کردن بە کشانەوە. وە ئیتر وا دیار بوو پیاوانی پۆلیس بۆیان دەرکەوت ڕاوودونانی ئەمانە کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو ڕسکیشەو ئەبێ خۆیانی لێبپارێزن. وە هەر خێرا خۆپیشاندەران، بە ڕاکردن لە کۆڵانەکانەوە، گەیشتنە شوێنێکی بێ مەترسی و کەسیش بە دوایانەوە نەمابوو.

کەواتە با "پێشبڕکێی ڕاکردن" یش کۆتایی پێ بێت و بچینە ناو ماڵەکانەوە، وەک لەوەوبەر بڕیار درابوو. ماڵەکانی ئەم شارەیش چەند سەرسووڕهێنەرن! هەموویان کراوەن لەبەردەم خۆپیشاندەراندا، بۆ ئەوانەی لەدەست "دادپەروەری" هەڵاتوون. هەموویان بە سنگ فراوانیەوە، باوەشیان بۆ ئەو لاوە نەناسراوانە دەگرتەوە کە یاخی بوون لە دەسەڵات و یاساکانی و لە پیاوانی پۆلیسەوە ڕاودەنران. بچۆرە هەر ماڵێکەوە کە ڕێت لێیدەکەوێت، هەر تەنها خۆپیشاندەرێکی ڕاونراو بیت، بەسە بۆ ئەوەی ژن و پیاوو مناڵ بکەونە چاودێریت. ئەوانە هەموویان بە سۆزەوە لەگەڵتان، دژی دوژمنە سیاسیەکەتن، دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکەن و شەونخونی بەدیار سەلامەتیتەوە دەکێشن و پۆلیس چەواشە دەکەن لە گەڕاندا بە دوای تۆدا، خواردنت بۆ دەهێنن، ئیتر بەبێ ئەوەی بتناسن، وە هیچ گرنگ نیە بەلایانەوە تۆ کێیت، تۆ خۆپیشاندەریت، بۆیە هیچیان لێنابینیت پێشوازی نەبێت.

مەجید هەر لەو کاتەوە کە فەرمانیدا بە بڵاوەکردن و ڕێڕەوی ئاراستەی خۆپیشاندەرانی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی نەکەونە داوی پۆلیسەوە، ئیتر ئەو ڕۆڵی سەرکردایەتی نەما، وە دوای بڵاوەکردن هەروەک هەر خۆپیشاندەرێکی تر، قاچەکانی هەڵنا بەرەو یەکێک لە کۆڵانەکان. وە ئەوەی دواتر تووشی هات و بیرناچێتەوە ئەوەیە کە: دەرگایەکی کراوەی بینی و خۆی پیاکرد، ئیتر بەبێ ئەوەی بزانێت ماڵی کێیەو کێی تێدایە، هەر خۆیشی دەرگاکەی داخست هەتا لە خراپترین حاڵدا، ڕێ لە چوونە ژوورەوەی پۆلیس بگرێت، ئەگەرچی کەسیش لەوانە لەوێدا نەبوون کە ڕاویان دەنان. لە تارمەی ماڵەکەدا چوار ژن لە دەوری تەنورێک دانیشتبوون و نانیان دەکرد. لێیان نزیک بۆوە، هەرچی ترس و شڵەژان بێت پێیانەوە دیار نەبوو، ئەمە هەروەک ئەوەی ئەمە شتێکی ئاسایی و ناسراو بێت لەلایان. یەکێکیان پرسی:

- ئەوە چیتە کوڕەکەم؟ چیت ئەوێت؟
- من خۆپیشاندەرم .. پۆلیس بەدوامانەوەیەو بڵاوەی پێکردووین.

- ده ئاڵەوێدا دانیشە، هیچ مەترسە.
- مەجید گووتی: پەیژە هەیە بۆ سەربان؟ پورە گیان وا چاکترە بچمە سەربان و لەوێ بم، ئەو وا بیری دەکردەوە سەربان ئەمین تربێت، چونکە لەوێوە ئاسانە باز بدەیتە سەر سەربانەکانی دراوسێکان و هەڵبێیت ئەگەر پۆلیس چواردەوری ماڵەکەیان گرت. یەکێک لە ژنەکان وەڵامی دایەوە:
- ئا ئەوە پەیژەکەیە کوڕەکەم! ئەتوانیت سەرکەویت، چیت بەلاوە باشە ئەوە بکە. نازەنین، ئا تۆیش دەرگاکە داخە نەکا کەس خۆی بکا بەژوورا.

مەجید بە پەیژەیەکی داردا سەرکەوت و بە دڵنیاییەوە لەسەر دواین پلەی دانیشت و چاودێری دەرەوەی دەکرد، هەروەها ژن و منداڵێش کەوتبوونە چاودێری گەرەکەکە بۆ پاراستنی ئەم میوانە نەناسراوە. دوای کەمتر لە چارەکێک کچێکی منداڵ بە زەردەخەنەیەکەوە، بە چاوە زبرەکەکانیەوە، نانە چەورەیەکی گەرمی هێنا بەرەو مەجیدو دایە دەستی:

- فەرموو، ئەو نانە گەرمە بخۆ .. دایکم بۆی ناردوویت.
- زۆر سوپاس – مەجید بەبێ دوودڵی نانەکەی خوارد. ئەمەیش لە نەرێتی ئەم شارەداو لەم حاڵەتانەدا زۆر ئاساییە ژنان نانێک بدەنە میوانەکەیان.

مەجید نزیکەی کاژێرێک لەو ماڵەدا مایەوە، چووە دەرەوەو ڕووی کردە گەڕەکی مەڵکەندی کە ئەو خانوەی لێبوو چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا بۆ خەباتی ژێرزەمینی، گواستبوویەوە ناوی بۆ ئاسان کردنی پەیوەندیەکان لەگەڵ ڕێکخەرەکەیدا، هاوڕێ نەجیب، کەسی دووهەم لە ڕێکخراوی پارێزگاکەداو ئەو تێکۆشەرە شیوعیەی کە مەجید بە نموونەی دەزانی.

نەجیب لاوێکی ئەسمەری باریکەلە، چاوەکانی فراوان، باڵای مامناوەندی، قوتابی پلەی ناوەندی بوو، کوڕی یەکێک بوو لە فەڕاشەکانی قوتابخانەکان. ئەو خەباتگێڕێکی

شۆڕشگێرو شیوعیەکی چاک و بەڕەوشت و ئازا بوو، خۆی بەخت دەکرد لە پێناوی حیزبدا. نەخۆشی تێکیشکاند بوو، بەکتریا سیەکانی هەڵوەشاندبوو. بەڵام خۆی نەدەدا بەدەست نەخۆشیەوە، هیچ کارێکیشی نەدەخستە سەروو کارە حیزبەیەکانیەوە. خۆی بۆ حیزب تەرخان کردبوو، وە هەستی بە بەرپرسیارێتی خۆی دەکرد وەک کادرێکی شیوعی لەبەردەم چینی کرێکارو هەموو گەلدا. کاتێکیش لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا کە خۆپیشاندانەکەی تێدا ڕێکخرا بوو؛ لەگەڵ مەجید یەکتریان بینی، زۆر بە بایەخەوە گوێی بۆ ڕاپۆرتەکە گرت کە سەرکردەی خۆپیشاندانەکە بەدەم بۆی باس دەکرد. ڕاپۆرتەکەیش وەسفێکی ووردو واقیعی ڕووداوەکە بوو، وەک ئەوەی ڕوویدا، ئیتر بەبێ شیکردنەوەی ڕووداوەکان و وەرگرتنی دەرئەنجام. ئینجا نەجیب چەند پرسیارێکی کرد:

- ژمارەی بەشدار بوان چەند بوو لە خۆپیشاندانەکەدا؟
- نزیکەی ۲۰۰ کەس دەبوون.
- پۆلیس توانی کەس بگرێت؟
- ئەوەندەی من ئاگادار بم کەس نەگیرا.
- هەڵوێستی خەڵکی چی بوو لە بازاڕدا لەسەر خۆپیشاندانەکە؟
- چەپڵەیان بۆ خۆپیشاندانەکە لێنەدا.
- تکا ئەکەم ڕاپۆرتێک بە نووسین بەرز بکەیتەوە بۆ حیزب.
- ئامادەیە لەلام – مەجید ڕاپۆرتەکەی لە گیرفانی دەرهێناو دایە دەستی.
- دەبێت ئامادەکاری بکەین بۆ خۆپیشاندانێکی تر.
- کەی دەبێت؟
- بەزووترین کات. دوای دوو ڕۆژ ئەگەر دەکرێت.

* * *

نەجیب بەر لەوەی ماڵەکە جێبهێڵێت، نووسراوێکی دەستخەتی لە گیرفانی چاکەتەکەی دەرهێناو دایەدەست مەجیدو گووتی:

- تکا ئەکەم چەند وێنەیەکمان لەم بڵاوکراوەیە بۆ بنووسەرەوە، دە هەتا بیست کۆپی، یان هەرچەند دەکرێت.
- ئەمشەو بۆی دادەنیشم و تەواوی دەکەم، سبەینێ بەیانی دەیدەمەوە دەستت.

نەجیب ڕۆیشت و مەجید یەکسەر دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو دانەیەی بەدەست نووسرابووەوە لە بڵاوکراوەکە. بڵاوکراوەکە بانگەوازێک بوو کە وازۆی لیژنەی ناوەندیی حیزبی پێوەبوو، داوای لە ڕێکخراوەکانی حیزب و ڕۆڵەکانی گەل و ڕای گشتی دەکرد بۆ تێکۆشان لە پێناوی ڕزگار کردنی ژیانی سەرکردەی حیزب هاوڕێ فەهد لەو مەترسیەی تێی کەوتووە. هاوڕێی گەورەو خەباتگێڕی شۆڕگێڕو نەبەرد لە مەترسیدایە، هاوڕێیان و دۆستان .. جەلادەکان و بەکرێگیراوان، لە ڕیزی هاوڕێکانی لە زیندانی کووت دەریانهێناوەو لەگەڵ هاوڕێ هەرە نزیکەکانیدا زەکی بەسیم و حسێن شەبیبی، گوازراونەتەوە بۆ لێکۆڵینەوەو کۆمیدیای نێو دادگای سەربازیی بۆ کۆتایی هێنان بە ژیانیان.

ووشە ئاگراویە کاریگەرەکان زۆر بە توندی مەجیدیان هەژاند، ئەویش وەک هەموو شیوعیەکانی تری عێراق، لەناخەوە فەهدی خۆشدەویست. هەرچەندە ئەو ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیبینی بوو، بەڵام وەک سەرکردەیەکی نموونەیی و پیاوێک دەیناسی کە ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە ئاراستەکردنی بزووتنەوەی شیوعی و جێگیرکردنی نەرێتە ئینترناسیۆنالیستیە نەمرەکان لە عێراقدا. ئەو فەهدی لە ڕێگای ئەو ووتارە گرنگانەوە ناسی بوو کە بەو ناوەوە لە ڕۆژنامە نهێنیەکانی حیزبدا بڵاودەکرانەوە (القاعدة)، وە لەڕێگای دادگایی کردنەکەیەوە ناسی بووی کە لە ١٩٤٧ دا زۆر بە بایەخەوە شوێنی کەوتبوو. وە هەروەها -کە ئەمە گرنگترینیانە- لە ڕێگای دانراوەکەیەوە دەیناسی "حزب شیوعي لا اشتراكية ديمقراطية - حیزبێکی شیوعی نەک سۆشیال دیموکرات". ئەو دانراوەی مەجید بەردەوام خەریکی

خوێندنەوەی بووەو زۆر بەخێرایی هەموویشی کۆپی کردبوو کاتێک وێنەیەکی لێدەستکەوتبوو؛ دەبوایە دوای سێ ڕۆژ بیگێڕایەتەوە. ئەو کۆپیە ئەسڵیەی گێڕابۆوە کە بە ئامێری چاپی دەستی چاپ کرا بوو، لەگەڵیشیدا دوو وێنەی دەسخەتیشی ناردبوو، دوو وێنەیشی بۆ خۆی لێهەڵگرتبوو بە بایەخەوەو بە قەوارەیەکی گونجاوەوە. ڕەنگە لە ژیانی هەموو کەسێکدا ڕووداوێک هەبێت بیر نەچێتەوە، لەلای مەجیدیش ڕووداوی ئاگاداربی لەو نامیلکەیە بۆ یەکەمجار، ڕووداوێکە نە بیری چۆتەوەو نە بیریشی دەچێتەوە. نامیلکەکەی خوێندەوەو بیری لە هەموو برگەو هەموو ڕستەیەکیشی دەکردەوە. لێی فێر بووبوو، زانیاریەکی باشی لێوەرگرت، هاوڕێکانیشی هان دەدا بیخوێننەوەو لێوەی فێر بن.

مەجید لەسەر بەڕەیەک دانیشتبوو کە لە ژوورێکی بچکۆلەی ناو بینایەکی قوڕینەی کۆندا ڕاخرا بوو، قەڵەمێکی قۆپی بەدەستەوە بوو، مێزەکەیشی تەشتێکی مسی هەڵەوگێڕاو بوو، ئەمە نەک بۆ نامیلکە خۆشەویستەکەی، بەڵکو بۆ ئەو بانگەوازەی زەنگی مەترسیەکی گەورەیەو داوایە بۆ خەبات کردن بۆ ڕزگار کردنی ژیانی دانەری ئەو نامیلکەیە. هەر لەو کاژێرانەدا هاوڕێی تریش هەبوون لە ماڵەکانی تردا لە شار، بە هەمان ئەرکەوە خەریک بوون -کۆپی کردنەوەی ئەو بانگەوازە. ڕۆژی دواتر ڕێکخراوەکانی حیزب وێنەی بانگەوازەکەیان بڵاوکردەوە، گەرچی هەر لە سنوورێکی دیاریکراودا بوو. هەموو شیوعیەکان بە حەماس بوون بۆ کارکردن لە پێناوی ڕزگار کردنی سەرکردەکەیاندا لە مەترسی مردن، بە هەر شێوازێک بێت.

* * *

سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە بیرەوەیی یەک ساڵەی ڕاپەڕینی بە ڕۆژی خۆپیشاندانی دووهەم دیاری کرد. ئاگاداریەکان هەر هەمان ئاگادارییبن. دەبێت هەموو شتێک وەک ئەوەی ڕابووردوو بێت، ئیتر لەڕووی "خۆچەکدار کردن" ی خۆپیشاندەران بە دارو بەرد، ڕێکخستنیان، هوتافاتیان، وە هەرچی تر. بەڵام شتێکی نوێ دێتە نێو خۆپیشاندانە

نوێکەوە: تابوتێکی ڕەمزی بۆ ڕێزنان لە خۆبەخت کردوانی ڕاپەڕینە نەمرەکەی کانون. خۆپیشاندانەکە ئەو تابووتە هەڵدەگرێت بەرەو گۆڕستانی سەیوان کە یەکێک لەو خۆبەتکارانەی ڕاپەڕینی لێ نێژراوە، لەوێیش هەر بەو بۆنەیەوە، گووتار دەخوێنرێتەوەو هوتاف دەکێشرێت.

شوێنی دەستپێکردنی خۆپیشاندانەکە گۆڕرا، بەڵام شوێنە تازەکەیش هەر بازاڕی ناوشار بوو. ئەمجارەیش هەر هەمان ئەو لاوەی بە دەمامکەکەوە لە خۆپیشاندانی پێشوودا هوتافی دەکێشا، دەرکەوتەوە، هوتاف و چەپڵە چەخماخەی دەدا، هاوڕێیان لە دەوری لافیتەی یەکەم کۆبوونەوە کە بەرزکرابۆوە. گردبوونەوەکە هەر زیاد دەکات، بەڵام بە هێواشی. دوای کەمێک، خەڵکێکی کەم لە مزگەوتێکی نزیک بەو شوێنە هاتنە دەرەوە، تابووتێکیان هەڵگرتبوو بە پارچە قوماشێکی ڕەش داپۆشرابوو، تاجە گوڵینەیەکیشی لەسەر دانرابوو. هەڵگرانی "تەرمەکە" هاتنە ناو خۆپیشاندەران، وە ئیتر هەموو خۆپیشاندانەکە بووە شێوەی ڕێپێوانێک بۆ ناشتن. ماوەیەک بێدەنگی باڵی کێشا بەسەریدا، سەرنجی هەموانیش، بە خۆپیشاندەرو تەماشاکەرەوە، بۆ لای ئەو "مردووە" دەچوو کە خۆپیشاندەران بەمجۆرە هەڵیان گرتووە. ژمارەیەکی کەم نەبێت لە ئامادەبوان، ئەم تابووتە ڕەمزیە لای هەموان، بە پیاوانی پۆلیسیشەوە کە دەردەکەوتن، وەک تەرمێکی ڕاستی دەهاتە پێشچاو، وەک مردوویەک کە دەبرێت بۆ ناشتن لە گۆڕستان. "سەرچاوەی" ئەم مردووە ناکاوە کوێیە؟ ئایا پۆلیس لە پێکداداندا کوشتوویەتی؟ ئایا لە شەقامەکاندا تێرۆر کراوە یان لەژێر شکەنجەدا گیانی بەخشیوە، هتد؟ هەموو ئەم شتانە وەک نهێنیەک بوون لەلای پۆلیس و خەڵکی تەماشاکاریش، وە تەنانەت لەلای خۆپیشاندەرانیش کە لەوەوبەر بە ناشتنێکی ڕەمزی هەڵنەسابوون، بەڵام هەرچۆن بێت، ئاشکرایە کە خۆپیشاندانەکە "تەرمی" گیانبەختکردوویەکی پێیە.

خۆپیشاندانەکە لەناو شارەوە کەوتەڕێ، بەڵام بە پێچەوانەی ناراستەی خۆپیشاندانەکەی پێشوو. هیچ شتێک لە ڕوانین و هەڵوێستی دوکاندارو تەماشاکاراندا

نویێ نەبوو بەرامبەر بەم خۆپیشاندانە تەنها پرسیار نەبێت لەم گیانبەختکردووە نوێیە. گردبوونەوەی پۆلیسیش بە شێوەیەکی نیمچە ڕێکخراو لە پێشەوەو پشتەوەی خۆپیشاندانەکە دەجوولا، هەروەک ئەوەی ئەوانیش خۆپیشاندەر بن! بەڵام "ڕێپێوانەکەی پۆلیس" بەبێ دەنگی دەبزوا، ئەمە لەکاتێکا هوتافی ڕێپێوانە شیوعیەکە بەردەوام بوو:

- ئەمری و سەربەرزی بۆ گیانبەختکردوانی ڕاپەڕینی کانون.
- سەرشۆڕی بۆ کۆلۆنیالیزم و بەکرێگراوە خائینەکان.
- بژی تێکۆشانی جەماوەر بۆ نوێ کردنەوەی ڕاپەڕینی ئەمری کانون.
- بژی بەرەی نیشتمانیی یەکگرتوو.

دوای ئەوەی خۆپیشاندانەکە بازاڕەکەی جێهێشت و کەوتە سەر شەقامەکان بەرەو گۆڕستانی سەیوان، ئینجا قەوارە ڕاستەقینەکەی بەڕوونی دەرکەوت. ئەمەیش بەهۆی ئەوەوە نەبوو کە خەڵکی بێنە نێو ڕیزی خۆپیشاندەران، بەڵکو هێزەکانی پۆلیس هەر گەورەتر دەبوون بە هێزی نوێ و پۆلیسی سوارەو چەند ئۆتۆمۆبێلێکی پۆلیسەوە. لە ڕاستیدا خۆپیشاندانەکە چواردەوری گیرابوو، بەڵام پۆلیس دەستی بۆ هیچ کەسێک نەدەبرد. واپێدەچوو نیازیان وابێت لەسەر قەبران چواردەوری گردبوونەوەکە بگرن و دوای ناشتنی مردووەکە هەموویان بگرن! بۆیە بڕیار لەسەر هەڵوێست قورستر بوو بوو. شیوعیە بچکۆلەکەمان، هاوڕێ حەسەن، کە قوتابی ناوەندیێ بوو؛ لە سەرکردەی خۆپیشاندانەکە، مەجید، نزیک بۆوەو بە دەنگێکی نزم گووتی:

- بەنیازی چیت هاوڕێ؟ چواردەورمان دەبینی؟
- پێشنیارێکت هەیە؟
- وا چاکە هەر ئێستا بڵاوە بکەین، دەنا هەموان دەگرن بەبێ جیاوازی.
- جارێ کاتی بڵاوەکردن نیە. ڕێگەشیان نادەین خۆپیشاندەران بگرن.

- بەڵام هێزەکانیان چەندانجار لە هێزی ئێمە زیاترە، پۆلیسی سوارەو ئۆتۆمۆبێلیان پێیە.
- ئەوە ڕاستە، بەڵام چارەسەرێک دەدۆزینەوە. بچۆرەوە جێی خۆت لە خۆپیشاندانەکەدا هاوڕێ.

حەسەن چووەوە شوێنی خۆی، بەڵام بەبێ ئەوەی ووشەکانی مەجید لە دڵەڕاوکێی خستبێت. ئەویش تاکە هاوڕێ نەبوو کە لە دڵەڕاوکێدا بوو، کەسانی تریش هەبوون وەک ئەو. ئەو ژنانەیشی لە سەربانەکان و بەردەرگای ماڵەکانیانەوە دەیانڕوانیە سەر شەقامەکان، ترس و دەڵەڕاوکێی هەموانی زیاد دەکرد. وەستا فەرەجی دارتاش، ئەم دیمەنەی لە شەقامەکەدا بینی، خوێن لە دەمارەکانیدا وەستا، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، ماوەیەکیش بەبێ جووڵە لەجێی خۆی وەستا. ئەو دڵنیا بوو کوڕە شیوعیەکەی، حەمید، لە ڕیزی ئەو خۆپیشاندەرانەدایە کە پۆلیسێکی زۆر چواردەوری گرتوون. کەوتە چاوگێڕان بۆ کوڕەکەی، بەڵام نەیدۆزیەوە. دەیەویست لە خۆپیشاندەرێک بپرسێت ئایا کوڕەکەی لە ناویانایە، بەڵام بە دوودڵیەوە گەڕایەوەو پرسیاری نەکرد. بەرەو دوکانەکەی ڕۆیشت، بەڵام هەموو گیانی دڵەڕاوکێ و ترس بوو، هاواری لە خوا کرد:

- خوایە کوڕەکەم و مناڵی خەڵکی بپارێزیت، خوایە هەموو پۆلیسەکان نابیناکەیت، خوایە!

کاتێک وەستا گەیشتەوە دوکانە بچکۆلەکەی هەستی بە هیلاکیەکی زۆر دەکرد، کاری بۆ نەدەکرا، وە هەر لە خوا دەپاڕایەوە کوڕەکەی و منداڵی خەڵکی بپارێزێت. بەڵام هەر بە خێرایی شتێکی چاوەڕوان نەکراوی بینی: دوکاندارەکەی دراوسێی، فەتحوڵڵا، شیوعی بوو، نەبوایە ئەویش ئێستا وەک حەمید لەنێو خۆپیشاندەراندا بوایە، بەڵام ئەوە فەتحوڵڵایە بە خوێن و ئێسقانیەوە، ئەوەتا لە دوکانەکەیدا دانیشتووە!

- فەتحوڵڵا، وام ئەزانی ئێستا لەگەڵ هاوڕێکانتی لە خۆپیشاندان، کەچی ئەتبینم لە تەنیشتمەوەی!
- وەستا من مۆڵەتم هەیە، بۆم هەیە بەشداریی خۆپیشاندانەکە نەکەم.
- چۆن مۆڵەتت وەرگرتووە، ئەی بۆچی مۆڵەتێکیشت بۆ حەمیدی کوڕم وەرنەگرت؟
- کوڕەکەی تۆ منداڵەو بژێوی کەسی لەسەر نیە. بۆیە ئەو پێویستی بە موڵەت نیە. بەڵام وەک خۆت دەزانیت، من ژن و منداڵم بەسەرەوەیە. کێ بەخێویان بکات ئەگەر من بگیرێم و بخرێمە زیندان؟
- ئەی براکەیشت، فاتح، هەروەک تۆ مۆڵەتی خواستووەو لە بەشداریی کردن بەخشراوە؟
- نا، ئەو خۆی نایەوێت ببەخشرێت. ئەو یەکێکە لە هوتاف کێشەکان. لە خۆپیشاندانی پێشوویشدا لافیتەی هەڵگرتبوو.
- ئەی بۆ داوای مۆڵەت ناکات؟ ئەی ئەویش ژنی نیەو نابێت منداڵەکانی بەخێو بکات؟
- ئەو ئازایە، ناشترسێت و گوێ بە منداڵیش نادات کاتێک ئەرکی حیزبی دەکەوێتە ئەستۆی.
- کەواتە تۆ ترسنۆکیت! هەی ترسنۆک! ئێستا لە هەموو شتێک تێگەیشتم. لەمەولا منیش گوێ نادەمێ تەنانەت ئەگەر حەمیدیش بگیرێت. ئەمەوێ جەربەزە بێت وەک فاتیحی برات نەک ترسنۆک بێت وەک تۆ. تێگەیشتیت؟

فەتحوڵڵا هەستی بە شەرمەزاری کرد لە بەرامبەر ئەم سووکایەتی پێکردنەی وەستا فەرەجدا، وە ئیتر دوای ئەوە قرەوقەپی لێکرد.

خۆپیشاندانەکە بەخێراییەکی مامناوەندیی دەڕۆیشت، هێدی هێدی لەناو بازاڕەکە دووردەکەوتەوە هەتا ئەو شوێنەی مەجید بە گونجاوی دەزانی بۆ بڵاوەکردن. جیاوازیی ئەم

شوێنه لەوەدایه کە خۆپیشاندانەکە گەیشتۆتە بەردەم مزگەوتێک دوو دەرگای هەیە، یەکێکیان لەسەر ئەم دەرگایەیەو دووهەمیان دەکەوێتە سەر کۆلانێک لە لایەکی ترەوە. ئەگەر خۆپیشاندەران لەم دەرگایەوە بچنە ژوورەوەو لەوی تریانەوە دەرچن، ئەوا ئۆتۆمۆبێل و پۆلیسی سوارە ناتوانن دوایان بکەون. هەر پیادەکانیان دەتوانن لە دەرگاکەوە دوایان بکەون، خۆپیشاندەرانیش ئەوەندە بەردو داریان پێیە کە ڕێگریان لێبکەن. هەر بەوجۆرە خۆمان لە قوربانیدانی زیان بەخش لادەدەین. وە ئیتر کاتی فەرماندان هات لە سەرکردەی خۆپیشاندانەکەوە: بڵاوە بکەن!

تابووتەکە لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا دانراو قوماشە ڕەشەکەو تاجە گوڵینەکەی لەسەر لابراو لافیتەکانیش زۆر بە خێرایی لوول کران. خۆپیشاندەران بەرەو حەوشەی مزگەوتەکە هەڵاتن تا لە دەرگاکەی تریەوە دەرچن. وا دیار بوو نەخشەی بڵاوە کردنەکە سەرکەوتوو بوو، چونکە بەشداریی ئۆتۆمۆبێل و پۆلیسی سوارەی پەکخست لەوەی دوایان بکەون. پیادەکانیش بە تەنها نەیاندەوێرا دوایان کەون. بەڵام ئەم شەڕە بەبێ قوربانی تێنەپەڕی. پۆلیس هاوڕێیەکی گرت. تابووتەکەیش ڕۆڵی خۆیی هەبوو، هەندێک لە هاوڕێیان لە کاتی بڵاوە کردندا لێی هەڵنوتان و کەوتن، بۆیە هەندێکیان توانای ڕزگاربوونیان نەبوو.

هەروەک هەمیشە، دوای بڵاوە کردن، خۆپیشاندەران خۆیان کوتایەوە ماڵ و کووچەو کۆلانەکانەوەو لە پۆلیس ڕزگاریان بوو. مەجید هەر بە ڕێکەوت لەبەردەم هەمان ئەو خانوەدا خۆی بینیەوە کە لە خۆپیشاندانی پێشوودا پەنای بۆ برد. هەمان پێشوازی و چاودێریی بینیەوە بەدرێژایی ئەو کاتەی زیاتر لە کاژێرێکی خایاند. پاشان گەڕایەوە ئەو خانوەی خۆیی تیدا شاردبۆوە لە مەڵکەندی. لەوێ دوای ماوەیەکی کورت، هاوڕێ نەجیبی ڕێکخەری بینیەوە کە زۆر بە هەڵپەوە چاوەڕێی هەواڵی خۆپیشاندانەکە بوو:

- خۆپیشاندانی ئەمڕۆ چۆن بوو بە بەراوورد لەگەڵ ئەوەی ڕابووردوو؟ نەجیب پرسی.

- ژمارەی بەشداربوان کەمتر بوو. ئەمڕۆ تەنها ١٥٠ هاوڕێیەک بوون.
- پێکداداان ڕوویدا لەگەڵ پۆلیس؟
- شتێکی وا ڕووینەدا باس بکرێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە هاوڕێیەکمان گیرا. ئیتر نازانم ئایا دوای بڵاوە کردن کەسی تر گیرابێت یاننا.
- تکایە ڕاپۆرتێک بە نووسین پێشکەش بکە، ئەمە لەگەڵ بیرکردنەوە، هەر لە ئێستاوە، بۆ ئامادەکاری بۆ خۆپیشاندانی داهاتوو.
- دوای دوو کاژێر ئامادە دەبێت.

مەجید ڕاپۆرتەکەی لەسەر خۆپیشاندانەکە نووسی. ئەمجارەیش هیچ دەرئەنجام وەرگرتنێکی تێدا نەبوو کە لەسەر شیکردنەوەی بارودۆخەکەو ئەو داکشانە بێت بزووتنەوەی شۆڕشگێری تووشی هاتبوو، بەڵکو وەسفێکی واقیعی ڕووداوەکە بوو. دوای ئەوەیشی باسەکەی لە مەجید بیست، هەر بە ئەجیبەوە دیار نەبوو کە دەرئەنجامێک وەرگیرابێت. ژنی ماڵەکە لە نوێژ کردندا، دوا ووشەی ئەو دوو هاوڕێیەی گوێ لێبوو. هەر دوای تەواوکردنی نوێژەکەی، داوای لە خوداو پێغەمبەرو کاک ئەحمەدی شیخ کرد پشتووپەنای کوڕە شیوعیەکەی و هەموو شیوعیەکان و هەموو موسڵمانان بێت. ڕووی کردە ئەو میوانەی لە ماڵەکەیدا خۆی شاردۆتەوە، واتە مەجید:

- ئێوە شیوعین، زۆر مرۆڤی چاک و بە ڕەوشتن. ئێوە حەزتان بە جەورو ستەم نیەو نابنە هۆی ئەزیەت بۆ خەڵکی، ئیوە هەر چاکەتان دەوێت بۆ خەڵکی. دوای هەموو نوێژێک داوای خێرو سەرکەوتنتان بۆ دەکەم. تەنها شتێک کە ڕازی نەبم لێتان هەر ئەوەیە کە نوێژ ناکەن. ئەگەر نوێژ بکەن سەرکەوتوو دەبن، سەرکەوتوو.
- پورەگیان هەر دوعامان بۆ بکە، زوو یان درەنگ هەر سەردەکەوین.

- نوێژ بکەن، کورەکەم نوێژ بکەن، خوا سەرتان دەخات. ئەمڕۆ هەر داوام لە فریشتەکان کردووە چاوی دوژمنەکانتان کوێر بکات لە کاتی خۆپیشاندانەکەتاندا.

* * *

لە ئێوارەدا پەیامبەرە بچکۆلەکە کە هەر لە تەمەنی دوانزە ساڵاندا دەبوو، نامەیەکی داخراوی لە نەجیبەوە هێنابوو بۆ مەجید، ئەویش بە پەلە کردیەوەو خوێندیەوە:

- هاوڕێ! بریار درا دوو سبەی، کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆو لەو شوێنەی لەسەری ڕێکەوتین، خۆپیشاندانەکەی داهاتوو بکرێت. هاوڕییانی ڕێکخراوەکان ئاگادار دەکرێنەوە. ئێوەیش لە لایەنی خۆتانەوە بە تەگبیری پێویست هەستن. هیچ شتێکی نوێیش نەخراوەتە سەر ئاگاداریەکانی پێشوو.

مەجید نامەکەی خوێندەوە، بۆ یەکەمجار بیری لەوە کردەوە کە ئایا ڕاستە خۆپیشاندانێکی نوێ بکرێت یاننا، بەڵام لە وەلامی نامەکەی نەجیبدا هیچ ناڕەزامەندیەکی دەرنەبڕی، ئیتر نە لابەلاو نە بە ئاشکرایش.

کاتی خۆپیشاندانی سێهەم هات کە ئامانجەکەی هەر نوێکردنەوەی ڕاپەڕینی کانونە، ئەو کاتەیش دەکەوتە دوای یادی یەک ساڵەی ئەو ڕاپەڕینە. لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا لە ساڵی ڕابووردوودا، جەماوەر لە هەڵچوونێکی شۆڕشگێڕیی گەورەدا بوو، وە دەیان هەزاری دادەبەزاندە سەرشەقامەکان و گۆڕەپانەکانی بەغداو شارەکانی تری عێراق. کۆنەپەرستان تۆقیبوون و لە پاشەکشەدا بوون. بەڵام ئەمڕۆ کە سێهەم خۆپیشاندان دەکرێت، بارودۆخەکە تەواو پێچەوانەیە، داکشان جێگای هەڵکشانە شۆڕشگێریەکەی ڕابووردووی گرتۆتەوە، گرژبوونەوە جێگای هەڵمەت و ترس جێگای بوێریی گرتۆتەوە. بۆیە هیچ شتێک نیە هیوایەک بەهێز بکات لە نوێکردنەوەی ڕاپەڕیندا، ئیتر ئەمە تەنانەت لەلای

خۆپیشاندەران خۆشیان کە هیوایەکیان بە خۆپیشاندانی یەکەم و دووهەم هەبوو ڕاپەڕین بە هەوڵەکانیان زیندوو بێتەوە. کاتێکیش مرۆڤ خەباتگێڕ، هیواکانی وون دەکات بە وەدیهێنانی داواکانی، ئەوکاتە ئیتر گرنگترین هۆکار لەدەست دەدات بۆ کار کردن. کەواتە ئەم خۆپیشاندانە چۆن دەبێت؟

ئەوە دیسان ئەو دەمامکدارەیە کە لە هەردوو خۆپیشاندانەکەی ڕابووردوودا دەردەکەوت، هوتاف بە ژیانی گەل و بە ڕووخاندنی کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستیدا دەکێشا. هوتافەکان دووبارە دەبنەوەو دەشگۆڕدرێن، بەڵام ئەمجارە مەجید بە ژمارەیەک چەپڵەی کەم پێشوازی کرا، زۆر کەمتر لە ژمارەی دوو خۆپیشاندانەکەی پێشووتر. بەڵام دەبێت هەر هوتاف و چەپڵە بەردەوام بێت هەتا گردبوونەوەکە گەورەتر دەبێت، ئەمە ئەگەرچی شوێنی گردبوونەوەکە نزیکیشە لە بارەگای سەرەکی پۆلیسەوە. وا بڕیار بوو خۆپیشاندانەکە لەو شەقامەوە دەستپێبکات کە گردبوونەوەکەی تێدا بوو لە گەڕەکی سابونکەران. بەڵام کەمی ژمارەی نامادەبوان، هاندەر نەبوو بۆ دەستپێکردن. کەواتە با هوتاف و چەپڵە بەردەوام بێت لە هەمان شوێندا بەهیوای فراوانتر بوونی کۆبوونەوەکە. فراوانیش دەبوو، بەلام بەهێواشی. ئەوا ژمارەکە تێپەڕی بیست و سی و چل کەسی کرد. ئەوا نزیک بووەوە لە پەنجا کەس. بەڵام چاوەڕوانیەکە هەر درێژەی کێشا.

بە دووری سەد مەترێک، ئۆتۆمۆبێلی پۆلیس لە هەمان شەقامدا دەرکەوت کە ژمارەیەکی زۆری لە پیاوانی پۆلیس هەڵگرتبوو بە چەک و بە دارەوە. دەماری هەردوو لایەن کرژ دەبووەوە، پێکدادانیش لە نزیک بوونەوەدایە. خۆپیشاندەران کەمێک لە شەقامەکە کشانەوەو چوونە کۆڵانێکەوە، بەردەوامیش بوون لە هوتاف کێشان، سوودیان لەوە وەردەگرت کە ئۆتۆمۆبێلەکان نەیان دەتوانی بچنە ئەو کۆڵانە تەسکانەوە، ئەمەیش بەشێک لە دوژمنەکانیان دەکاتە پیادە وەک خۆیان! شەڕەبەرد دەستی پێکرد بە توندی. پۆلیس هەر بە خێرایی زیادی دەکرد، بوونە دوو ئەوەندەی خۆپیشاندەران. گردبوونەوەی دووهەم کەمی دەکردو بچووک دەبووەوە، هەندێ کەس لە ترسا هەڵاتن. زەبری پۆلیس لە

بەرەی دژدا بەهێزتر دەبوو، وە زۆر توند شەڕیان دەکرد، هەنگاو بە هەنگاویش لە کۆڵانەکە دەکشانەوە. بەڵام خۆپیشاندەران مەترسییان لەسەر نەبوو، چونکە هەر هێزی پیادە بەرەنگاریان بووبوونەوە.

لەکاتێکا هەردوو گروپە شەڕکەرەکە بەردو پارچە خشتیان دەگرتە یەکتر، یەکێک پێوە بوو، ئەو لە ماڵێکی نێو ئەو کۆڵانەوە، لە مەودای نێوان هەردوو لایەنەکەوە بە ڕاکردن دەرچوو بەرەو خۆپیشاندەران و لە ترسیشا لێیان تێپەڕی. بەڵام بە سەلامەتی دەرنەچوو لە دەستیان، یەکێکیان دارێکی کێشا بە سەریدا. ئەو لاوە وەک یاریدەدەری سەرکردەی خۆپیشاندانەکە دانرا بوو، وە لەسەری بوو سەرکردەی خۆپیشاندانەکە بکات هەرکات سەرکردەکەی شتێکی لێهات. بەڵام لە ترسنۆکیدا ڕیزی خۆپیشاندەرانی جێهێشت و هەر لە چرکەساتی یەکەمی پێکدادانەکانەوە خۆی فڕی دابووە ئەو ماڵەوە. کاتێک هەست بە نزیک بوونەوەی مەترسی دەکات، جارێکی تریش، لە ترسی پۆلیس، هانای بۆ ڕاکردن بردبۆوە لە کۆڵانەکەیشەوە. ئەو لێدانەیش بە دەستی هاوڕێیەک بوو کە بە باشی دەیناسی و بە ڕقەوە لێیدا.

خۆپیشاندەران هێدی هێدی، بەدەم شەڕەوە کشانەوە تا گەیشتنە بۆشاییەکی بچکۆلە کە چوار کۆلانی لەسەر بوو. بەڵام شتێک ڕوویدا کە کەس بە بیریدا تێنەپەڕی بوو: ژمارەیەکی زۆر پۆلیسی سوارە، پشتەوەی لێگرتبوون. دیار بوو سەرکردەی هێرشبەری پێچەوانە، ئەزموونەکانی زۆر لە سەرکردەی خۆپیشاندانەکە فراوانتر بوو، بۆیە هێزەکانی لە پشتەوە دابەزاندبوو، بەمەیش تەڵەکەبازانە، چواردەوری خۆپیشاندەرانی گرتبوو، بۆیە خۆپیشاندەران تووشی سەرلێشێوان بوون و بەبێ هیچ فەرمانێک بڵاوەیان کرد، هەریەکە بە هەر شێوازێک کە ڕزگاری دەکات لە دەستی دوژمن، هەوڵی خۆدەرباز کردنی خۆیی دەدا. هەندێکیان خۆیان کرد بەو ماڵانەدا کە دەرگاکانیان لەسەر پشت بوو، لە سەربانێکەوە بازیان ئەدا بۆ سەربانێکی تر تا لە مەترسی دوور دەکەوتنەوە. چەند کەسێکیش بە عەمودە کارەباییەکاندا هەڵدەگەڕان تا بگەنە سەربانی ماڵەکان کە هیوای دەرچوونی لێوە

دەکرا. هەندێکیش کەوتنە دەست دوژمن. پیاوانی پۆلیسی سوارەیش قۆناغی تفەنگە ئینگلیزیەکانیان دەسرەواندە خۆپیشاندەران بەبێ ئەوەی لە ئەسپەکانیان دابەزن.

دوای هێرشی پۆلیس، هیچ شتێک سەرکردەی خۆپیشاندانەکەی لە هیچ خۆپیشاندەرێکی تر جیا نەدەکردەوە. ئەو لە سەرکردەی یەکەیەکی سەربازی دەچوو کە تووشی تێشکانێکی ترسناک بووبێت، بۆیە ئەویش یەکێک بوو لەوانەی بەنێو قاچی ئەسپ و قۆناغە تفەنگدا ڕێگای دەبڕی بۆ خۆ ڕزگار کردن. چەندان لێدانی بەهێزیش بەر شانی دەکەوت و دەیخست. هەڵدەسایەوەو چەند هەنگاوێک دەڕۆیشت و سەرلەنوێ لێیان دەدایەوە. ئەمجارەیان ئیتر نەیتوانی هەستێت، دوژمن دڵنیابوون ئیتر جارێکی تر هەڵناسێتەوە، بۆیە جێیان هێشت و کەوتنە شوێن هاوڕێکانی تری. لە ڕاستیدا مەجید بێهۆش کەوتبوو، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت، هەر زوو هاتەوە هۆش خۆی و هەموو هێزی خۆی کۆکردەوەو سەرلەنوێ هەستایەوەو بەدەم ڕاکردنەوە چاوی بۆ دەرگای هەرماڵیک دەگێڕا کراوە بێت. دوو پۆلیس بەدوایەوە بوون، بەڵام دەرگایەکی کراوەی دۆزیەوەو چووە ماڵەکەوە بەر لەوەی دەستیان بیگاتێ. هەر خۆیشی بەخێرایی دەرگاکەی داخست هەتا لە ڕاونەرەکانیەوە چواردەوری خانوەکە نەگرن. یەکێک لە پۆلیسەکان لە دەرگایداو دەیەویست بێتە ژوورەوە. ئەوی تریان بە دەنگێکی ئێجگار بەرز هاواری ئازارێکی بەهێزی کرد. مەجید نەیدەزانی چی لەودیو ئەو دەرگایەوە دەگوزەرێت. گرنگ ئەوەیە ئەو خۆی ڕزگار کردووە.

مەجید ئەم ماڵە باش دەناسێت کە ڕێکەوت بەرەو ئەوێی هێناوە هەر تەنها لەبەر ئەوەی دەرگاکەی لەسەر پشت بوو. ئەمە ماڵی خێزانێکی شیوعیە. دوو برای شیوعی تێدایە، گەورەکەیان بازرگانێکی بچووکەو بچووکەکەشیان قوتابیەو ئەندامی لیژنەی حیزبی قوتابیانە کە مەجید خۆی ڕێکخەرێتی و گەلێ جاریش کۆبوونەوەو یەکبینینی حیزبی تێدا کردووە، دواین کۆبوونەوە لەو ماڵە، بەر لە چەند ڕۆژێکی کەم بوو پێش ئەم خۆپیشاندانە. بەڵام ئێستا مەجید وەک شوێنی پەناگاو بەهیوای خۆڕزگار کردن چۆتە ژوورەوە.

کچێکی شانزە ساڵانە لە حەوشەی ماڵەکەدا وەستابوو. لەوکاتەدا کەس لە ماڵ نەبوو ئەو نەبێت. وەستابوو بەبێ جووڵە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بێدەنگ، تۆقی بوو. لەگەڵ مەجید یەکتریان دەناسی. مەجید لێی پرسی:

- وەنەوش کوا پەیژەکە؟ با خێرا بچمە سەربان بەر لەوەی پۆلیس چواردەوری ماڵەکە بگرێت.

کچەکە نەجووڵایەوەو ووشەیەکیشی نەگووت. بێدەنگ بە چاوە گەورە کراوە جوانە پڕ لە ترسەکانیەوە وەستابوو. مەجید خۆی کەوتە گەڕان بەدوای پەیژە دارەکەداو دۆزیەوەو سەرکەوتە سەربان. پەیژەکەیشی ڕاکێشایە سەربان هەتا دوژمن نەتوانێت سەرکەوێت بەدوایدا نەگەر هاتنە ژوورەوە. لەو سەربانەیشەوە چووە سەربانێکی تر هەتا بە باشی دوور کەوتەوە. خۆی ڕزگار کرد. دوای ئەوە هەستی هیلاکیەکی زۆر دایگرت، بەجۆرێک کە نەیدەتوانی بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن. لەسەربانەکەوە دابەزیە ناو ماڵێکەوە. ژنێک لێی پرسی:

- چیت ئەوێت، تۆ لە کوێوە هاتیت؟
- من خۆپیشاندەرم. لەدەست پۆلیس هەڵاتووم و خۆم ڕزگار کردووە.
- خێراکە، خێرا، بچۆرە ئەو ژوورەوە.

مەجید چووە ژوورەکەوە. ئەو ژوورە نزیک بوو بە دەرگای دەرەوەی ماڵەکە، ماڵەکەیش ماڵی خێزانێکی کارگەر بوو کە لە ژنێک و پیاوێک و پێنج منداڵ پێکهاتبوو، پیاوەکە حەماڵێکی کرێکار بوو، لە ماڵەوە نەبوو کاتێک ژنەکە میوانداریی ئەم لاوە خۆپیشاندەرەی دەکرد.

لە بەشی سەرەکی خانوەکەدا ماڵێکی تریش هەبوو، ئەوان خاوەنی خانوەکە بوون، پیاوەکە فەرمانبەرێکی بچووک یان مامناوەنجی بوو. ئەوانیش پێشوازی ئەم خۆپیشاندەرەیان کردو کەوتنە پاراستنی لەبەر ئەوەی لە دەسەڵاتی سەروەر یاخیە.

مەجید کەوتبووە نێو چاودێری و خۆشەویستی ئەمانەوە کە هەرگیز نەیانناسیوە. لەسەر بەڕەیەکی ڕاخراو لەسەر زەویەکە ڕاکشا، لێفەیەکیان پیاداو هەردوو ژنی کرێکارەکەو فەرمانبەرەکە کەوتنە شێلانی و بەووشەی خۆشیش، هەروەک خەڵکی تری ئەم شارە، کەوتنە هاندانی کە شانازی خۆشیانی پێوە دیار بوو بەرامبەر بە شیوعیە خۆپیشاندەرەکان. ژنی کرێکارەکە کەوتە ساوەر لێنان، ئەوەیش چاکترین شت بوو لە ماڵەکەیانداو نانێکی ئێوارەیان دایە ئەم میوانە خۆپیشاندەرە.

کاتێک مەجید دانیشت بۆ نان خوارد، ٨-٩ منداڵ لە ژوورەکەدا بوون. زۆربەیان لە ماڵی دراسێکانەوە هاتبوون ئەم خۆپیشاندەرە ببینن کە بەر لێدانێکی توندی پۆلیس کەوتووە وە هەریەکەیشیان یارمەتی بدەن بە هەرچی کە ئەتوانن. بێدەنگ بوون لە ژوورەکەدا هەتا مەجید دانیشت. ئینجا دەستیان کرد بە قسە کردن:

- ئێستا چۆنیت؟
- زۆر باشم.
- زۆریان لێدایت؟
- نا، زۆریان لێنەدام.
- ئەی ئێوەیش لەوانتاندا؟
- ئەی چۆن؟ بە بەرد لێماندان. ئەوان لێمان دەترسان و لێمان دووردەکەوتنەوە.

ئینجا یەکێکیان کە گەنم ڕەنگێک بوو زیرەکی لە چاوەکانیدا دەبینرا، لە خۆپیشاندەرەکەی پرسی:

- تۆ لە چ حیزبێکیت، حیزبی تەحەڕوڕ یان حیزبی پارتی (پدک)؟
- بێگومان من لە حیزبی تەحەڕوڕم.
- ئێمەیش هەموومان لە حیزبی تەحەڕوڕین.

ژنی ماڵەکە نەیتوانی لەم بابەتەدا خۆی لە تێهەڵقورتان بەدوور بگرێت و لەو منداڵە "حیزبییانە" تورە نەبێت:

- بێدەنگ بن! ئێوە چیتانداوە لە حیزب؟ با گەورە بن ئەوجا بچنە حیزبی تەحەرورو بەشداری خۆپیشاندان بکەن.
- ئەی دایە تۆ هەزار جارت پێنەووتووین حیزبی تەحەرور باشترین حیزبە بۆ ئێمە؟
- جا ئەوە هەر ئەڵێم، بەڵام تۆ هێشتا منالی کورەکەم.

مەجید خەیاڵی لای رووداوی خۆپیشاندانەکەو چارەنووسی هاورێکانی بوو کە بە پۆلیسی سوارە چواردەوریان گیرا. ئەبێ کامیان خۆیان دابێت بەدەستەوەو کامیان کەوتبێتنە دەست دوژمن؟ هەرچۆن بێت پێویستە بگەرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی ئەجیبی رێکخەری چاوەرێی دەکات هەتا راپۆرتێکی بداتێ دەربارەی خۆپیشاندانەکە. دەبێت ئەو راپۆرتە چۆن بێت؟ ئایا هەروەک ئەوانی پێشووتر بێت؟ نا، وا نابێت. ئەمە سێهەم خۆپیشاندان بوو، وە بە روونی دیارە کە بچووکترو لاوازتر بوو لەوانەی پێشوو. مەجید خۆی ئەمەی تێبینی دەکرد، بۆیە پێویست بوو بگەرێت بەدوای شیکردنەوەی ئەمەدا. خۆپیشاندانەکان بۆ یادی راپەرینی کانون رێکخرا بوون، راپەرینیش یانی بەشداریی دەیان هەزار لە خۆپیشاندانەکاندا. بەڵام جەماوەر بەشداریی نەکرد لەم خۆپیشاندانانەدا. بەڵکو ژمارەی بەشداربوان لە خۆپیشاندانێکەوە بۆ ئەوی تریان هەر کەمی دەکرد، وە هەر تەنها ژمارەیەکی کەمیش لە هاورێیانی حیزب بەشداریان تێداکرد.

ئەگەر مەجید لەوکاتەدا پرسیاری بکردایە ئایا بزووتنەوەی شۆرشگێری لە وولاتدا بە هەڵکشان یان داکشاندا تێدەپەرێت، ئەوا بەبێ دوودڵی وەڵامی دەدایەوە لە بارودۆخی هەڵکشاندایە. بەڵام لە هەمانکاتدا وەڵام دەداتەوە، دوای خۆپیشاندانی سێهەم، جەماوەر ئامادەی بەشداریی کردن نیە لە خۆپیشاندانەکانداو زیندووکردنەوەی راپەرینی کانونیش مەحاڵە، وە ئەوە راستترە کە ئیتر رێکخستنی ئەم جۆرە خۆپیشاندانانە بەس بێت کە بە

زیانی حیزب دەگەڕێتەوە. هەر بەو جۆرە، مەجید ڕاپۆرتەکەی داڕشت و هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژەیش دایە دەست ڕێکخەرەکەی. وە دیار بوو ڕووداوەکان ئەوانی تریشی بە هەمان ئەو بۆچوونە گەیاندبوو، چونکە خۆپیشاندانی سێهەم کۆتایی ئەو خۆپیشاندانانە بوو کە شکستی تۆمار کرد لەو ماوەیەدا.

نەجیب لە کاتی گوێ گرتندا لە ڕاپۆرتەکەی مەجید دەربارەی خۆپیشاندانەکە، بایەخی بۆ باسەکە هەبوو بە درێژەی و بە "بچووکیشیەوە". لە دواییدا ڕایگەیاند:

- بەر لە کاژێرێک هاوڕێ حەسەنم بینی، یاریدەدەری سەرکردەی خۆپیشاندانەکە، ئەویش بە دەوری خۆی باسی لێوە کرد، هاوڕێیەکی برین پێچیشمان بۆ هێنا بۆ ماڵەوە تا برینەکەی سەری تیمار بکات. ئەی ئایا ئەو بەباشی بە ئەرکی خۆی هەستا؟
- ئەو چی گووت دەربارەی خۆپیشاندانەکەو ڕۆڵی خۆی تیایا؟
- باسی پێکدادانی کرد لەگەڵ پۆلیس، باسی بەشداریی خۆیی کرد لە "شەڕەکەدا" کە سەریشی تیایا بریندار بووە، ئەوەیشی یاد خستەوە کە ژمارەی بەشداربوان کەم بووە تیایا.
- ڕاستە، یەکەمجار ئامادە بوو، بەڵام لەوانە بوو کە هەر لە سەرەتاوە هەڵاتن، وە هەر لە دەستپێکی پێکدادانەکەوە، یان پێشتریش، ڕاستەوخۆ خۆپیشاندانی جێهێشت و لە ماڵێکی نزیک بە خۆپیشاندانەکە خۆی حەشاردا. ئەو برینەی سەریشی، ئەوە جێ دەستی یەکێکە لە هاوڕێیانی خۆپیشاندەر نەک دوژمن!
- ئەی چۆن هاوڕێیەک سەری هاوڕێیەکی دەشکێنێت؟
- سزای ترس و ڕاکردن، بەتایبەت سەبارەت بە کەسێک کە ئەرکی سەرکردایەتی پێسپێردراوە!
- ئێستا هەموو شتێک ڕوون بووەوە.

ئەجیب بەر لەوەی ماڵەکە جێبهێڵێت، باسی ئەوەی کرد کە هاوڕایە لەگەڵ مەجید لەسەر ئەوەی هیچ هەوڵێکی تر نەدرێت بۆ "نوێ کردنەوەی ڕاپەڕین". بەڵام دوا ووشە بۆ سکرتێری لیژنەی ناوخۆیی دەگەڕایەوە کە ئەویش لە شوێنی خۆشاردنەوەی، چاوەڕێی ئەجیب بوو هەواڵی خۆپیشاندانەکەی پێبگەیەنێت. ئایا ئەم سکرتێرە ڕازی دەبێت بە وەستاندنی خۆپیشاندانەکان و دەڵێت "بەسە"!

بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن ئەو لە سەرەتای ڕێکخستنی یەکەم خۆپیشاندانەوە زۆر گەش بین بوو، بەڵام ئەبێ ئێستاو دوای سێهەمین خۆپیشاندان چۆن بیر بکاتەوە؟

ڕۆژی دواتر دەرکەوت کە خۆپیشاندانی سێهەم بە سەلامەتی تێنەپەڕیوە. سیان لە هاوڕێیان کەوتوونەتە دەست پۆلیس، لە نێویاندا ئەنوەری دارتاش، لاوێکی ئەسمەر، کەڵەگەت، چوارشانە، برۆ ئەستوور، لە هەردوو خۆپیشاندانەکەی تریشدا بەشدار بوو.

مەجید هەروا لە خۆوە ئەو ڕۆژەی بیر کەوتەوە کە بۆ یەکەمجار ئەم لاوە شیوعیەی تێدا ناسی، ئەنوەر. ئەوە بەر لە دوو ساڵ لەمەوبەر بوو لە کاتی ڕووداوی گرتنی ئەنوەردا، کاتێک مەجید لە ڕێکخەرەکەیەوە ئاگادار کرا لە کاتی بینینی هاوڕێیەکی نوێدا لە شانەیەکی حیزبیدا.

- تۆ دەبیتە ڕێکخەری ئەم شانەیەیش.
- بێگومان ئامادەم.
- سبەینێ لە کاتژمێر پێنجی پاش نیوەڕۆ، پەیوەندی بکە بە هاوڕێیەک لە ئەندامانی ئەو شانەیە لەسەر ئەو شتەی لەو کاغەزە بچکۆلەیەدا تۆمار کراوە -کاغەزەکەی دایەدەستی- ئەو بە هەموو ئەندامانی شانەکەت دەناسێنێت.

دوای دوو ڕۆژ لەو یەکتر بینینە، مەجید لە ژوورێکی تاریکی پشتەوەی خانوویەکی کۆندا، کۆبوونەوەیەکی بەو شانە تازەیە کرد. ئەنوەر ئەندامێکی ئەو شانەیە بوو. لەنێو ئەو

شتانەدا کە لە دانیشتنەکەدا هاتە پێشەوە، ئەو پرسیارە بوو ڕێکخەری شانەکە خستیەڕوو، وە داوای لە هەموو هاوڕێیانیش کرد یەکە بە یەکە وەڵامی بدەنەوە:

- ئایا لەپشت تێکۆشانی نێو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیەوەو لەژێر ئاڵا ئەمرەکەیدا چیمان وەگیر دەکەوێت؟

هەر شەش هاوڕێکە وەڵامی جیاوازو دروستی ناوەڕۆکەکەیان دایەوە. تەنها ئەنوەر بەمجۆرە وەڵامی دایەوە: "ئەوەی دەستمان دەکەوێت زیندانی و ئەشکەنجەیە". هاوڕێیان بەو وەڵامە پێکەنین. ئەنوەر وایزانی کە کەس لە وەڵامەکەی تێنەگەیشت، بۆ ڕوونکردنەوە ئەمەیشی زیاد کردو گووتی:

- مەبەستم ئەوەیە ئێمە لە خۆپیشاندانەکاندا بەشداری دەکەین دژی کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستی، پۆلیسی دوژمنیش هێرش دەهێنێت، دەگیرێین و دەکەوینە بەر شکەنجەو بەندیخانە. بەلام ئێمە ئامادەین بەرگەی هەموو شتێک بگرین لەپێناوی حیزبە خەباتگێڕەکەماندا.

ئەوەتا ئێستا دوو ساڵ بەسەر ئەو کۆبوونەوەیەدا تێپەڕیوە، پێشبینیەکەی ئەنوەر هاتەدی سەربارەت بەخۆی کە لە خۆپیشاندانی سێهەمدا گیرا. بەبێ شک ئێستا زۆر دڕندانە لێی دەدرێت لە لایەن پشکنینی تاوانکاریەوە -التحقیقات الجنائیة-. مەجید کەوتە ئەو بیرکردنەوانە هەر کە هەواڵی گرتنی ئەو هاوڕێیەی بیست – ئەو دەخرێتە بەردەم ئەنجوومەنی سەربازیی عورفی و دواییش ڕەوانەی زیندان دەکرێت.

- ئەجیب پرسی: ئەوە لە کوێیت؟
- ئەوەم بۆ گێڕایەوە کە لە یەکەم بینیندا لە ئەنوەرم بیست بوو.
- بریار دراوە کە ئیتر لەم کاتەدا خۆپیشاندان بەس بێت.
- ئەوەیە بریاری دروست. دەبێت پەنا بەرین بۆ شێوازی گونجاو تر لە خەباتدا.

# ڕووداوێکی کتوپڕ

دوای وەستانی خۆپیشاندانەکان، یەکتربینینە ڕاستەوخۆکانی نێوان هاوڕێیان نەجیب و مەجید کەمی کرد، وە ئیتر پەیوەندی ڕۆژانە لە ڕێگای نامەوە ڕێکدەخرا. پەیامبەرە تازەکە، عەزیز، لاوێک بوو لە تەمەنی هەژدە ساڵاندا، باڵا مامناوەندی، لەنێوان ئەسمەرو گەنم ڕەنگدا، خێرا دەجووڵا. وە تەنانەت لە کاتی نوکتەو زەردەخەنەکانیشیدا، حوزن و بێتاقەتیەک بە ڕووخساریەوە دیار بوو. لەوانە دەچوو کە پێیان دەڵێن "قاچەکانیان چالاک ترن لە سەریان"، وە هەر یەکسەر لە دیالێکتەکەیەوە دیار بوو کە لە دانیشتوانی ئەو شارە نیە. قوتابی بوو لە شارێکی تر، دوای ڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨ وەک تێکۆشەرێکی شۆڕشگێری چالاک لە بزووتنەوەی قوتابیاندا دەرکەوتبوو. لە کاتی شکستی بزووتنەوەی شۆڕشگێریدا، بووبووە ئامانجی دامودەزگا سەرکوتکارەکان و چەند جارێکیش چواردەوری ماڵی گیرا بوو. بەڵام توانی بووی دەرباز ببێت و حیزبیش لە شارەکەی خۆیەوە گواستوویەتیەوە بۆ ئەم شارە، وە لەبەر ئەوەی لێرە نەناسراوەو بواری هەڵسووڕانی هەیە، ئەوا وەک پەیامبەری حیزبی بەکاردەهێنرا.

ڕۆژێک عەزیز بەبێ گوێدانە کات هات و نامەیەکی بچکۆڵەی لە گیرفانی دەرهێنا کە وەک چکلێت پێچرابۆوە، دایە دەست مەجید.

- هاوڕێ، ئەمە نامەیەکی پەلەیە بۆ تۆ! هەر ئێستا بیخوێنەرەوەو دوام کەوە.

لەپێشا مەجید سەیرێکی دەموچاوی نامەبەرەکەی کرد، هەروەک ئەوەی بیەوێت لە ڕووخساریەوە دەرئەنجامێکی دەستبکەوێت، بەڵام ئەو زۆر ئاسایی دیار بوو، هەروەک دوێنێ و بەر لە دوێنێ. بەڵام ئەوەی ئێستا ئەم نامەبەرە داوای کرد، شتێکی ئاسایی نەبوو لە بارودۆخێکی لەم جۆرەدا. "بیخوێنەرەوەو دوام کەوە"! بۆ کوێ دوای کەوم؟ ئایا شتێکی نائاسایی و چاوەڕوان نەکراو ڕوویداوە؟

بە پەلە نامەکەی کردەوەو خوێندیەوە، کەمتر لە دوو دێڕ بوو. ئەوەی تیایا بوو ئەوە بوو کە داوای لە مەجید کردووە دوای ئەم نامەبەرە بکەوێت بۆ ئەو شوێنەی دەڕوات. لەوێ هاوڕێیەک چاوەڕێی دەکات بۆ ڕاوێژ لەسەر چەند کاروبارێکی حیزبی. دوای کەمتر لە چەند خولەکێک نامەبەر خۆی کرد بە کۆڵانێکی باریکدا، بە ٣٠ مەترێکیش لە دوای ئەوەوە مەجید بەرەو ئەو شوێنە نادیارە دەکشێت. گەشتەکە لە چەند ١٠ خولەکێک زیاتری نەخایاند. عەزیز بە نزیک بوونەوەی لە دەرگای ماڵەکە، ڕۆیشتنەکەی هێواش کردەوە. دوای ئەوەی دڵنیا بوون لەوەی کەس بە دوایانەوە نیە، هەردووکیان چوونە ژوورەوە.

مەجید چەند مانگێک بوو کەوتبووە خەباتی ژێر زەمینیەوە، هەر جارەی لە ماڵی هاوڕێ و برادەرێکایدا دەژیا، بەڵام لەوەوبەر لە خانوویەکدا نەژیاوە کە لەلایەن هاوڕێیانی حیزبەوە بەکرێ گیراوە بە مەبەستی بەڕێکردنی کاروباری حیزبی و خۆشاردنەوەی چەند کادرێک. بە چاوی پشکنینەوە کەوتە ڕوانین لەو بینایەی چووە ناویەوە، ڕوانیە دیوارە قوڕینە ئەستوورەکانی و پەنجەرەی ژوورەکانی و هەرچی کە دەکەوتە بەرچاوی. بینایەکی قوڕینەی کۆن و سادە، لە کۆڵانێکدا کە هەر چەند سەد مەترێک لە خانووەکەی ماڵی باوکی مەجید خۆیەوە دوور بوو.

ئەم "ماڵە حیزبیە" لە بەشی خوارەوەیدا، لە ژوورێکی گەورەو چەند ژوورێکی تر پێکهاتبوو. ئەمە لەکاتێکا دوو خێزانی تریش لەو خانوەدا بوون، یەکێکیان لەسەرەوەو ئەوی تر لە خوارەوە، ڕێگەیشیان بە چەند زگورتیەکی نەناسراو دابوو لە بەشێکی خانوەکەدا. مەجید لەو ژوورەدا لەبەردەم هاوڕێیەکی تری خەڵکی شارەکەیدا خۆی بینیەوە کە هەردووکیان بە باشی یەکتریان دەناسی. دوای سڵاو کردن لە یەکتر، هاوڕێ شەهاب یەکسەر چووە باسەکەوە:

- هاوڕێ مەجید دەزانیت بۆ بانگ کراوی بۆ ئێرە؟ لەڕاسیدا هەواڵێکی ناخۆشم پێیە. هاوڕێ (فەتاح) چووە بۆ شوێنێک، ڕەنگە بۆ بەغدا چوو بێت.

سەرکردایەتی ڕێکخراوە حیزبیەکەی داوەتە دەست بەرپرسی دووهەم لە پارێزگاکەدا کە هاوڕێ نەجیبە. ئەبوایە نەجیب لە دوێنێ بەیانیەوە ماڵی باوکی جێهێشتایەو بهاتایەتە ئێرە لەگەڵ ئێمە بژی. بەڵام هەر لە ماڵەکەی خۆیدا ماوەتەوە هەتا دوێنێ ئێوارە داویانە بەسەریداو گرتوویانە، دوای ئەوە هیچ لە چارەنووسی نازانین.

- جا تۆ دڵنیایت کە گیراوە؟
- بەڵێ، بەڵێ. سەرچاوەی هەواڵەکە خێزانەکەیەتی، خوشکەکەی. ڕووداوەکەیش بەمجۆرە بووە:

مەفرەزەیەک لە پشکنینی تاوانکاریی لە بەغداوە هاتووە، خیانەتکاری شیوعی (ڕەئوف) یش لە ناویانا بووە کە بەر لە چەند ڕۆژێک گیراوەو وەک دەڵێن ڕووخاوە. ئەو مەفرەزەیە، هەر بە گەیشتنی، هەڵمەتێکی گرتنی دەستپێکردووە دژی هاوڕێیانمان، نەجیب لە سەرەوەی لیستەکەدا بووە. ئەو ڕەئوفە خیانەتکارە بەباشی دەیناسێت کە شیوعیەکی دیارەو ماڵەکەیشی دەزانێت، مەفرەزەکەی بردۆتە سەری.

بۆ ماوەیەک بێدەنگی ژوورەکەی داگرت، پاشان شەهاب ئیشارەتێکی کردم لە نامەبەرەکە دوورکەوینەوە، ئینجا گووتی:

- بەپێی ئاگاداریی من: دوای گرتنی هاوڕێ نەجیب، تۆ ئەو کەسەیت کە دەبێت بە ڕۆڵی بەرپرسیارێتی هەستیت. بۆیە ناردوومە بەدواتا.

دوای بێدەنگیەکی کەم، مەجید بە سەر ڕاوەشاندنێک ڕەزامەندیی خۆیی دەربڕی بۆ هەستان بە بەرپرسیارێتی. ئەو تا ئەو کاتە شتێکی لەو جۆرەی بە بیردا نەهاتبوو کە دەبێت ئەو جێگای بەرپرسی یەکەمی ڕێکخراوی پارێزگاکە پڕ بکاتەوە. بەڵام ئەبێ ئێستا دوای ئەم ڕووداوە چی بکات؟ ئایا دەبێت ئەمە ڕەت بکاتەوە؟ نەخێر، هەرگیز. ڕەتکردنەوە هیچ مانایەکی نیە ڕاکردن نەبێت لە فەرمانەکان. ئەی بەرپرسیارێتی یەکەم

چۆنە؟ ئەو باش لە بیریەتی، کاتێک بۆ یەکەمجار ڕێکخەرە حیزبیەکەی بینی، ئەو دەربارەی ئەرکی ڕێکخستن و سەرکردایەتی شانەیەک پێی گووت: هاوڕێ مەجید، بەرپرسیارێتی شانەیەکی حیزبی، یانی هەست کردن بە بەرپرسیارێتی لەبەردەم حیزبدا زیاتر لە هەر هاوڕێیەکی تری شانەکەت، مانای ئەوەیە کە دەبێت ئامادەی کارو قوربانیدانی زیاتر بیت لەو هاوڕێیانەی تۆ سەرکردایەتییان دەکەیت. مەجید چەندانجار ئەم ووشە جوانانەی دووبارە کردبۆوەو هاوڕێی تریشی پێ پەروەردە کردبوو. ئێستا ئەو لەگەڵ خۆیدا دووبارەیان دەکاتەوە بۆ خۆی، لە چرکەساتێکدا کە داوای لێدەکرێت هەستێت بە ڕۆڵی بەرپرسێکی حیزبیی گەورەتر کە لەوەوبەر پراکتیزەی نەکردووە.

قسەوباسەکە لە نێوان مەجیدو شەهابدا چەند کاژێرێکی خایاند، محوەرەکەیشی هەر بارودۆخی سیاسی و حیزب بوو. لە ئێوارەدا مەجید خانووە حیزبیەکەی جێهێشت تا سەردانی ماڵێکی نزیک بکات، بەڕێکەوت خاڵی بینی بە مێزەرێکەوە، گەلێک کەس بە یەکێک لە ڕۆشنبیرە پرشنگدادەکانی ئەو ڕۆژگارەیان دادەنا. وە لە ڕاستییشدا بیرێکی فراوانی هەبوو، ئاگاداری گەلێ شت بوو، وە توانای ڕاوێژو بەرگری کردنیشی هەبوو لە تێڕوانینەکانی، خۆیشی بە خاوەن تواناو خاوەن تێگەیشتنێکی فراوان دادەنا لە کاروباری سیاسیشدا. بەڵام گەلێجار لە ڕاوێژە سیاسیەکاندا شتەکانی تێکەڵاو دەکرد. بەر لە ساڵێک پێش ئەم یەکتر بینینەی ئەم ئێوارەیە، خاڵە بۆ یەکەمجار بۆ خوشکەزا شیوعیەکەی ڕاگەیاند:

- من ئێستا باوەڕم بە میللەت هێنا. باوەڕم بەوە نەبوو کە تۆ لەبارەی ئەم میللەتەو ڕۆڵی ئەم میللەتەوە دەتگووت. بەڵام ڕاپەڕینی کانون وای لێکردم بە بۆچوونەکانمدا بچمەوە. گەل هەیەو دەشتوانێت ئیرادەی خۆی بسەپێنێت.

بەڵام لەم ئێوارەیەی زستانی ١٩٤٩ دا، هەڵکشانی شۆڕشگێری لە وولاتدا بووبووە داکشان، خاڵە (مەهدی) ڕایەکی تری هەبوو. ئەو گەڕابووەوە سەر بۆچوونەکەی ڕابووردووی، وە جارێکی تریش ئیمانی بە گەل نەمابوو. وە هەر بە بینینی مەجید کەوتە ئامۆژگاری کردنی:

- ئێوە بەدوای مەحاڵەوەن. دەسەڵاتی سەروەر لەوە بەهێز ترە تۆڵەی لێبکەنەوە، ئەوەی بە "میللەت" ناودەبرێت، ناتوانێت هیچ شتێک بکات بەرامبەر ئەم دەسەڵاتە. گوێ بۆ ئامۆژگاریەکانی خاڵت بگرەو خۆت لە شیوعیەت و مەترسی و ڕاوودوونان و زیندان دوورخەرەوە.
- خاڵە گیان، ئایا گەل بەر لە ساڵێک بوونی خۆیی نەسەلماند؟ ئەی ئەوکاتە خۆت باوەڕت بە میللەت نەهێنا؟
- مەجید، من پیاوێکی بە تەمەنم، ئەزموونم لە تۆ زیاترە! سووربوونم لەسەر ئامۆژگاری کردنت تەنها لەبەرژەوەندی خۆتە. ئەوەندە بەسە تا ئێستا بۆ شیوعیەتت کردووە، کاتی ئەوەیە خۆت دوور بخەیتەوە لەم مەترسیانە. ئامۆژگاریەکانم وەربگرە پەشیمان نابیتەوە!
- تا ئێستایش شیوعیەت بارودۆخی باشە خاڵە گیان! دوژمن ناتوانێت زەفەر بە حیزبەکەمان ببات. تازە ڕەگی شیوعیەت لەم کۆمەڵگایەدا بەهێز بووەو هیچ هێزێک ناتوانێت لە بنی دەربهێنێت. ئەو دژواریانەیشی پیایا تێپەڕ دەبین وەختیین. ئەو کاژێرەیش دێت لێپرسینەوە لەو دەسەڵاتدارانە بکرێت لەسەر ئەوەی بەرامبەر بەم گەلەی دەکەن، سەبارەت بە منیش ئەمەوێت گوێم لەو ئامۆژگاریانە بێت کە زیاتر دەمنووسێنێت بە حیزبی شیوعیەوە.

ئەم ڕاوێژە لە نێوان خاڵ و خوشکەزادا بە هیچ کوێیەک نەگەیشت. هەریەکە لەسەر ڕای خۆی سوور بوو. لەدواییدا مەهدی دوعای سەلامەتی و چاودێریی خوای بۆ خوشکەزاکەی کرد. مەجید کەوتەڕێ بەرەو کارە حیزبیەکەی و خوێندنەوەی نامەکانی نێو گیرفانی.

# پاگەندەی ڕاکردوویەک

پۆلیسی نهێنی چاودێری مەجیدی دەکرد، بۆیە ناچار بوو بە ئاگادارییەوە بجووڵێتەوەو لە گۆڕەپان و شەقامە گشتیەکاندا دەرنەکەوێت. بەڵام ئەو لەلایەک، زۆر شارەزای هەموو شەقام و کۆڵانێکی شارە، لەلایەکی تریشەوە ئاگادارە کە چۆن دەسەڵات لە جەماوەری میللیەوە پەراوێز خراوە، ئەمەیش ڕێی جووڵەی بەردەوامی دەدا بۆ ئەنجامدانی کارە حیزبیەکانی تەنانەت لە ڕۆژیشدا. بەرپرسیارێتیە تازەکەیشی ناچاری کردبوو بە جووڵەی زیاتر. بەڵام ئەمە لە چەند ڕۆژێک زیاتر درێژەی نەکێشا. فەتاح، سکرتێری ڕێکخراوەکە، گەڕایەوە شارو ڕۆڵی خۆیی وەرگرتەوە وەک سکرتێر.

بەڵام دوای ئەوە ئەرکێکی تازەی حیزبی بە مەجید سپێردرا، ئەویش سەفەر کردنە بۆ شاری (ق.د) بۆ کارکردن لە پێناوی بیناکردنەوەی ڕێکخراوەکەدا لەوێ، ئەمە دوای ئەوەی کەوتبووە بەر لێدانێکی سەخت. ئەو لاوە نامەیەکی حیزبیی پێگەیشت کە فەرمانی پێدەدات بەبێ دواکەوتن بڕوات، تیایا ڕوونیش کراوەتەوە لەوێ پێویستە چی بکات. لە بەیانیی ڕۆژی داهاتوودا، ئەو لاوە شیوعیەی ڕاو دەکرا، لە ئۆتۆمۆبێلێکی کۆندا جێگایەکی بۆ خۆی گرت، ئۆتۆمۆبێلەکە بە ڕێگایەکی چاڵوچۆڵی قیرتاو نەکراودا کەوتە ڕێ. ئەوەی لە تەنیشت مەجیدەوە دانیشتبوو، بازرگانێکی بچووکی شاری (ق.د) خۆی بوو. ئەم بازرگانە ڕۆژێ لە ڕۆژان چۆتە حەج وەک "کەشیەکەی" شاهیدیی لەسەر دەدات. باشترین باس لەلای ناڕەزایی دەربڕین بوو لە بازاڕو بەرزبوونەی نرخ و کەمی قازانجی کارەکەی، ئەمە جگە لە باسی ئەوەی لە کاتی حەجدا بیستبووی و بینی بووی. چەنابازێکی زمان کراوە، بە درێژایی ڕێگا، مافی قسە کردنی بۆ خۆی و گوێ گرتنی بۆ ئەوانی تر، داگیر کردبوو. بێدەنگیەکی هیلاککارو گوێ گرتنێکی زۆرەملێ سەپابوو بەسەر ئەوانی تردا هەتا شوفێری ئۆتۆمۆبێلەکە سەبری لەبەر بڕاو تەقیەوەو قیژانی بەسەر حاجیدا:

- حاجی تۆزێ زمانت بحەوێنەرەوەو ڕێ بدە با کەسێکی تریش قسە بکات.

- ئەگەر بمزانیبا ئەوەندە بێ ڕوویت سواری ئۆتۆمۆبێلەکەت نەدەبووم.
- منیش ئەگەر بمزانیایە تۆ ئەوەندە چەنەبازیت هەرگیز نەمدەهێشت سواری ئۆتۆمۆبێلەکەم ببیت.
- من کرێی تەواوم داوە تا سواری ئۆتۆمۆبێلەکەت بم بێ ئەقڵ.
- چەندت داوە پێم ئەوەندەی تریشت ئەدەمەوە بە مەرجێک خۆم و ئۆتۆمۆبێلەکەم جێبهێڵیت.

پێکدادان بەرەو شەڕی دەست دەچوو ئەگەر هەموو ئەفەرەکانی نێو ئۆتۆمۆبێلەکە ئەو دوو لایەنە بەگژیەکاچووەیان بێدەنگ نەکردایە. وە ئیتر دوای ئەو دەنگەدەنگە، حاجی بەتەواوی بێدەنگ بوو هەتا گەیشتینە شارەکەی.

ئۆتۆمۆبێلەکە هێواش دەڕۆیشت، ئەبوایە سێ جار بەسەر رووباری (زاب) دا بپەڕیایەتەوە، هەموو پەڕینەوەیەکیش پرۆسەیەکە زیاتر لە ۲۰ خوولەک دەبات، چونکە پردێکی ئاسایی بوونی نەبوو، بەڵکو کەڵەکێک یان پردێکی جووڵاو بوو بۆ هەر پەڕینەوەیەک. کەڵەکەکە بە گوشێکی ئاسنین و بەهێز لە هەردوو بەری ڕووبارەکەوە بەسترابۆوە. ئەم کەڵەکە هەر تەنها ئۆتۆمۆبێلێکی هەڵدەگرت بە ئەفرو ئاژەڵەکانی ناویەوە هەتا لەمبەرەوە بیپەڕێنێتەوە بۆ ئەوبەر، لەوێیشەوە هەرچی هەبوایە دەیهێنایە ئەمبەر. ئەم کەڵەکە بە ماسولکەی کرێکارەکان دەجووڵا نەک بە دینەمۆیەک. وە هەر کە دەگەیشتە ناوەڕاستی ئەو ئاوە خووڕەی ڕووبارەکە، هەمیشە یەکێک هەبوو لەنێو ئەفەرەکاندا، دەکەوتە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەی کە چۆن جارێکیان گوشەکە پچڕاوەو کەڵەکەکە لە ناوەڕاستی ئەو ڕووبارە سامناکەدا تا ماوەیەکی درێژ ئاو بردوویەتی، ئیتر ئەمە بە هەموو گیاندارو بێگیانەکانەوە، هەتا ڕێکەوتێکی سەیر بەفریایان کەوتووەو ڕزگاری کردوون لە خنکان. ئەم چیرۆکەیش دڵی هەندێکی پڕ دەکرد لە ترس و لەگەڵ هەر جووڵەیەکی "کەشتیەکەیاندا" لە تەوژمی ئەو ئاوە بەهێزە، ترپەترپی دڵیان زیادی دەکرد.

لە هەموو شوێنێکی پەڕینەوەدا مەخفەرێکی پۆلیس و جۆرێک لە چاودێری و پشکنین هەبوو. هەموو شتێک لە دەرچەی یەکەم و دووهەمدا ئاشتیانە تێپەڕی. بەڵام ڕێکەوتێکی خراپ گرفتی بۆ مەجید دروست کرد لە سێهەمیاندا. لێرەدا پۆلیسێکی لێیە بەباشی مەجید دەناسێت وەک کەسێک و سیاسیەکیش:

- بوەستە با پشکنینێک بکەین.
- فەرموو، بمپشکنە! بەڵام پشکنین بۆچی؟
- باش دەتناسم! ساڵی ڕابووردوو، زۆرجار لە خۆپیشاندانی شیوعیەکاندا بینیومیت.
- بەهەڵەدا چوویت، ڕەنگە یەکێکت بینی بێت لەمن چووبێت.
- نیشانت دەدەم بەهەڵەدا نەچووم. با بپەڕینەوە دەیبینیت!

دوا ووشەکانی پۆلیسەکە هەڕەشەئامێز بوون و ڕاستەوخۆیش لەلای مەجیدەوە وەستا. بێدەنگیەکیش داکەوت:

- چیرۆکەکەت خێرێکی بۆ من تێدایە! مکافەئەیەک وەردەگرم، مووچەکەم بەرز دەبێتەوە!

مەجید کەوتە بیر کردنەوەدو دەگەڕا بۆ خۆدەرباز کردن لەمەی تێیکەوتووە. چیبکات؟ لەوانەیە بتوانێت ئەم پۆلیسە بخەڵەتێنێت، ئەوە تاکە دەرچەیە. با ئەمە تاقی بکاتەوە، لەوانەیە سەربگرێت. هەرچۆن بێت هەوڵەکەی هیچ زیانێکی نابێت. بریاریدا بە پۆلیسەکە بڵێت:

- تۆ بەهەڵەدا چوویت، وەک گووتم. ئەگەر تەنانەت پارساڵ منیشت بینیبێت لە خۆپیشاندانەدا، ئەمە هیچ مانایەک نادات. من لەدوی شتێک دەگەڕیم لەسەری بژیم، ئەم سەفەرەیشم هەر تەنها بۆ ئەوەیە چەند پولێکم دەستبکەوێت. ئەچم

چەند کاڵایەک بکڕم تا بیبەمەوە بۆ شارو قازانجێکی لێ بکەم و لەسەری بژیم.
ئەگەر سەرکەوتوو بووم لە کارەکەمدا ئەوا بەشێکی تۆیشی تێدا دەبێت.

پۆلیسەکە دوودڵ ڕاما: ئایا ئەم شیوعیە ڕاست دەکات یاننا؟ خۆ لەوانەیشە قسەکەی ڕاست بێت، لەوانەیە ئێستا خەریکی پەیدا کردنی ڕزقێک بێت. لەوانەیە پۆلیسەکە خۆیشی شتێکی بە نرخی لەمە دەستبکەوێت. خۆ ئەو هەرچی دەزانێت لەبارەی چالاکی ئەم کەسەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە ساڵێک لەمەوبەر نەک ئێستا. بەڵام کێ دەڵێت ئەم لاوە درۆ ناکات بە مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی! ئەی بۆچی ناوی ئەو لەنێو لیستی "ڕاکردووەکاندا" نەهاتووە لەم ڕێگایەدا؟ ڕاکردووەکان زۆر باش ناسراون لە پۆلیسەوەو پێکیشەوە بە ئاگاداریەکی تەواوەوە لە یەکتر، کار دەکەن. لەناو پیاوانی پۆلیسدا هەرگیز ناوی (مەجید) نەبیستراوە، کەواتە ئەمە ڕاکردوو نیەو نیازی خەڵەتاندنی منیشی نیە. بەڵام نا! لەوانەیە ئەمە تازە بێت لەم مەیدانەدا، وە لە شوێنێکی تر کاری کردبێت نەک ئێرە.

کەڵەکەکە بەهێواشی بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن هەتا ئەوبەر ڕووبارەکە، بەڵام بەبێ ئەوەی کەس بایەخی هەبێت بۆ تێڕامانی پۆلیس و دڵەڕاوکێی مەجید. چرکەو خوولەکەکان زۆر لەسەرخۆ دەجووڵان، ئەمە لەکاتێکا ناوی ڕووبارەکە خوڕو خێراو شێتانە دەبزوا. هیلاکی زۆری بۆ ئەو کرێکارە هێنابوو کە کەڵەکەکەی ڕادەکێشا بەرەو ئەوبەری ڕووبارەکە تا لەوێ لەنگەر بگرێت.

پۆلیسەکە بە چاوێکی گەمژانەوە ڕوانیە مەجیدو پێی گووت:

- دەبێت بەر لە هەرچی جانتاکەت بپشکنم.
- جانتام پێ نیە .. ئەمە وەڵامی مەجید بوو.

لە ڕاستیشدا هیچ جانتایەکی پێ نەبوو. کە سەرکەوت هەر زەمیلەیەکی بچکۆلەی پێ بوو دەسکێ سڵقی تێدا بوو. چەند نامەیەکیشی لەناو گەڵای سڵقەکەدا بەباشی شاردبۆوە، لە

گیرفانە نهێنیەکەیشیدا ئەو نامە بچکۆلەیەی شاردبۆوە کە هەندێ زانیاری و ئاگاداریی تێدابوو دەربارەی چۆنیەتی رێکخستنەوەی رێکخراوە حیزبیەکەی کە دەچوو بۆ لایان. تۆبڵێی ئەم پۆلیسە ئەو نامانە بدۆزێتەوە؟ بێگومان دڵەڕاوکێیەکی هەر هەبوو، بەڵام بەلای زۆرەوە شتەکە بە باشی تێدەپەڕێ، چونکە نامەکان بەباشی شاردراونەوتەوە.

- پۆلیسەکە ووتی کەواتە گیرفانت ئەپشکنم، ئۆتۆمۆبێلەکەیش دەپشکنم، ئەمە لەکاتێکا بوو کە "کەژاوەکە" لە رووبار دەپەڕیەوە. مەجید زۆر بەدڵنیایی و باوەڕ بەخۆبوونەوە وەڵامی دایەوەو گووتی:
- منیش ئەمەوێت بمپشکنیت و ئۆتۆمۆبێلەکەیش بپشکنیت هەتا خۆت دڵنیا بیت لەوەی ڕاست دەڵێم.

پۆلیسەکە جارێکی تر تێڕامایەوە: ئەم پشکنینە بکات یاننا؟ دوای دوودڵیەکی کورت، هەروا سەرزارەکی کەوتە پشکنین، هیچی نەدۆزیەوە. فەرماندەی مەخفەرەکە سەیری ئەم پشکنینەی دەکرد. ئەویش پرسی:

- بۆچی پشکنیت؟ ئەیناسیت یان شکت لێ بوو؟
- ئەزانم شیوعیە، ڕەنگە ڕاکردوو بێت.
- کەواتە لەگەڵیدا برۆ بۆ (ق.د) و لەوێ بیدەرە دەست فەرمانگەی پۆلیس و هەرچی زانیاریەکیش دەزانیت بیخەرە بەردەست جەنابی ئۆفیسەر.

وا دیار بوو ئەم فەرمانەی لە فەرماندەی مەخفەرەکەوە دەرچوو بایەخدار بوو دەربارەی ئەم شیوعیە. فەرماندەی مەخفەرەکە خۆی، چارەی ئۆفیسەری پۆلیس و بەرێوەبەری پۆلیسی پارێزگای نەدەویست لە (ق.د)، ناوی وەزیری ناوخۆی نەدەزانی، حکومەتیشی خۆشنەدەویست بە گشتی. کەواتە ئەمە بۆ دژی شیوعیەتە؟ ئایا شیوعیەکان ئازارێکیان دابێت؟ ئایا ئەوە شیوعیەکانن هۆکاری نەقڵ کردنی بوون لە شوێنەکەی پێشوویەوە بۆ ئەم مەخفەرە دواکەوتووە، یان معاونی پۆلیسی (ق.د) ە؟ سەرباری ئەمانەیش هەموو،

شیوعیەکی خزمی هەیە گەلێ جار دەیبینێت و باسی کارە بەجێکانی دەکات. ئەگەر بەدەستی بوایە هەر یەکسەر ئەم شیوعیەی بەردەدا، بەڵام ناوێرێت. کەواتە با گوێی لە گووتەیەکی خۆشی بێت. لە مەجید نزیک بووەوە، فەرمانی کرد بە پۆلیسەکە بچێت پەرداخێک ئاوی بۆ بهێنێت، ئەمە بۆ دوورخستنەوەی بوو، بۆ ئەوەی بچپێنێت بە گوێی شیوعیەکەدا: نەترسیت، پێیان بڵێ من شیوعی نیم، ئەمەوێ بچمە (ق.د) بۆ دیدەنی خزمێکم. بە پۆلیسەکەیش دەڵێم یارمەتیت بدات. مەجید لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: من ناترسم، چونکە نە شیوعیم و نە هیچ تاوانێکیشم لەسەرە، ئەچم بۆ دیدەنی چەند خزمێکم.

پۆلیسەکە گەڕایەوەو پەرداخە ئاوە شاردراوەکەی دایە دەست فەرمانەدەکەی و بەخێرایی گووتی:

- من وامدەزانی شیوعیە، بەڵام دڵنیا نیم. واپێدەچێت بێتاوان بێت و هەر بەدوای دەستخستنی ڕزقێکدا بگەڕێت. کێشەیش نیە، لەگەڵیدا دەڕۆم بۆ لای معاون! با بزانین لەوێ کێ دەبێت بە کەفیلی.
- گوێ مەدەرێ! گوێ مەدەرێ! لەگەڵیدا بڕۆ بۆ معاونیەت و لەوێ بڵێ ئێمە شکێکمان لێی بوو.

هەموان چوونەوە جێی خۆیان لە ئۆتۆمۆبێلەکەدا مەجید نەبێت، شۆفێرەکەیش ڕووی کردە پۆلیسەکەو بەناوی هەموانەوە بۆڵەبۆڵێکی تری کرد: "پەڕینەوە لە ڕووبارەکە زیاتر لە نیو کاژێری پێچوو، ئەوە ئێوەیش زیاد لە پێویست دواتان خستین، کەی ئەگەین؟ ئەوانی تر لە ئۆتۆمۆبێلەکەدا بە دەنگێک کە دەبیسترا، وەڵامیان دایەوە: ڕاست دەکات! فەرماندەی مەخفەرەکە شڵەژا – عەریفە گەورەکەیان کە دوو سمێڵی ڕەشی گەورەی پێوە بوو – لەبەردەم سووربوونی ئەو هەموەدا لەسەر ڕۆیشتن، دەستپێشخەری خۆیی کردو فەرمانیدا بە پۆلیسەکە:

- لەگەڵ ئەو کوڕە سەرکەوە بۆ ئەوێ، بە جەنابی معاون بڵێ هەر شکێکمان لێ بوو.

کۆنە ئۆتۆمۆبێل بە ڕێگایەکی پێچاوپێچی نارێکوپێکدا کە بە تونێژاڵێک بەفری ئەو بەیانیە داپۆشرا بوو، کەوتەوە ڕێ. هیلاکیش کاری خۆی کردبووە سەر هەموو نەفەرەکان، ئەمە جگە لەو شۆفێرەی سەفەرە یەک لەدوای یەکەکانی بەهێزی کردبوو، بەجۆرێک کە تەنانەت ئەو ڕێگا درێژەیشی وەک ڕێگای نێوان دەرگای ماڵەوەو بازاڕی شارەکە سەیر دەکرد. هەر لەم ڕیگایەدا دواین "مامەڵەی بازرگانی" ی نێوان مەجیدو پۆلیسەکەیش بەسترا:

- ها، لە گەڕانەوەتدا چیم بۆ دەهێنیت؟
- مشکیەکی چاکت بۆ دەهێنم ئەگەر سەرکەوتوو بووم لە بازرگانیەکەمدا.
- ئەی بازرگانی تفەنگ و دەمانچەیش دەکەیت؟ پێویستم بە فیشەکە.
- حەزم لە بازرگانی تفەنگ و دەمانچە نیە، ئەوە مەترسی تێدایەو پێویست ناکات.
- بەڵام لە گەڕانەوەتدا ڕیگات بۆ مسۆگەر دەکەم بە سەلامەتی، ئیتر فیشەکەکان هەرچەند بن.
- مەیلم بەلای ئەو جۆرە "پیشە" یەدا ناچێت. باشترین مشکیت بۆ دەهێنم.

لەگەڵ پێکهاتنی هەردوولادا ئۆتۆمۆبێلەکە لە ناوەڕاستی شاردا وەستا. هەردووکیان دابەزین و پێکەوە بە پێ ڕوویان کردە سەرای حکومی کە دەکەوتە کەناری شار. پۆلیسەکە زمانی گۆڕی لەگەڵ مەجیدو هەروەک برادەرێکی قسەی لەگەڵ دەکرد. بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن کە بەفر بە بەرگێکی سپی بریسکەدار داپۆشی بوو، پۆلیسەکە پێی گووت:

- تکا ئەکەم هەرچی شتێکی مەترسیدار لە گیرفانتایە فڕێدە.

- سوپاس، سوپاس! هیچ شتێکی مەترسیدارم هەڵنەگرتووە –نەوە وەڵامی مەجید بوو، ڕاستیشی دەکرد، چونکە بەر لە چەند چرکەیەک نامە نهێنیە شارراوەکەی فرێ دابوو.
- بە جەنابی ئۆفیسەری پۆلیس دەڵێم من شکێکم لەم کەسە هەبوو کە ئێرانی بێت، ناڵێم شیوعیە، باشە؟ تۆیش ناوی یەکێک بهێنە لەوانەی لێرە نەتناسن، ئیتر کێشەکە چارەسەر دەبێت.
- باشە.

هەردووکیان چوونە ژوورەوە بۆ لای ئۆفیسەری پۆلیسی بەرپرسی سەرا، پۆلیسەکە ڕاپۆرتەکەی بە کورتە قسەیەک پێشکەش کرد. ئینجا ئۆفیسەرەکە لە مەجیدی پرسی:

- کێیە ئەو خزمەی هاتوویت بۆ لای لێرە؟
- سەعید زوهدی.
- ڕووی کردە پۆلیسەکە: باشە، برۆ لەگەڵیدا بۆ ماڵی سەعیدو لەوێ بەری بدە ئەگەر خزمیان بوو.

هەموو شتێک بە بیست و چوار خولەک ڕوویدا. پۆلیس گەڕایەوەدو مەجیدیش کاژێرێکی لە ماڵی خزمەکەی بردەسەر (لەڕاستیدا ناسیارێکی بوو نەک خزم) وە ئیتر ئەو ماڵەی جێهێشت بەرەو بازاڕی شارۆچکەکە بۆ پەیوەندی کردن بە هاوڕێ حیزبیەکانیەوە. هەر لەو ئێوارەیەیشەوە، چالاکانە دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکەی.

دەبوایە لە نێو هاوڕێ حیزبیەکانی شارۆچکەکەدا بەرپرسی یەکەمی حیزبی، واتە سکرتێری ڕێکخراوەکەو ئەو هاوڕێیانەیش دیاری بکات کە بۆ ئەندامێتی لیژنە حیزبیەکەو ڕێکخەری شانەکان و ئەندامی شانەکانیش دەستدەدەن. ئەمە ئەرکێکی ئاسان نەبوو، بەتایبەت بۆ کەسێکی وەک مەجید کە کەسی لەو هاوڕێیانە نەدەناسی، بەڵکو ئەمە یەکەمجارە دەیانبینێت.

مەجید یەکتر بینین و قسەگۆڕینەوەی لەگەڵ پێنج لە چالاکترین هاوڕێدا ڕێکخست، پێشان هەریەکە بەجیا. هەندێکیان قوتابی خێزانە زەحمەتکێشەکان و هەندێکیشیان لە پیشەگەرە ڕنجکێشەکان بوون. زیاتر لە ڕۆژێک لە ماڵی هاوڕییەکی نانەوادا کۆبوونەوە. ئەو نانەوایە شیوعیەکی بە حەماس، لاوێکی باڵا مامناوەندیی، گەنم ڕەنگ، سمێڵ ڕێکخراو، لەگەڵ خێزانەکەی و منداڵەکانی لە خانوویەکی قوڕینەی سادەدا دەژیان. ئەو لاوە پڕ بوو لە چالاکی و گەشەو زەردەخەنەیش لە لێوەکانی نەدەبووەوە تا ئەو دوا خوولەکانەی باسەکە لە دەوری تێرۆرو ئەشکەنجەی هاوڕێ بەندکراوەکانی دەسووڕایەوە. ئایا ئەم هاوڕێ نانەوایە دەستدەدات بۆ سکرتێری داهاتووی قەزا؟ هیچی لە گیانی تێکۆشان و حەماسی شۆڕشگێری کەم نیە، بەڵام ئەزموونی خەباتی کەمە. ئەو هێشتا خام و سادە بوو. کەواتە با ئەندامی لیژنەکەی داهاتوو بێت، وە یاریدەدەری ڕێکخەرەکە بێت. بۆ ئەوە دەستنادات جێگای هاوڕێی یەکەم پڕ بکاتەوە.

ئەی هاوڕێ خەیاتەکە چۆنە، ئەو کەسەی کە هاوڕێ مەجید یەکەمجار پەیوەندیی پێوە کردو هەموو هاوڕێیانی ڕێکخراوەکەی بەهۆی ئەوەوە ناسی؟ نوێنەرەکەی حیزب لەسەرخۆ کەوتە قسەکردن لەگەڵ لاوێکی باڵا مامناوەندی بە جووتە سمێڵێکی بادراوەوە. ئەویش بە بایەخەوە گوێی بۆ گرتووە، بەڵام دەموچاوی لەوە نەدەچوو ئەو شتانە وەربگرێت کە گوێی لێیەتی. جارجار پێدەکەنی بەبێ ئەوەی هاوڕێکەی لە هۆکاری پێکەنینەکەی تێبگات. کاتێک دەستی بە وەڵامدانەوەو قسەکردن دەکرد، ئەبەرەکانی دەنگی خۆویستی و هەستێکی نادادپەروەرانەی پێوە بوو، ئەمە لەگەڵ سووربوونی لەسەر بەرژەوەندی حیزب. ئەم خەیاتە شیوعیە چ جۆرێکە؟ مێتالەکەی لە چیە؟ بێگومان کەسێکی چاکە، بەڵام ئەو یەکێکە لەو پیشەگەرە زەحمەتکێشە خەباتگێڕە شۆڕشگێڕانەی کە نابێت زۆری بخرێتە ئەستۆ. ئەگەر زۆر بخەیتە سەرشانیان زیان دەدەیت. بەڵام هەرچۆن بێت بۆ ئەندامێتی لیژنە باشە، هاوڕێکانیشی قبوڵی دەکەن، بەڵام ئەندامێکی چالاک نابێت تیایا.

شەوێکی تر مەجید بڕیاریدا بچێتە ماڵی خەیاتێکی تری شیوعی. ئەمەیان لە بینایەکی باشتردایەو شتومەکی ماڵەکەیشی لە ماڵی هەموو هاوڕێکانی تر باشتر بوو. هۆکارەکەیش ڕوونە: سەرچاوەی داهاتە خێزانیەکەی هەر تەنها کارەکەی خۆی نیە، بەڵکو کاری خێزانەکەشێتی کە لە یەکێک لە دامودەزگا حکومیەکاندا کار دەکات. ئەو شەوە مەجید شتێکی دەستکەوت کە زۆر پێویستی بوو - هاردراوێکی دی.دی.تی! چەند ڕۆژێک بوو شکی لە دوژمنێکی لەعنەتی بوو کە لە شوێنێکی نادیارەوە هەڵیکوتابووە سەری. ئەو دوژمنە بێفەڕە نە کێچەو نە ئەسپێ، بەڵکو لە ئەسپێ بچووکترو دڕندەتریش، لەناو قژدا خۆی دەشاردەوەو بەخێراییش زیادی دەکرد، ئیتر بەبێ ئەوەی هەوڵێک بدات بۆ ڕزگار بوون لە دەستی. لە ماڵی ئەم هاوڕێ خەیاتەی ئەو هاڕراوەی دەستکەوت دی.دی.تی. بڕیاریدا وەک چەکێکی نوێ تاقیبکاتەوە دژی ئەو دوژمنە هێرشبەرە، چەکێکی زۆر کاریگەر بوو، شوێنەواری ئەو جانەوەرە پیسەی نەدەهێشت. وە بۆ یەکەمجار دوای زیاتر لە یەک هەفتە، ئەو شەوە خەوێکی خۆشی کرد، وە زۆر سوپاسی ژنی ماڵەکەی کرد ئەو هاڕراوەی دایە کە بەلای ئەوەوە لە ئاڵتوون بە بایەخ تر بوو.

با بگەڕێینەوە بۆ لای خەیاتە شیوعیەکە. جیگای ئەم کوێ بێت لە ڕێکخراوەکەدا؟ ئەو زۆر چالاکە. بەڵام هەر بۆ ئەندامی شانەیەک باشە. بەڵام ڕەنگە خۆی داوایەکی لەوە زیاتری هەبێت. هەرچۆن بێت نابێت لە خزمەتەکانی بۆ حیزب کەم بکرێتەوە. زمانێکی باشی پێوەیە بۆ پڕۆپاگەندەی سیاسی، ئەمە هەروەک چۆن دوو دەست و دوو قاچی چالاکیشی پێوەیە بۆ بەکارهێنانی مەکینەی خەیاتی لە دوکانە بچکۆلەکەیدا.

قادر، لاوێکی شیوعی بە حەماس، لە خێزانێکی ڕەنجکێش، توانای ئەو بە شێوەیەکی بەرچاو لە هاوڕێکانی تری جیادەکرایەوە، هەر ئەمەیش بوو، بەکردەوە ئەوی خستە سەنتەری بەرپرسیارێتی یەکەم، ئیتر بەبێ ئەوەی هیچ بڕیارێک دەربکرێت بۆ ئەوەی ئەو ئەرکی بەرپرسیارێتی پێبسپێردرێت. ئەو قسەکەرێکی چاک بوو، توانای ڕاوێژی هەبوو، ڕۆشنبیریەکەیشی لە هاوڕێکانی دەوروبەری زیاتر بوو، ئەمە سەرباری سادەیی و ئاستی

لاوازی. ئەو لەو ڕۆژگارەدا باشتر قبوڵ دەکرا وەک سەرکردەیان. مەجیدیش ناتوانێت لە چەند ڕۆژێک و چەند بینینێکدا لەمەی زیاتر لە بارەوە بزانێت. بەڵام، سەرباری هەموو شتێک، ڕایەک هەیە لەبارەیەوە -دەبێت ڕایەکیش هەر هەبێت- نەک هەر تەنها سەرنجێک. با قادر سکرتێری لیژنەکە بێت، واتە با هەروەک ڕابووردوو، بە سکرتێری ڕێکخراوەکە بمێنێتەوە. ئەمە دواین ڕای نوێنەرە حیزبیەکەیە کە بڕیار بەدەستە بۆ دیاری کردنی لیژنەی قەزاو سکرتێرەکەی.

هاوڕێیەکی تری مناڵکار هەبوو لە تەمەنی شانزەساڵاندا، ئەسمەر، باڵای کورت، سادە، قورس، ئەوەندە لەسەرخۆ بوو دەتگووت چوارەمین دەیەی تەمەنی پڕ کردۆتەوە. ئەم قوتابیە بچکۆلەیە کوڕی زەحمەتکێشێکی ئەم شارۆچکەیە بوو، ڕێزی هاوڕێ گەورەو بچووکەکانی بۆ خۆی ڕاکێشابوو، لەنێو قوتابیانیشدا وەک کەسێکی هاندەرو ئاراستەکەر ناسرابوو. ئەو ڕێکخەری بێ ڕکابەر بوو لە "کۆمەڵگە بچکۆلەکەی قوتابیان" دا لەو شارۆچکەیە. بۆیە سروشتی بوو وەک کادرێکی ئەو ڕێکخراوە دابنرێت لەوێ، مەجیدیش بەشێوەیەکی باشتر هەوڵی ناسینی زیاترو لایەنە هەمەجۆرەکانی بدات. ئایا کەسێکی ئاوا بچووک دەستدەدات بۆ ئەندامێتی لیژنەی حیزبی؟ وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسان نەبوو بۆ کەس لەو بارودۆخە هەستیارەدا کە لە شوباتی ١٩٤٩ دا باڵی بەسەر ئەو شارۆچکەیەدا کێشابوو. پۆزەتیف وەڵام بدەیتەوە یان نێگەتیف، هەر هەست بە نادڵنیاییەک دەکەیت. لەوانەیە وا چاک بێت "ئەندامێکی ڕێسێرڤ" بێت لە لیژنەکەدا.

دوای ئەمە ئینجا کاتی پێکهێنانی شانە حیزبیەکان و دامەزراندنەوەیان و دابەش کردنی کارە لە نێوان کادرەکانیدا. شانەکان زۆر نەبوون، ئەگەرچی نفوزی سیاسی حیزب فراوان بوو لە نێو جەماوەردا لەو شارۆچکەیە. ڕێکخستنەکەیش هەر تەنها لە شارەکەدا بوو، بەبێ ئەوەی درێژ بووبێتەوە بۆ ئەو دێهاتانەی دەوروبەری کە لەژێر ستەمی دەرەبەگەکاندا بوون.

سنووری عێراق-ئێرانی لەم شارۆچکەیەوە دوور نیە، وە لەگەڵ ئەوەی ساڵانێکی درێژە یاسا لە هەردوو وڵاتدا، بڕینی ئەو سنوورەی قەدەغە کردووە بەبێ پەساپۆرت و مۆری چوونە ژوورەوە، بەڵام خەڵکی ئاسایی لە دێهاتەکانی هەردوولا، هەر هاتووچۆو سەردان و مامەڵەیان کردووە لەگەڵ یەکتر، ئەمە هەروەک ئەوەی شتێک هەر نەبێت پێی بڵێن سنوور. "یاسا" و ڕێسای ئەو خەڵکە خۆیان، لە بەرژەوەندیەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەمەشیان لە ئەوەکانی ڕابووردووەوە بۆ ماوەتەوە. ئەو ڕێسایانە هاتووچۆی ئازاد کردووە بۆ تاک و بۆ کۆمەڵ لە پێناوی دەستخستنی ڕزقێک یان مەبەستێکی تردا. مەحمودی فرۆشیاری گەڕۆک کە مەجید لەم گەشتەیدا لە یەکێک لە ماڵەکانی ئەم شارۆچکەیەدا بینی بووی، یەکێک بوو لەو کەسانە:

- ئەرێ زۆر دێیتە ئەم شارە کاک مەحمود؟ مەجید لێی پرسی.
- هەرکاتێک پێویست بێت دێم، مەحمود وەڵامی دایەوە.
- ئەی هەرگیز پۆلیس نەیگرتوویت کە بە قاچاخ دێیتە عێراقەوە؟
- جا کوا بە قاچاخ هاتووم؟ ئەمەی بە سەرسامیەوە گووت، دیار بوو قورس بوو لەوە تێبگات کە هاتنە ژوورەوەی بەبێ پەساپۆرت قەدەغەیە.
- ئایا بژێوی لێرە باشترە یان لەوێ؟
- بژێوی لە عێراق باشترەو کاریش زۆرترە.
- ئەی ڕای خۆت و خەڵکی چیە لەسەر حوکم و لەسەر شاهەنشا؟
- من شام خۆشناوێت، ئەو تەنها بایەخی بۆ بەرژەوەندی خۆی هەیە نەک بەرژەوەندی من.
- ئەی ڕات چیە لەسەر حیزبی "تودە" و تێکۆشانی دژی شاهەنشا؟
- بە حیزبێکی لەو چەشنە سەرسام نیم کە ڕیزەکانی هەر هەژارو پێ پەتیە. ئایا پێ پەتی و موفلیس و گیرفان خاڵی ئەتوانێت حیزبێک دابمەزرێنێت یان کاری تێدا بکات؟

ئا بەم ووشە ساویلکانە، مەحمود بەڕوونی، دواکەوتوویە فیکری و سیاسیەکەی خۆی دەربڕی. وە ناتوانین بڵێین ئەو ڕاوێژە سیاسیەی لەگەڵ ئەو ڕوویدا، هیچ کاریگەریەکی هەستپێکراوی لەسەر فیکری ئەو جێهێشتبێت.

* * *

مەجید بە تەواوی بەسەر وەختی جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکانیەوە بوو، وە هەر بیری چووبۆوە کە ئەو هەوڵەی درا بۆ نوێ کردنەوەی ڕاپەڕینی کانون، بە تێشکان کۆتایی هات و دوژمنیش هەر بەدەوامە لە هێرشی پێچەوانە دژی حیزبی شیوعی. هەواڵێکی تریش لە چەند ووشەیەکدا: "تاوانی لەسیدارەدان جێبەجێ کرا بەسەر سەرکردەکانماندا" هۆشی ئەوی برد بەرەو شوێنێکی تر، تەواو جیاوز، لە ناخەوە هەژاندی. شەپۆلێک لە ئازاری قورس و ڕق چینایەتی، هەموو ئەو ووشانەی هێنایەوە یاد کە لە هاوڕێیانی تری بیست بوو دەربارەی فەهدو زەکی بەسیم و حسێن شەبیبی، هەموو ئەو ووشانەیشی لە کتێبەکانیان خوێندبوونیەوە، هەموو ئەوانەیشی هێنایەوە یاد کە ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا دەیخوێندنەوە دەربارەی دادگایی کردنیان لە ساڵی ١٩٤٩ دا. فەهد بەر لە دادگایی کردنیشی، سەرکردەیەکی خۆشەویست بوو لەنێو شیوعیە عێراقیەکاندا، ئێستا ئەو خۆشەویستی و سەرسووڕمانە بەو، چەندانجاری تریش زیادی کردووە. ئەو فرۆشێکی سادە بوو لە ڕیزەکانی حیزبدا هەڵقوڵا بوو، جێگای شانازی بوو بۆ بزووتنەوەی شیوعی لەم وولاتەدا، سەرکردەیەکی سیاسی شارەزاو ڕێکخەرێکی حیزبی باش بوو، پەروەردەکاری نەوەیەک بوو لە هاوڕێکانی و لە هەموو خەباتگێرە شۆڕشگێرەکان.

لەکاتی ڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨ دا فەهدو زەکی بەسیم و شەبیبی لە زینداندا بوون. دوای ئەوە دەنگی جەماوەری هەزاران بەرز بۆوە بۆ بەردانی ئەوان و هەموو زیندانیە سیاسیەکان. بەڵام کۆنەپەرستە بەکرێگیراوەکان کە دەستی لە پێگە سەرەکیەکەی خۆی بەرنەدەدا، هەر سوور بوو لەسەر هێشتنەوەیان لە بەندیخانەدا، ئیتر ئەمە لە ڕقداو لە

ترسیشدا. بەبێ شک دوژمن مەودای کاریگەریی سیاسی و حیزبیی ئەو سەرکردانەی دەزانی ئەگەر لە بەندیخانە دەرچوونایە. هەر لەبەر ئەوە پەنایان بۆ هەموو ڕێگاو شێوازێک دەبرد تا لەودیو شیشە ئاسنەکانی بەندیخانەوە بیانهێڵنەوە. ئاە، ئەگەر هەوڵی هەڵاتنیان بدایە لە زیندان دوای ڕاپەڕینی ١٩٤٨ کە ئەوکاتە دەتوانرا.

"تاوانی لە سێدارەدان بەسەر سەرکردەکانماندا جێبەجێ کرا" –ئەو ووشانە ئازارو ڕقی نوێی لە دڵی هەزاران کەس لەوانەدا دەووروژاند کە پڕ بوو لە خۆشەویستی گەل و ڕق لە داگیرکاران و لایەنگرە ناوخۆییەکانیان. ئەو هەواڵە لە ئێستگەی لەندەنەوە بڵاوکرایەوە، ڕادیۆی زوبانحاڵی ئەوانەی جەماوەری عێراق دەیان ساڵە بە خراپترین دوژمن و بەهۆکاری کارەسات و وەیلاتی دادەنێن. بەدڵنیاییەوە لەسەر زەوی عێراقیش لەوانە زۆرن کە دڵیان پڕ دەبێت لە خۆشی بە بیستنی ئەم هەواڵەو لە ئێوارەیشدا لە هۆڵە ڕازاوەکانیاندا پێکی سەرکەوتن هەڵدەدەن و تەلەفۆنەکانیان هەڵدەگرن و پیرۆزبایی لە "باڵوێزی بریتانیا" و بەهجەت عەتیە[2] و کۆشکی پادشایەتی و پادشای گەورەو سەروەرەکان دەکەن. ئەمە وەک ئەوەی گوایە ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بێت بۆیان، بەڵام ئەوە هەر تەنها سەرکەوتنێکی وەختی بوو و بەس. ئەو جۆرە "سەرکەوتنانە" فاکتەرێکی تریشی دەخستە سەر فاکتەرەکانی تێشکانی ئایندەیان.

ڕادیۆ لەو ماڵەدا نەبوو کە مەجید میوانیان بوو، بەڵکو لە هیچ ماڵێکی تریشدا نەبوو لەو هاوڕێیانەی ئەو لە شارۆچکەی (ق.د) دا پەیوەندی پێوە کردبوون. یەکێک لە هاوڕێیان

---

[2]. بهجت داود سلمان العطية، سەرکردەیەکی سەربازیی عێراقی بووە، لە سەردەمی پادشایەتیدا بۆتە یەکەمین بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (مدير الأمن العام) ی عێراقی، بەرپرسی ڕاوەدوونانی شیوعیەکان بووەو نازناوی پادشای وەرگرتووە لە مەلیک فەیسەڵی یەکەمەوە. هەتا ١٤ تەموز ١٩٥٨ هەر لەو پلەیەدا بووە. بەهجەت هاوڕێی قوتابخانەی یوسف سلمان یوسف (فەهد) بووە، کاتێکیش فەهد لە زینداندا بووە، بەهجەت بەڕێوەبەری ئەو بەندیخانەیە بووە کە فەهدی لێ بووە، وە هەر پەیوەندی پێوەیەوە بووەو بەردەوامیش ڕاوێژیان گۆڕیوەتەوە. کاتێک فەهد دەگیرێت کەس نەیناسیوەو نەیزانیوە سەرۆکی حیزبە. دەیبەنە لای بەهجەت، بلوەش دەکەن بە یەکداو چایەکی بۆ داوا دەکات و دەڵێت بە باشی مامەڵەی بکەن. لە ١٩٥٨ دا بەهجەت دەگیرێت و لە لایەن مەهداویەوە (فاضل المهداوي) حوکمی لەسێدارەدان دەدرێت بەسەریداو لە ٢٠ سپتەمبەری ١٩٥٩ لە سێدارە دەدرێت (تێبینی وەرگێڕ).

ئەو هەواڵەی لە ڕادیۆی یەکێک لە چایخانە کەمەکانی ئەو شارۆچکەیەوە بیستبوو وە هەر بەخێرایی گەیاندبوویە نوێنەرە حیزبیەکەیان. ئەویش چاوەکانی پڕ بوو لە ئاو، خەریک بوو بە گریانەوە دەتەقیەوە، بەڵام لەو چرکەساتەدا زۆری لەخۆی کرد گریانەکەی بخواتەوە. دوایی، کاتێک تەنها کەوت، تێر گریا. بەڵام هەر بەخێرایی لەگریان وەستایەوە وەک ئەوەی ئەمە نیشانەی لاوازی و بێ هیوایی بێت. بۆ ئەو، خەباتگێڕێکی شیوعی، وا چاکترە پەیمان بەو سەرکردە گیانبەختکردوانە بدات کە لەسەر ڕێی ئەوان بەردەوام دەبێت و سوورە لەسەر تۆڵەسەندنەوەیان لەبری ئەوەی بگری بۆیان: "سوێند بە خوێنە پاکەکەتان هاوڕێ گیانبەختکردوەکان، ئەو ئاڵا مەزنەی ئێوە هەڵدەگرین، ئاڵای پرۆلێتاریاو حیزبە پێشڕەوەکەی".

ڕۆژی دواتر نوێنەرە حیزبیەکە چالاکیەکانی کورت کردەوە. خۆیشی هەر لە تەواو کردنی ئەو ئەرکانەدا بوو کە نێردرا بوو بۆ جێبەجێ کردنیان. بەر لەوەی هاوڕێکانی جێبهێڵێت، ڕێکەوت لەگەڵیاندا لەسەر چۆنیەتی پەیوەندیە حیزبیەکانی داهاتوو لەنێوان ئەوان و سەرکردایەتی ڕێکخراوی پارێزگادا. دوای دوو ڕۆژ شارۆچکەکەی جێهێشت و بە پاسێکی تەختەی کۆن بەرەو شارەکەی گەڕایەوە. دوای کەمێک پاسەکە دەگاتە یەکەمین شوێنی پەڕینەوە لە ڕووبارەکە کە مەخفەری پۆلیس و ئەو پۆلیسەیشی لێیە کە پەیمانی باشترین جۆری "مشکی" ی پێدراوە وەک دیاری. جا ئەم ڕاکردووە چ بیانوویەک بهێنێتەوە کە ئەم مشکیەی نەهێناوە؟ دەبێت چەند ووشەیەکی گونجاو ئامادە بکات کە پۆلیسەکە باوەڕی پێبهێنێت. ئەمەیش ئاسانە، دەتوانێت پۆلیسەکە ئاگادار بکات کە لە سلێمانیەوە بروسکەیەکی بۆ هاتووەو داوا دەکەن بەخێرایی بگەڕێتەوە، ئەویش ناچاری گەڕانەوە بووە بە پەلەو دڵەڕاوکێوە. دوای چەند ڕۆژێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ شارۆچکەی (ق.د) بۆ تەواو کردنی کارەکەی. شتەکە بە بیانوویەک دەپۆشێت.

ئۆتۆمۆبێلەکە لەوبەر ئاوەکەوە لە چاوەڕوانیی پەڕینەوەدا وەستا. مەجیدی لاویش بەچاو کەوتە گەڕان بەدوای ئەو کەسەدا کە حەزی لە چارەی نەبوو وە پەیمانی مشکی پێدراوە بەدیاری.

پۆلیسێک دەرکەوت، دووهەم و سێهەمیش بەدوایدا. بەڵام ئەو پۆلیسەیان لەگەڵدا نەبوو، مەجید شوێنەواری ئەوی لێوە دیار نەبوو لەوێدا، بۆیە ئیتر پێویستیشی بەوە نەما بیانوو بهێنێتەوە بۆ ئەم بێ وەفاییەی کە پەیمانەکەی نەبردۆتەسەر.

ئیوارەی ئەو ڕۆژە مەجید لە ژوورێکی بچکۆلەدا دانیشتبوو،بەرامبەر بە تروسکایی چرایەکی نەوتی پێنووسێکی گرتبوو بەدەستیەوە هەتا ڕاپۆرتێک دەربارەی دەرئەنجامی گەشتەکەی بۆ شارۆچکەی (ق.د) بنووسێت. ئەو دینارو درهەمانەیشی کردە پاشکۆی ڕاپۆرتەکە کە لە ئابوونەو بیتاکی هاوڕێیان و لایەنگرانی حیزب کۆکرابۆوە لەوێ.

دوای چەند ڕۆژێک لە گەڕانەوەی، مەجید بە نامە لە ڕێکخەرە حیزبیەکەیەوە ئاگادار کرا ئامادە بێت لە کاتێکی دیاریکراودا بۆ بینینی هاوڕێیەکی میوان. لەسەربەتی شوێنێکی وەختی بۆ ئەو میوانە دابین بکات لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێیاندا هەتا ئەو شتەی دەوروبەری جێبەجێ دەبێت. میوانەکە بینرا، پیاوێکی باڵا مامناوەندیی، پێست سپی، شێوەی تێکەڵەیەک بوو لە تێڕامان و سادەیی گوێ نەدان بە هیچ شتێک. دیالێکتەکەیشی دیار بوو کە خەڵکی شارێکی ترە.

- مەجید بەدەم ڕۆیشتنەوە لەگەڵ میوانەکەدا بە کۆڵانێکی باریکدا بەرەو ماڵی هاوڕێیەکی لیژنەی قوتابیانی شار، لێی پرسی: هاوڕێ لەوەوبەر لەم شارە ژیاویت؟
- نەخێر، لەمەوبەر لێرە نەژیاوم، میوانەکە وەڵامی دایەوە.
- کەواتە شارەزای شەقام و کۆڵانەکانی ئەم شارە نیت.
- نەخێر، شارەزا نیم.
- با ناوێکت بۆ دانێین کە لەو ماڵە بانگت بکەن پێی کە جێگیر دەبیت تیایا.

- خراپ نیه.
- با ناوت سەلیم بێت. باشە؟

میوانەکە بە سەر ڕاوەشاندنێک ڕەزامەندیی نیشاندا. هەردووکیان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن. لە کاتی نزیک بوونەوەدا لە ماڵەکە مەجید دڵنیابوو لەوەی کەس بەدوایانەوە نیە. سەلیمی میوانی پێشکەش کرد، عەلی پێشتر بە ئاگا بوو لەمە.

- ئەمە ئەو هاوڕێیەیە کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو میوان دەبێت لەلاتان.
- سڵاوت لێبێت و بەخێر بێیت.

پاشان مەجید چپانی بە گوێی قوتابیە لاوەکەدا، عەلی: تکایە کەسوکار ئاگادار بکە با کەس نەپرسێت لە ناوی میوانەکەو ئەو جێگایەی لێوەی هاتوودو بۆی دەچێت. ئەوە نامۆژگاریەکە لە حیزبەوە. لاوەکە وەک شتێکی بەدیهی وەڵامی دایەوە: بێگومان کەس هیچی لێناپرسێت. بۆچی لێی بپرسن؟

لە ڕاستیدا مەجید خۆیشی ناوی ڕاستەقینەی میوانەکەی نەدەزانی و هیچیشی لەبارەوە نەدەزانی و هەوڵیشی نەدەدا هیچ شتێک بزانێت دەربارەی. ئەوە هاوڕێیەکە حیزب هێناویەتی و تەواو!

دوای دوو ڕۆژ مەجید لە حیزبەوە ئاگادار کرا هاوڕێیەک ئامادە بکات تا لەگەڵ میوانەکە بڕوات بۆ شارۆچکەی (ق.د) و لەوێ بیداتە دەست هاوڕێیانی ڕێکخراوەکەو هەرچیشی دەوێت یارمەتی بدەن. ئەویش هاوڕێ بارامی ئامادە کرد وەک ڕێ نیشاندەرو زانیاری و تێبینی پێویستی دایە بە مەبەستی پاراستنی لە ڕێگاو پەیوەندی کردن بە هاوڕێیانەوە لەوێ.

- هاوڕێ بارام بیرت نەچێت، تۆ بەرپرسیارێتی یەکەمت لە ئەستۆیە دەربارەی هەر شتێکی خراپ کە تووشی ئەم هاوڕێیە ببێت لەگەڵیدا دەبیت، ئەگەر پۆلیس ڕێیان لێگرت، دەڵێت بەدێنی بۆ لای خزمێکم دەچم بەناوی عوسمانی نانەوا. لە

حاڵێکی ئاوادا دەبێت تۆ بە پەلە بڕۆیت بۆ لای هاوڕێ ئانەواکەمان و ئاگاداری بکەیت.

- هەموو شتێک بەو جۆرە دەبێت کە تۆ دەتەوێت، هاوڕێ!
- گەشتێکی خۆش، بە سەلامەتی بگەڕێنەوە.

مەجید تێبینی ئەوەی دەکرد کە هاوڕێ بارام بە حەماسەوە ئەو ئەرکەی گرتۆتە ئەستۆ، ئەمەیش شتێکە بە تەواوی لەگەڵ گیانی بەرزی تێکۆشەرانەی شیوعیە عێراقیەکاندا دەگونجێت. بەڵام شتێک هەیە کە دڵەڕاوکێیەک دەخاتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەوەی بە گیانێکی تێکۆشەرانە وەسف دەکرێت، ئەوە لاوێکی چەنەبازەو حەزی بەخۆدەرخستنە. دەبێت چی ڕووبدات ئەگەر ئەم چەنەبازیە گرفت و مەترسی بۆ خۆی و هاوڕێکەی دروست بکات؟

هەردووکیان ڕۆیشتن، چەند پیاوێکی پۆلیسیش لە یەکێک لە خاڵەکانی پشکنیندا شکێکیان کردبوو. بەڵام میوانەکە گووتبووی دەچێتە دیدەنی خزمێکی کە ناوی عوسمانی ئانەوایە لە (ق.د)، پۆلیسی خەفەر دەیبات بۆ ئەوێ و بارام بە پەلە، هەر بەگەیشتنی ئۆتۆمۆبێلەکە، خۆی دەگەیەنێتە ئانەواو لە هەموو شتێکی تێدەگەیەنێت و پێی دەڵێت وەڵامی ئەمیش چی بێت. هەر لە چەند چرکەیەکدا عوسمانی ئانەوا بە پەلە دەڕوات و خۆی دەگەیەنێتە سەنتەری پۆلیس و دەبێتە کەفیلی سەلیمی خزمی کە ڕۆژێک لە ژیانیدا نەیبینیوەو هیچ لەبارەیەوە نازانێت ئەو ووشانە نەبێت کە بەر لە چەند خوولەکێک لە بارامی بیستووە! بەختیشی باش بوو، لەو کاتەدا هەر تەنها سەلیمی بەناو خزمی، لەلای پۆلیس دەبێت، ئەمەیش دۆزینەوەی و ناسینەوەی ئاسان کردبوو. عوسمان لە پۆلیسێک دەپرسێت:

- ئەرێ خزمێکم هاتووە بۆ لام و پۆلیس شکیان لێکردووە لە ڕێگاو هێناویانە بۆ ئێرە. دەزانیت کامەیەو لە کوێیە؟

- پۆلیسەکە وەڵام دەداتەوەو پەنجە درێژ دەکات بۆ پیاوێک لەبەردەم زیندانە بچکۆلەکەدا دانیشتووە.

نانەواکە خۆی دەچێتە لای سەلیم و باوەشی گەرمی پێدا دەکات وەک ئەوەی برای بێت و چەند ساڵێک بێت نەیبینیبێت، بەدەنگی بەرز قسەی لەگەڵ دەکات بەجۆرێک کە جێی سەرسووڕمانی ئەوانەیە لێیەوە نزیکن:

- ئای کە دڵخۆشم بە هاتنت ئەزیزم، ئای کە چاوەڕێم کردیت!

گەرچی سەلیم ساردو کەم بایەخ وەڵام دەداتەوە، بەڵام هەڵوێستی عوسمان بواری شک و گومان ناهێڵێتەوە لە خزمایەتیی نزیکی نێوان خۆی و میوانەکەی. دوای ماوەیەکی کەم هەرسێ پیاوەکە، عوسمان و بارام و سەلیم دەگەنەوە ماڵی عوسمان و بە پێکەنینەوە دەکەونە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیان و ڕۆڵە ئەکتەریە سەرکەوتووەکەی نانەواکە بینیویەتی.

بارام بە سەلامەتی گەڕایەوەدو میوانەکەی لە (ق.د) جێهێشت. بەڵام دەبوایە میوانەکە ڕێڕەوەکەی بەردەوام بوایە بۆ شوێنێکی دوورتر، وەک دواتر مەجید زانی. بەڵام بە هۆی زۆری بەفری ڕێگاوە، یان بە هەر هۆکارێکی تری نادیار، گەشتەکە دوادەکەوێت. وە بەو هۆیەوە کە هاوڕێیان نەیانتوانیوە چەند ڕۆژێکی درێژ لەو شارۆچکە بچووکەدا بە سەلامەتی بیپارێزن، پێشنیار دەکەن بچێتە ماڵی دۆستی یەکێکیان لە دێیەکی نزیک. ئەو برادەرە پیاوێکی دەسەڵاتدارە لەوێ، نیمچە موڵکدارێکەو دیوەخانێکی هەیە، گونجاوە بۆ سەلیم لەوێ بمێنێتەوە تا ئەم وەختە تێدەپەڕێت کە بۆتە ڕێگری گەشتەکەی.

ڕۆژێک پۆلیس ئەدات بەسەر ماڵی ئەم موڵکدارەدا، ڕەنگە بەهۆی دووزمانیی کەسێکەوە بووبێت، دەکەونە گەڕان بەدوای "یەکێکدا کە لە عەدالەت هەڵاتووە"، لەوێ سەلیم دەگیرێت و دەنێردرێت بۆ فەرمانگەی پشکنینی تاوانکاری لە بەغدا.

## یەکەمین دابەش بوون

مەجید نەیزانی بوو بەرپرسی یەکەمی ڕێکخراوی حیزبی پارێزگاکە ڕۆیشتووەو هاوڕێیەکی تر خراوەتە جێگای وەک سەرکردەی ڕێکخراوەکە. وە وەک تۆڕی کادری حیزبی لە ڕێکخراوەکە، ئەوەیشی نەزانی بوو کە لێدانێکی قورس بەر حیزب کەوتووە، بەتایبەت بەهۆی ڕووخانی کەسانێکی ترسنۆکەوە لە پلەی حیزبی هەستیاردا. ئەم بەرپرسە تازەیەیش، یەکێکی تر بوو لەوانەی پراکتیزەی بەرپرسیارێتیەکەی دەکرد بەبێ پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بە ڕێکخەرانی ڕێکخراوەکەوە، بەڵکو هەر لە ڕێی نامەی حیزبیەوە ئەو کارەی دەکرد. ئەمەیش کارێک بوو کە نەدەبوا لە بارودۆخێکی شازی لەو جۆرەدا هەڵەی تێدا بکرێت. ئەو بەگشتی زۆر چالاک بوو لە نامە نووسینداو وورد بوو لە تێبینیدا.

لە ڕۆژانی یەکەمدا هەموو شتێک بە ڕێڕەوی ئاسایی خۆیدا تێپەڕی تا ئەوکاتەی شتێک ڕوویدا کە هیچ حیسابێکی بۆ نەکرابوو. کتوپڕ ڕوویداو بەتوندی هەموو ڕێکخراوەکەی هەژاندو دەنگدانەوەو کاریگەرییشی لەسەر تەواوی حیزب جێهێشت. ئەمە ئەو شتە ناکاوە بوو:

ڕۆژێک لە ڕۆژە گەرمەکانی ئەپریل نامەبەرە حیزبیەکە نامەیەکی بە سەمغ پێچراوەی لە گیرفانی دەرهێناو دایەدەست مەجید. ئەمەیان هەر ڕووداوێکی ئاساییە وەک هەموو ڕۆژەکانی تر. بەڵام ئەمجارە ناوەڕۆکی پۆستە حیزبیەکە ئاسایی نەبوو وە لە ڕۆژانی ڕابووردوو نەدەچوو. ئەمە نامەیەکی کۆپی کراو بوو بە کاربۆن و واژۆی "بەرپرس" ی پێوە بوو، تەرخان کرابوو بۆ کاروباری ناوخۆیی حیزبی مەترسیدار، کاروبارێک کە ئا بەمجۆرە ڕووبەڕووی کادرێکی ڕێکخراوەکە کراوەتەوە.

بڵاوکراوەکە ئەوەی یاد خستۆتەوە کە هەڵمەتێکی گەورەی سەرکوت کردن و گرتن ڕووبەڕووی هەزاران شیوعی بۆتەوە لە هەموو ووڵاتدا، بێگومان ئەمە زانراوە. ئەوەیشی یاد

خستۆتەوە کە کەساتێکی دیاریکراو لە ناوەندە سەرکردایەتیەکانی حیزبدا کەوتوونەتە دەستی دوژمن و ڕووخاون و نهێنی حیزبی و کادری حیزبییشیان داوە بەدەستەوە. ئەم پرسە مەترسیدارە لەلای مەجیدو هاوشێوەی لە ڕێکخراوەکەدا ئاشکرا نەبوو. کەواتە ئەمەیە هۆکارەکە، ئەمەیە فراوان بوون قووڵی ئەو لێدانانەمان بۆ شیدەکاتەوە کە بەر حیزب کەوتووە! کاتێک دوژمن کوێرانە هێرش دەهێنێت، ئەو هێرشە یان شکست دەخوات وە یان سەرکەوتنێکی کەم تۆمار دەکات، گورزەکە بەر "پەڕ" ەکە دەکەوێت، برینەکە سووک دەبێت و بە خێرایی سارێژ دەبێت. بەڵام کاتێک دوژمن هێرش دەبات و چەند پیاوێکی لەبەردەستدایە وەک ڕێ نیشاندەر بەرەو ماڵەکان و کەسەکان و نامێرەکان و شتی تر، ئەوکاتە لێدانەکە دەگاتە سەر ئێسقان و دەبێتە هۆی تێشکان و ئیفلیج بوون ئەگەر وەختییش بێت.

"دەبێت کێ بێت بەرپرس بێت لەم لێدانانەی بەر حیزب کەوتووە، لەم خیانەتانەی بەرامبەر بە حیزب کراوە؟" –ئەمە پرسیاری ئەو بڵاوکراوەیە بوو کە مەجید بە بایەخەوە خەریکی خوێندنەوەی بوو. هەر بڵاوکراوەکە خۆیشی وەڵام دەداتەوە: بەرپرس مەکتەبی سیاسی حیزبە کە لە زیندانا بوون، واتە فەهدو زەکی بەسیم و حسێن شەبیبی.

ئەم ڕستەیەی دوایی مەجیدی ڕاوەشاندو دەمارەکانی گرژ کرد. بەند کردنی شەبیبی لە ١٩٤٦ ەوە، بەند کردنی فەهدو زەکی لە کانونی دووهەمی ١٩٤٧ دوە، مانەوەیان لە بەندیخانەدا هەتا لە سێدارەدانیان لە شوباتی ١٩٤٩ دا، واتە هەتا دوو مانگ بەر لە دەرچوونی ئەم بڵاوکراوەیە بە واژۆی "بەرپرس". لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سێ کەسە بەرپرسی ئەم خیانەتانە بن کە کەسانی تر بەرامبەر بە حیزب ئەنجامیانداوە، بەر پرسی کارەساتێک کەسانی تر بەسەر حیزبیاندا هێناوە.

بۆچی دەبێت ئەوان بەرپرس بن لەم لێدان و خیانەتانە؟ ئەی ئەوان گیانیان بەخت نەکرد لە پێناوی حیزبدا؟ ئەی بۆچی ئەم بەرپرسیارێتیە گەورەیە خراوەتە ئەستۆی ئەوان کە

هێشتا خوێنەکەیان ووشک نەبۆتەوە؟ ئەی ئەم بریندار کردنەی عاتیفەی شیوعیەکان بۆ ئا لەم کاتە سەختەدا؟ نەخێر، ئەی هاوڕێی بەرپرس، سەرکەوتوو نەبوویت لە چارەسەری گرفتەکەدا! تۆ کەوتوویتەتە دژایەتی جەماوەرێکی زۆر لە شیوعیەکان و لایەنگرانیان، کە بە ڕێزەوە دەڕواننە ئەو گیانبەختکردوانە. ئەگەر ڕاوێژی گروپێکت بکردایە لە زانایان لە هۆڵێکی فێنکدا، ئەوکاتە دژەکانت بە ساردی وەڵامیان دەدایتەوە. بەڵام تۆ خۆت بە تەنها ئەم حوکمە قورسە دەردەکەیت بەرامبەر بەو گیانبەختکردووە پاڵەوانانە، ئەوا لۆژیکیە بەرپەرچدانەوەیەکی توندو قورسی بەدوادا بێت.

مەجید دووبارە بڵاوکراوەکەی خوێندەوە، هەر یەکسەر پێنووسێکی گرت بەدەستیەوە هەتا نامەیەک بنووسێت بۆ هاوڕێی بەرپرس، هەتا دژایەتی و ناڕەزایەتی خۆی تۆمار بکات لەسەر بڵاوکراوەکە، وە داوایش بکات ئەو بڵاوکراوەیە بگێڕنەوە، ئەمە هیچ ویژدانێکی تێدا نیە خیانەتی نموونەکانی وەک مالک سەیف ببڕن بەسەر فەهدو هاوڕێکانیدا.

لەم کارەدا شتێکی مەترسیدارتر هەبوو: ئەم بڵاوکراوەیە کە بە واژۆی بەرپرسە، باسی بارودۆخی حیزبیش دەکات نەک هەر باسی بارودۆخی ڕێکخراوێکی حیزبی لە پارێزگایەکی دیاریکراوو ناوچەیەکی دیاریکراودا. ئەمە بڵاوکراوەیەکە لە بەرپرسی ڕێکخراوی پارێزگاکەوە دەرکراوە، بەڵام باسی چەند شتێک دەکات وەک ئەوەی لە سەنتەری سەرکردایەتی حیزبەوە دەرکرابێت. بێگومان دەبێت هاوڕێی بەرپرس ئاگاداری هەندێ ڕووداوی گرتن و شتی تر بێت کە لە ناوەندە سەرکردایەتیەکاندا ڕوویداوە، وە یان لەوانەیە باوەڕی وابێت ئەو کەسانەی لە سەرکردایەتیدا ماون جێی باوەڕ نین یان دانیان پێدا نانرێت وەک سەرکردایەتی، وە ئەو هاوڕێ بەرپرسە خۆی، بۆی هەیە نوێنەری سەرکردایەتیەکی نوێ بێت. بەڵام دەرهێنانی ئەم فیکرەیە بۆ نێو واقیع، یەکەمجار ئەوە دەخوازێت کادیرە حیزبیەکانی تریش ڕازی بن بەمە، ئەمەیش لێکۆڵینەوە دەخوازێت.

وەڵامی هاوڕێی بەرپرس بۆ نامەکەی مەجید سووربوون بوو لەسەر ڕاکەی خۆی بە هێمنی و لەسەرخۆییەکی زۆرەوە هەتا وا لە مەجید بکات لە ڕازی نەبوونەکەی پاشگەزبێتەوە. مەجید هەر سوور بوو لەسەر ڕاکەی خۆی. بۆیە یەکتر بینینێکی ڕاستەوخۆ کرا بە دەستپێشخەریی بەرپرسەکە خۆی، بەڵام ئەو بینینە چارەسەری ئەم مەتەڵەی نەکرد. وە ئیتر بەرپرس پەنای بۆ شێوازێکی "یەکلاکەرەوە" ی تر برد، بە پێی تێڕوانینی ئەو کە لە نامەیەکی حیزبیی ناوخۆییدا ڕایگەیاند، ئەم هاوڕێ دژەی خۆیی دەرکرد لە حیزب و تاوانی تریشی خستەپاڵ، ئەمە لەگەڵ خاڵی ناکۆکیان. وە ئیتر کێشەکە وانیشان درا وەک ئەوەی ناکۆکی نێوان دوو هاوڕێیەو بەس.

دەبێت لە حاڵەتێکی لەم جۆرەدا مەجید چی بکات؟ ئەمە یەکەمین ئەزموونی لەم چەشنەیە سەبارەت بەو، ئەو لاوێکی شیوعی کەم ئەزموونە. دوێنێ وەک هەموو هاوڕێکانی، تەنها بایەخی ئەو بەرگری بوو لە حیزب دژی ئەو دوژمنانەی لە دەرەوە هێرشیان دەهێنایە سەر ڕیزەکانی. ئەمڕۆ ناکۆکیە حیزبیە ناوخۆییەکان هاتوونەتە پێشەوەی ئەو گرفتانەی شیوعیەکانی بەخۆیەوە خەریک کردووە، لە نێویاندا مەجیدو هاوڕێی بەرپرس (مەسعود).

بە پێچەوانەی خووەکانیەوە، لە ئیوارەیەکی زوودا، مەجید لەسەر جێگاکەی ڕاکشا کە لە لبادێک و بەتانیەکی کۆن پێکهاتبوو لە سووچی ژوورێکی بچکۆلەدا. ئەم کێشەیە سەبارەت بەو گرنگیشەو گەورەیشە، بەڵام دەبێت هەر ڕووبەڕووی بوەستێتەوە. دواجار، دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ، ڕای خۆی وەرگرت کە چی بکات: "پەیوەندی بە ناوەندی سەرکردایەتی حیزبەوە لە بەغداو ئاگادار کردنیان لەوەی لێرە ڕوویداوە، وە سووربوون لەسەر ڕەت کردنەوەو لێدان لە بڵاوکراوەکە کە خیانەتی چەند کەسانێکی هیچ و پووچ، دەهێنێت بەسەر فەهدو مەکتەبی سیاسیی زیندانی کراودا، دوای ئەوەیش پەیوەندی کردنی ڕاستەوخۆ بە ژمارەیەک لە کادیرەکانی حیزب لە ڕێکخراوەکەدا بە مەبەستی گۆڕینەوەی ڕاوبۆچوون و ڕێخستنی چالاکیەکان".

هەر بەمجۆرە، ڕێکخراوە شیوعیە حیزبیەکە لەناوخۆیدا دابەش بوو! گروپێک لە شیوعیەکان لایەنگری مەسعود بوون و گروپەکەی تریش لایەنگری مەجید. هەریەکە لە گروپەکان خۆیان بە نوێنەری شەرعیی بزووتنەوەی شیوعی دەزانێت و دژی گروپی دووهەمەو تاوانباری دەکات بە دابەشکاری و هەلپەرستی. هەریەکە لە گروپەکان بەدوای ئەو بیانوانەدا دەگەڕێن کە پاڵپشتی تێڕوانینەکانیان دەکات و پاگەندەکانی بەرەی دووهەم ڕەت دەکاتەوە. لەناو ئەم ناکۆکیە توندەدا ئاسان نەبوو بۆ ئەندامێکی حیزبی کە هۆشیارانە بزانێت کام لایەن دروستەو کامیان هەڵە، وە بەبێ شک هەر ژیان خۆی وەڵام بەم پرسیارە دەداتەوەو ئاشکرای دەکات کێ هەڵەیەو کێ ڕاست. بەڵام بەر لەوەی ژیان وەڵام بەم پرسە بداتەوە، ڕکابەریەکی توندوتیژ لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا ڕوودەدات – کێ ڕێکخراوەکە دەستدەخات، کێ بەشی زۆری ڕێکخراوەکە دەبات؟

مەجید دەستی کرد بە جووڵەو بینینی بەردەوام، ئەمە ئەگەرچی لە لایەن پۆلیسیشەوە ڕاودەنرێت. سروشتیشە کە لایەنی دووهەم چالاکی کەمتر بنوێنێت بۆ پەیوەندی هاوشێوە. یەکەم بینینی مەجید لەگەڵ ئەندامێکی لیژنەی شار بوو، هاوڕێ عەلاء، وە هەر بە خێرایی وەڵامی دایەوەو دژ بە ڕەفتاری مەسعود وەستایەوە، وە سوور بوو لەسەر کار کردن بە حەماسێکی گەورەوە، شان بە شان، لەو ئاراستەیەدا کە نوێنەرایەتی حیزب دەکات.

بۆ مەجید هیچ قورس نەبوو هاوڕێیان خالیدو مەحمودو قادرو ساڵەحیش ڕازی بکات بە هاوبەشی لەو کارەدا دژی تەوژمە گێرەشێوێنەکە، ئەوانەیش کادیری چالاکی ڕێکخراوەکە بوون. لە هەمانکاتدا سەرکەوتوویش بوو -کە ئەمە زۆر گرنگ بوو- لە دروستکردنی پەیوەندیدا لەگەڵ ناوەندی سەرکردایەتی حیزب لە بەغدا، وە لە هەمان ئەو نامەبەرەوە کە نامەکەی گەیاند، وەڵامی پێگەیشتەوە. بەبێ شک ئەو وەڵامە یارمەتی هاوڕێیان دەدات لە پتەو بوونی باوەڕیاندا بەخۆیان و حەماسیشیان زیاد دەکات لە کارەکەیاندا، ئەمە لەکاتێکدا کە لایەنگیریەکی گەرمی ئەوان دەکات و پیرۆزبایی ئەو هەنگاوەیان لێدەکات،

ئەوەیشی دەستنیشان کردووە کە ناوەند خۆی چەندان هەوڵی داوە بۆ پەیوەندی کردن بە مەجیدەوە، بەڵام نەکرا.

گرنگترین شتێک کە لە نامەکەی ناوەندی سەرکردایەتیدا بوو وە مەجیدی دڵخۆش کرد، کاغەزێک بوو ناونیشانێکی تێدا بوو بە جفرە نووسرابوو. نامەبەرەکەی حیزب بەرەو ئەو ناونیشانە دەڕوات بە پۆستی ڕێکخراوی پارێزگاکەوە بۆ ناوەند. دوای وەرگرتنی ئەو جفرانە، مەجید نامەکەی خوێندەوە: "بغداد –علاوي حلة، قرب الأرضروملي، المكوي حسن عوينه". لەوەوبەر ئەم ناوەی نەبیستبوو، بەڵام شتەکە جێی سەرسووڕمان نیە. ڕووداوەکانی ساڵانی دواتریش، زۆر ئەم دوانەی کۆدەکردەوە. لە هەموو بینینێکیشدا، مەجید بێ ئیرادە، وێنەی ئەو پارچە کاغەزە دراوەی دەهاتەوە بەرچاو کە بە جفرە ناونیشانی (المكوي حسن عوينه) ی لەسەر نووسرابوو.

ڕکابەری نهێنی نێوان ئەم دوو گروپە دابەش بووە بەهێزتر دەبوو، هەریەکە دەیەویست زۆرترین ژمارە لە کادیرو ئەندامانی حیزب بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. مەجید بێهودە هەوڵی دەدا ئەندامی لیژنەی قوتابیان، هاوڕێ عەلی ڕابکێشێت، ئەویش هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە بڕیاری بنەبڕی لە هەڵوێستی خۆی دابوو: وەستان لەلایەنی هاوڕێی بەرپرسەوە، مەسعود، ئەمە بەپێچەوانەی ئەندامێکی تری لیژنەکەوە، ساڵەح، کە هەر یەکسەر چووە پاڵ مەجید. ڕاوێژە ناوخۆییەکان زیاد دەبوون و توندتر دەبوونەوەو ڕێکخراوەکەیان بە توندی دەهەژاند، بەڵام ووردە ووردە هەڵوێستەکان پێگەیشتن. وە ئیتر شیوعیەکان هەر تەنها دوو گروپی دژ بەیەک نەبوون و بەس، بەڵکو لە ڕووی پراکتیکیشەوە، گروپی سێهەمیش دەرکەوت. گروپی ئەو کەسانەی تیامابوون لەسەر دابەش بوونی ڕێکخراوەکە، وە بڕیاری دوورکەوتنەوەیان وەرگرت دەربارەی ئەو ناکۆکیە توندە، واتە وازهێنان لە کاری حیزبی و دانیشتن لەسەر گردەکە لە چاوەڕوانی گەیشتنی بارودۆخەکەدا بە جێگایەک.

مەجید بیری لەوە کردەوە کە دەبێت هەڵوێستی فیکری و ڕێکخراوەیی وەربگیرێت بۆ تێشکاندنی ئەو تەژمە نینشقاقیە. ئەمەیشی لەگەڵ چەند هاوڕێیەک باس کرد هەتا بۆچوونەکەی جێگیر بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت وەک یەکەم هەنگاوی پێویست ئەنجام بدرێت:

1 -دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی بە ئامانجی ئاراستەکردنی هاوڕێیانی حیزب بەرەو ئەوەی کە دەبێت بکرێت. بڵاوکراوەکە لەژێر ناونیشانی (ئەرکەکانمان) دا دەرکراو بەدەسخەت کۆپی کراو ڕێگای خۆی گرت بەرەو ڕێکخراوەکان.

2 - دانانی لیژنەیەکی ناوخۆیی بۆ ڕێکخراوەکە لە چاکترین کادیرەکانی. پێشتر، بەر لە دابەش بوون، مەجید بیری لەوە نەکردبۆوە کە لیژنەیەکی ناوخۆیی بۆ ڕێکخراوی پارێزگاکە، بوونی نیە، وە یان ئایا دەبێت بوونی هەبێت یاننا. بەڵام ئێستا، دوای دابەش بوون، بارودۆخەکە گەیاندیە ئەو بیرکردنەوەیە لەم پرسەدا.

تاریکی باڵی بەسەر شاردا کێشا، زۆر لە خەڵکی، دوای ڕۆژێکی تریش لە کار کردن، دەگەیشتنەوە ماڵ یان بەڕێگاوە بوون بەرەو ماڵ. دوو لاوەکە یەکتریان بینی و بەدەم ڕۆیشتنەوە لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا، ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوونیان دەکرد لە پرسە حیزبیە گرنگەکان:

- پێدەچیت هاوڕا بین لەسەر پێویستیی دامەزراندنی لیژنەی ناوخۆ –مەجید ئەمەی بە عەلاء گووت.
- بەڵێ هاوڕاین.
- دەبێت لیژنەکە لە کێ پێکبهێنرێت؟
- نازانم، تۆ خۆت بیرت لە کێ کردۆتەوە؟
- من بیرم لە تۆو خالیدو مەحمودو قادرو خۆم کردۆتەوە، تۆیش هەموویان دەناسیت.

- بەڵێ دەیانناسم و هاوڕایشم لەسەر هەموویان.
- ئەی ڕات بەرامبەر بە هاوڕێ ساڵەح چۆنە؟
- ئەی تۆ خۆت؟
- هاوڕێیەکی باشە، بەلام مناڵکارەو ئەزموونی کەمە.
- وایە، هەر لەبەر ئەوە لە ئێستادا دەست نادات.

بینینی هاوشێوە لە نێوان مەجیدو هاوڕێکانی تردا ڕوویدا، دوای ئەوەیش لیژنەی ناوخۆ پێکهات لە پێنج هاوڕێ. زۆربەی ڕێکخراوە حیزبیەکانیش لە پارێزگاکەدا، لە دەوری ئەو لیژنەیە کۆبووبوونەوە، تەنانەت بەر لەوەی ببێتە لیژنەیش.

ناکۆکیە حیزبیە ناوخۆییەکانی نێوان ئەو دوو گروپە، بە شێوەو شێوازی جیاواز ڕوویدەدا، مەبدەئی و نا مەبدەئی، دروست و هەڵە، داپۆشراوو ئاشکرا. لە ڕێرەوی ئەو ناکۆکیەدا ناوی ژمارەیەک هاوڕێ ئاشکرا دەبوو، بەتایبەت ناوی مەسعودو مەجید، بە شێوەیەک کە خۆشاردنەوەیەکی تەواوی دەویست، وە دەبوایە مەجید لە نێوان ماڵی هاوڕێکانیدا، هەر خەریکی گواستنەوە بوایە، چونکە نەدەکرا هەر لە ماڵیکدا جێگیر بوایە.

ساڵەح،قوتابیە شیوعیە لاوەکە کە بەهۆی دەرچوونی فەرمانی گرتنیەوە وازی لە قوتابخانە هێنابوو، ئەویش ناچاری خەباتی ژێرزەمینی بووبوو، وە لە کاتی بینینێکدا لەگەڵ ڕێکخەرەکەیدا، مەجید، هەردووکیان باسی خۆشاردنەوەیان دەکردو لەسەر ئەوە کۆک بوون کە لە ماڵی لاوێکی شیوعیدا بمێننەوە بە ناوی (شێخ ڕەشید)، ئەوکاتە ئەو کەسێکی حیزبیی ناسراو نەبوو. هاوڕێ شێخ ڕەشید لاوێکی باڵا بەرزی ڕێکوپێکی قۆز بوو. بێکار کەوتبوو، بۆیە لەسەر نووسینی "نوشتەو دوعای ئاینی" دەژیا! باوکی "شێخێکی ڕێبازی قادری" بوو، ئەگەرچی ناودار نەبوو. وە لە خۆشگوزەرانیەکی ڕێژەییدا دەژیا بەبێ ئەوەی کار بکات، ژمارەیەکی زۆر لە جووتیاران دەچوونە ماڵی، زۆربەیان لە دێهاتە دوورەکانەوە بە دیاری و پارەوە دەهاتنە لای، لە چاوی ئەوانەوە ئاینپەروەرێکی پیرۆزە. کوڕی شێخیش هەر

پیرۆز بوو سەبارەت بەو جووتیارانەو خۆیشی سوور بوو لەسەر پاراستنی ئەو پیرۆزیە گەرچی شیوعیش بوو.

دوو لاوە شارراوەکە نەیاندەتوانی تەواوی ڕۆژەکە لەو ماڵەدا بەشێوەیەکی ئاسایی بێن و بچن، ئەوە دەبووە هۆی ئاشکرا بوونیان و ڕووبەڕووی مەترسیی دەکردنەوە. بۆیە لە ژێر باڵی تاریکیەوە دەردەچوون بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکانیان، ڕۆژەکەشیان لە ژوورێکی بچکۆلەی نیوە تاریکدا بەسەر دەبرد. ڕۆژێک یەکێک لە خزمانی خێزانەکە بەم پرسیارەوە دەچێتە لای شێخ ڕەشید:

- ئەرێ دوو پیاو لەو ژوورەی خانوەکەتدان، ئەوانە کێن؟

فزولیەت پاڵنەری ڕاستەقینەی ئەو پرسیارە بوو. وە وا دیار بوو گەورەی ماڵ ئەم فزولیەتەی پێ خۆش نەبوو، بەڵام هەرچۆن بێت دوای کەمێک دەرچەیەک دەدۆزێتەوەو وەڵام دەداتەوە:

- ئەوانە تۆزێ شێتۆکەن، هێناومانن هەتا باوکم چارەسەرێکیان بکات.

ئەو پیاوە فزولیە ئەو وەڵامەی بەس بوو، وە ئیتر شتەکە زۆر ڕوونە لەلای. ئەو باش ئەیزانی دێهاتیە شێتەکان لە شوێنی دوورەوە بەپێ دەهێنران بۆ ئەم ماڵە هەتا شێخ بە بەرەکەتی خۆی و نوێژەکانی و دارعاسا مەزنەکەیەوە کە وەک ئامرازێکی "سەرکەوتوو" بەکاری دەهێنا، ناچاریان بکات دان بنێن بە ناوی ئەو جنۆکەکاندا کە لە شوێنێکی نادیاری جەستەیاندا جێگیر بوون و بوونەتە هۆی شێت بوونیان.

شێخی شیوعی خۆی کە پرسیاری میوانەکەی و وەڵامەکەی خۆیی دەگێڕایەوە، قاقا پێدەکەنی.

ململانێی نهێنی ناوخۆی نێوان دوو گروپە دابەش بووەکە بەردەوام بوو. ئەو گروپەی مەجید سەرکردایەتی دەکرد، هەوڵی تەواوی وەدیهێنانی سەرکەوتنی دەدا لەناو شارو لە پارێزگاکەیشدا، ئەمە بەو پاڵپشتیەی لە سەرکردایەتی حیزبی وەردەگرت لە بەغداوە، ئەمە لەکاتێکا کە گروپی دووهەم، پێگەکەی لاواز دەبوو، بۆیە ناچار بوو هەوڵ بدات بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی و لایەنگر بۆ خۆی لە پارێزگاکەو ڕێکخراوەکانی تریشدا، بەتایبەت لە بەغدا. هاوڕێی "بەرپرس" مەسعود، هەروەک مەجیدی ڕکابەری، ناچار بوو شارراوە بێت، ئەویش وەک ڕکابەرەکەی ئاشکرا نەبوو.

نامە گۆڕینەوەی هەفتانە بەردەوام بوو لە نێوان سەرکردایەتی ڕێکخراوی ناوخۆو ناوەندی سەرکردایەتی لە بەغدا. هەر نامەیەکیش لە بەغداوە دەهات -سەرباری سادەیی ووشەکانی و ئاستە لاوازەکەی- ماتریالێکی چاک بوو کە پاڵی پێوەدەناین و باوەڕی بەهێز دەکردین. کورتەیەکی دیاری کراویشمان دابەش دەکرد بەسەر کادری حیزبی یان تەواوی هاوڕێیاندا بە نامانجی ووریا کردنەوەو پتەو کردنی خۆگریان. بارودۆخی ڕێکخستنی شار پلە بە پلە، بەرەو جێگیر بوونێکی ڕێژەیی دەڕۆیشت. خۆگریی هاوڕێی بەند کراویش، نەجیب، یاریدەدەری سکرتێری ڕابووردووی ڕێکخراوەکە، بایەخێکی نێجگار گەورەی هەبوو لە پاراستنی نهێنی ڕێکخراوەکەو سەلامەتی کادرو ئەندامەکانیدا. ئەو هاوڕێیە کە چەند هەفتەیەک بوو گیرا بوو، گەلێکی لە نهێنی ڕێکخراوەکەو کاروبارەکانی لەلا بوو. پیاوانی پشکنینی تاوانکاری، هەوڵێکی زۆریان دابوو دان بەوانەدا بنێت، بەڵام خۆگر مایەوە، خۆگریەکی پاڵەوانانە.

لە ئێوارەیەکی ڕۆژانی حوزەیراندا کە بەهار دوا هەناسەکانی تێدا دەدا تەنها لە لووتکە بەرزەکانی چیاکاندا نەبێت، مەجیدو عەلاء، وەک ئاسایی، یەکتر دەبینن. ئەمەی دووهەمیان بە دەنگێکی لەسەرخۆ دەستدەکات بە قسە کردن:

- ئەگەر جێگای دانیشتنتم بزانیایە، ئەوا دوێنێ بە خێرایی دەهاتم بۆ لات.

- هۆکارێک هەیە؟ شتێکی گرنگ ڕوویداوە؟
- نامەیەکی حیزبی بەپەلە لە بەغداوە هاتووە بۆ تۆ.
- چی تیایە؟
- ئەمکردۆتەوەو نازانم چی تێدایە، نامەیەکی تایبەتیە بەناوی خۆتەوە. ئەوە نامەکەیە. نامەیەکی بچکۆلەی پێچراوە لە شێوەی ئاغزە جگەرەیەکدا. مەجید بە پەلە کردیەوەو کەوتە خوێندنەوەی لە کۆلانەکەدا لەبەر ڕووناکیەکی کزی گڵۆپە کارەباییەکاندا. ڕاستە، بەناوە حیزبیە تازەکەی ئەوەوە هاتووە، بەڵام بە خەتێک نووسراوە کە ئەو نایناسێتەوە. بەڵام ناوەڕۆکی نامەکە هەتا بڵێی مەترسیدارە، باس لەوە دەکات کە هاوڕێی بەرپرسی یەکەم لە ناوەندی سەرکردایەتیدا، کەوتۆتە دەست دوژمن.

مەجید لەسەر ئەو ڕستەیە وەستاو وەک هەر کەسێکی عاتیفیی تر کە هەواڵێکی کوتوپڕی چاوەڕوان نەکراوی زۆر ئازاربەخشی پێدەگات، هەستی تەزوویەکی تێجگار بەهێزی کرد کە بە هەموو دەمارەکانی جەستەیدا گوزەری کرد. ئای لەم کێشە مەترسیدارە!

نامەکە دوای ئەو هەواڵە مەترسیدارە، ڕاستەوخۆ ئەوەیش یاد دەخاتەوە کە مەجید داوا کراوە بۆ سەفەرێکی بە دەستوبرد بەرەو پایتەخت هەتا لەوێ وەک کادرێکی شیوعی پێشکەوتوو، بە ڕۆڵی خۆی هەستێت. ئەوە ئامۆژگاریی ئەو هاوڕێیە بووە کە لە ناوەندی سەرکردایەتیدا بووەو گیراوە.

- گوێ بگرە هاوڕێ عەلاء با نامەکەت بۆ بخوێنمەوە! مەجید دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە. کێیە ئەو کەسەی ئەم نامەیەی هێناوەو تا چ ئاستێک بە باوەڕپێکراو دادەنرێت؟
- قوتابیەکی پەیمانگا هێناویەتی داویانەتە دەستی و ئەویش ڕاستەوخۆ هێناویتی بۆ من.

- ئەی تۆ ئەو دەناسیت و باوەڕت پێیەتی؟
- زۆر باش دەیناسم و بە تەواویش باوەڕم پێیەتی.
- ئەی دەکرێت باوەڕ بەو هاوڕییەیش بکرێت کە نامەکەی لە بەغداوە هێناوە بۆ ئێرە؟ ئایا تا ئێستایش هەر لێرەیە؟
- من نایناسم، بەڵام لەو هاوڕێیەم پرسی، قوتابی پەیمانگاکە لێرە، ئەو دەیناسێت و باشیش هەڵیدەسەنگێنێت.
- کەواتە دەبێت ڕاستەوخۆ ببینین تا بەشێوەیەکی ڕوونتر تێبگەین، دەبێت هەوڵ بدەین لە نزیکەوە بیناسین. دەبێت دڵنیا بین لەوەی تەڵەی بۆ دانەناوین.
- فیکرەیەکی دروستە.

ئامادەکاری کرا بە مەبەستی بینینێکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو پەیامبەرە حیزبیە بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەژێر باڵەکانی تاریکیەوە. مەجید خۆی جێگای بینینی دیاری کردو لەگەڵ عەلاء ڕێکەوت پەیامبەرەکە ببات بۆ شوێنەکە بە شێوەیەک کە دووربێت لە مەترسی و چاودێری. هەموو شتێک بەباشی ڕۆیشت، وەک ئەوەی پلان کرا بوو، بینینەکە ڕوویدا لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا. پەیامبەرەکە شتەکەی بە شێوەیەکی واقیعی سادە خستەڕوو، ئەمە لەکاتێکا مەجید زۆر بە بایەخەوە هەوڵی تێگەیشتنی دەدا لە هەموو ووشەو هەموو پیتێکیش، وە تەنانەت چاودێری نەبەرەی دەنگی قسەبێژەکەو چاوەکانی و ڕووخساریشی دەکرد. بینینەکە زیاتر لە نیو کاژێری زیاتر نەخایاند. مەجید گەڕایەوە بۆ پەناگاکەی، وە دڵنیا بوو ئەوەی پەیامبەرەکە گێڕایەوە واقیعیەو هیچ تەڵەیەکیش لەناوانا نیە.

کەواتە لەسەریەتی بە پەلە ڕووبکاتە بەغدا.

## بەشی دووهەم

# ڕۆژە سەختەکان

ڕۆژێ لە ڕۆژان مەجید لە شارە بچکۆلەکەیدا، بەبیریدا تێنەپەڕی بوو کە بانگ دەکرێت بۆ پایتەخت و ئەرکێکی حیزبیی نوێ و پڕ مەترسیی پێدەسپێردرێت. ئەوا ئەو بانگ کردنە ڕوویدا، ئەمە هەروەک چۆن زۆر شت ڕوودەدات بەبێ ئەوەی کەس چاوەڕوانی بێت.

ئەو لاوە بەبێ دوودڵی بانگهێشەکەی هاوڕێکانی قبوڵ کرد بۆ بەغدا، ئەو هاوڕێیانەی کە نە دەیناسین و نە لەوەوبەر یەکێکیانی بینی بوو، وە هیچیشی داوا نەکرد ئەوە نەبێت کە ماوەیەکی کورتی بدەنێ، تەنها سێ ڕۆژ، بۆ بەشداریی لە کاروباری ڕێکخراوەکەدا کە خۆی سکرتێری بوو، ئەمە لەگەڵ ڕێکخستن و پەیوەندی و نامەکانی داهاتوو لەگەڵ هاوڕێیانی لیژنە سەرکردایەتیەکەی ئەو ڕێکخراوەدا.

مەجید بە پێ کەوتەڕێ، شار جێدەهێڵێت، هاوڕێیەکی تری ئەندامانی لیژنەی لەگەڵدایە، لاوێکی سپیی باریکەلەو درێژ، پێیان دەگووت (عەلی بەرزنجی). دوو لاوەکە لە شەقامێکی فەرعیەوە، دوور لەو شەقامەی ئۆتۆمۆبێلی پێدا دەڕوات، هەنگاوەکانیان خێراتر کرد. بەردەوامیش لەسەر شتێک قسە دەکەن: کارە حیزبیەکانی ئایندە. دوای تێپەڕبوونی چەند کیلۆمەترێک، هەردوو هاوڕێ ئەملاولای یەکیان ماچ کردو عەلی لە نیوەی شارەوە، بەڕێی خۆیدا گەڕایەوە، مەجیدیش ڕووی کردە شەقامێک هەتا شوێنێک دابین بکات بۆ خۆی لە یەکێک لەو ئۆتۆمۆبێلانەدا کە بەرەو بەغدا دەچوون. نامرازێکی زۆر گونجاوی هاتووچۆی نەدۆزیەوە، بەڵکو لۆریەکی بارهەڵگری گەورەی دەستکەوت کە فەردە گەنمی پێ بوو، بەدەم ئیشارەتەکەی مەجیدەوەو لە پێناوی چەند درهەمێکدا وەستا، ئەمە زۆر ڕوودەدات لەناو شۆفێری ئەو لۆریانەدا.

- برام، ئەگەر لەسەر ئەو فەردانەوە سواربم، لەگەڵ خۆت دەمبەیت؟
- بۆ کوێ دەچیت؟
- دەمەوێ بگەمە بەغدا، بەدرێژاریی ڕێگایش پاسەوانی بارەکەت دەبم.
- من دەتگەیەنمە بەغدا، تۆیش ڕوبعەدینارێکم دەدەیتێ. باشە؟
- ئەو پارەیە زۆر نیە براکەم؟ وامدەزانی لە سێ درهەم زیاترم لێ داوا ناکەیت.
- سەرکەوە، جیاوازیەکە لە نێوانماندا دابەش دەکەین، با چوار درهەم بێت.

لۆریەکە لە ژێر هەتاوی سووتێنەری حوزەیراندا بە هێواشی دەڕوات. مەجید لەسەر بارەکە دانیشتووەو لە خەیاڵی جیهانێکی تازەدا مەلە دەکات، زۆر فراوانتر لەو جیهانەی بەر لە هەفتەیەک تیایا دەژیا. وە هەر خەریکی گواستنەوەی ئایدیاکانی بوو لە نێوان پایتەخت، ئەو شارە گەورەیەی بۆی دەچێت تا ببێتە دانیشتووی، وە شارەکەی خۆیدا کە هەر ئێستا جێیهێشت. لە چەند شوێنێک شۆفێری لۆریەکە لەبەردەم چایخانەیەکدا دەوەستا بۆ حەوانەوەی خۆی و لۆریەکەی کە موڵکی کەسێکی دەوڵەمەند بوو. مەجید حەزی لەم وەستانانە نەبوو، بەڵام ناتوانێت هیچ بڵێت.

لە سەرەتای شەودا ئۆتۆمۆبێلەکە خۆی کرد بە پایتەختداو لە نزیک بازاڕی شۆرجەوە وەستا. مەجید بەپێ لە ڕاڕەوێکەوە ڕووی کردە شارع ڕەشید (شەقامی ڕەشید). ئەمە سێهەمجارە دێتە پایتەخت. یەکەمجار، بەر لە چوار ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ باوکی و چەند جووتیارێکی خزمیدا کە بۆ گەڕان هاتبوون بەدوای لاشەی گەنجێکی دێهاتیدا بە ناوی تاهیر کە لە نزیک سامەڕا لە ڕووباری دیجلەدا خنکا بوو بەهۆی ڕاونانیەوە لە پۆلیسەوە؛ لەگەڵ چەند جووتیارێکی تردا کە پێکەوە چوونەتە بەغدا بە گوێدرێژە بارهەڵگرەکانیانەوەو تووتنیان بردووە بۆ فرۆشتن لە دێی (تەکیە) وە، بەپێ سەدان کیلۆمەتریان بڕیوە هەتا کاڵاکەیان بە نرخێکی باش بفرۆشن. باوکی تاهیر، ئەو جووتیارە دەست کورتە بە تەمەنە، چاوەڕێ بوو کوڕەکەی بە گیرفانی پڕەوە بگەڕێتەوە. دواتریش، کاتێک هەواڵی ئەو کارەساتەی پێدەدەن، هەر تەنها بەوە ڕازی بوو کە لاشەی کوڕەکەی

بدۆزێتەوە، تەنها لاشەکەی هەتا لە گۆڕستانی گوندەکەیان بینێژێت. بەڵام هەموو هەوڵێک بۆ دۆزینەوەی لاشەکە بە فیڕۆ ڕۆیشت.

جاری دووهەم، مەجید لەگەڵ خوشکێکی نەخۆشیدا هاتۆتە بەغدا، ئەمەیش بۆ گەڕان بەدوای چارەسەرو دەرماندا لە عیادە پزیشکیە تایبەتەکاندا. ئەو سەفەرە "دیدەنی و بازرگانی – زيارة وتجارة" بوو پێکەوە. ئەو لاوە کە قوتابی ئێواران بوو، ئەوەی بۆ ڕەخسا لە تەنیشت کۆنگرەکانی قوتابیانەوە کە بەناوی "کۆنگرەی سباع"[3] دەناسرا، ئامادە بێت، بۆ یەکەمجاریش، شاعیری یەکەمی عێراق، جەواهیری، ببینێت کە لە نێوەندی هەزاران هوتافەوە، یەکێک لە شیعرە نایابەکانی دەخوێندەوە، ڕاپەڕینی ئەمری کانونی ١٩٤٨ ئیلهامبەخشی بوو ئەو شیعرە بوو: ڕۆژی لاوان سڵاو! بە تۆو بە خەبات کردن ساڵانێک لە مێژوو دەنووسرێتەوە –هەزاران قوڕگ بە هوتافی پڕ حەماسەوە، شاعیرە سووتێنەرەکەیان دەوەستاند. ئەویش بەدەوری خۆی، بە بەیتە نایابەکانی، حەماسی ئەو هەزاران کەسەی بەرز دەکردەوە.

بەڵام ئەم دوایینجارە، سروشتی فەرمانەکە گەلێ جیاوازە لە هێنانی مەجیددا بۆ ئێرە، ئەو واهاتووە لێرە بمێنێتەوەو کار بکات، لە پایتەخت. ئەم چرکەساتانەی ئێستا، سەرەتای سەردەمێکی نوێیە لە ژیانیدا. وە ڕەنگە ژیانێکی قورس و پڕ لە کێشە بێت، بەڵام ئەوە بایەخی نیە لەلای ئەم لاوە. ئەو شیوعیەو شیوعییش لەوە ناترسێت.

مەجید کەوتە گەڕان بەدوای ئۆتێلێکی پڕ لە خەڵکدا لە ئۆتێلە هەرزانەکان هەتا شەوی تیا ڕۆژ بکاتەوە، ئەوەیشی لە کۆڵانێکدا دۆزیەوە بە ناوێکی قەبەوە "فندق الزعماء"، بەڵام ئەوانەی تیایا بوون، هەر هەموویان لە ڕەنجدەران بوون، لەو کەسانەی کە لە ئوتێلی پلە سێ دەگەڕێن. مەجید لە سەربانی ئۆتێلەکە جێگایەکی دەستکەوت بۆ خەو. هەر خێرا خەوی لێکەوت. بەیانییش زوو، بە دەنگی خاوەن ئوتێل خەبەری بۆوە، بانگی دەکرد:

---

[3]. اتحاد الطلبة العام في جمهورية العراق (یەکێتی گشتیی قوتابیانی عێراق) لە ١٤ ئەپریل ١٩٤٨ دادەمەزرێنرێت لە کۆنگرەیەکی ئاشکرادا لە گۆڕەپانی سباع لە بەغدا (تێبینی وەرگێڕ).

- الصلاة خير من النوم .. هەستن بۆ نوێژەكانتان.

مەجید ناونیشانی هاورێكانی نەدەزانی لە بەغدا هەتا پەیوەندیەكیان پێوە بكات، بەڵكو وا هاتووە لە پاش نیوەڕی ڕۆژێكدا لە ڕۆژەكانی حوزەیرانی ١٩٤٩ دا، لە شارع رەشید یەكێک ببینێت. لە چاوەڕوانی كاتەكەدا وەک ئەوە وابوو لەسەر پشكۆ دانیشتبێت، چووە ئەوێ و ماوەیەكی درێژ چاوەڕێی كرد بەبێ ئەوەی هاوڕێكەی ببینێت، هەمان ئەو هاوڕێیەی كە بەر لە چوار ڕۆژ لەمەوبەر لە شارەكەی خۆی بینی بووی و ئەم كاتەیان دیاری كردبوو. ئەمە چ كێشەیەكە! بۆچی نەهات؟ تۆ بڵێی مەجید هەڵەی كردبێت لە شوێنەكەدا؟ نەخێر، هەرگیز. ئەی بڵێی ئەو هاوڕێیەی تر كەوتبێتە دەست پۆلیس؟ بەڵێ، بێگومان بۆی هەیە.

هیچ ڕێگایەكی تر نیە بۆ پەیوەندی كردن بە هاوڕێیانەوە. وە هیچ چارەیەک نیە چاوەڕوانی نەبێت هەتا ڕۆژی ئایندە كە كاتێكی دیاریكراوی ترە لە نێوانیاندا. ڕۆژەكە ئەوەندە هێواش دەڕوات هەروەک ئەوەی زەوی وەستابێت لە سووڕانەوە بە دەوری خۆیدا. ئەوەیشی دڵەڕاوكێی زۆری بۆ مەجید دروست كردووە بیر كردنەوەیە، تەنها بیركردنەوە لەوەی كە سبەینێ كاتەكە بێت و هیچ پەیوەندیەكی تێدا ڕوونەدات. ئایا مەجید ناچار دەبێت بگەڕێتەوە بۆ شارەكەی خۆی دوای شكستی لە پەیوەندی كردندا بە هاوڕێكانیەوە؟

ئەو ڕۆژە درێژە ناخۆشەیش بڕایەوە، شەوێكی تریش داهات، مەجید گەڕایەوە بۆ سەر پێخەفەكەی لەسەر سەربانی ئوتێل "زعماء". ڕاكشا بۆ مەلە كردن لە دونیای فراوانی خەیاڵدا هەتا ئەوە لێبداتەوە كە ئەو ڕۆژەو ڕۆژەكانی تر ڕوویاندابوو. كاتێكیش لە نیوەشەوێكی درەنگدا، خۆیدا بەدەست خەوەوە، پایتەختیش بە خەوێكی هێمن دادەپۆشرا.

ڕۆژی دواتر سەركەوتوو بوو لە بینینی هاوڕێ جەلالدا. دڵەڕاوكێكەی بوو بە خۆشیەک هەروەک خۆشی ئەو منداڵەی ئەو دیاریەیان بۆ هێنابێت كە حەزی لێیەتی. لەو بینینەدا چارەسەری كێشەیەكی مەترسیداری كرد كە هیچ ڕێگایەكی تر نەبوو بۆ چارەسەری.

- هاورێ ئەوە بۆچی دوێنێ نەهاتیت؟
- کاتەکەمان دوێنێ نەبوو، بەڵکو ئەمڕۆیە.
- وا بزانم ئەم کاتەی ئەمڕۆمان بە ڕێسێرڤ دانا بوو، ئەبوایە دوێنێ یەکتریمان ببینیایە.
- ئەوەم بیر نیە. هەرچۆن بێت ئێستا یەکترمان بینی.

جەلال قوتابی بوو لە پەیمانگایەکدا، ئەزموونی زۆری بەسەردا تێنەپەڕیوەو لە خەباتدا قاڵ نەبووە. بەڵام یەکێکە لەو هاورێ کەمانەی لە پایتەخت لە دەستی دوژمن ڕزگاریان بووەو بەردەوام بوون لە خەبات لەم ڕۆژە سەختانەی بەسەر حیزبدا تێپەڕیوە لە ساڵەکانی ١٩٤٨-١٩٤٩ دا، بەڵام لە هەمانکاتدا لەو کەسانە بوو کە ناودەبران بە "خەباتگێڕە وەرزیەکان".

مەجید و جەلال لە کۆڵانێکی بەر تەسکەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە خانوویەک لەسەر تەرزی بەغدایی دوو نهۆمی لە کۆتایی کۆڵانێکی داخراودا لە گەڕەکی (حمام المالح). لەبەردەم دەرگای ماڵەکەدا پیاوێکی باڵا کورتی گۆشتن وەستابوو، وورگی وەک وورگی ژنێکی سک پڕ بوو لە مانگی نۆهەمیدا. خۆی بە لای چەپی عارەبانەکەیدا چەماندبۆوە، بە دەوری خۆیدا بۆنی کوبەو بەهاراتی بڵاوکردبۆوە؛ بە جۆرێک کە هەر برسیەک بەوێدا تێبپەڕیایە ئیشتیهای ئەکرایەوە. ئەو عارەبانەیە "ڕێستۆرانتێکی گەڕۆک" بوو کە ژمارەیەکی زۆر قاپ و کەوچکیشی پێبوو، ئیتر ئەمە هەموو سەرمایەکەی بوو. مستەفا ئەو فرۆشیاری کوبەیە بوو کە هەموو دانیشتوانی گەڕەک دەیانناسی، دەنگیشی دەناسنەوە تەنانەت بەبێ ئەوەی دەموچاوی ببینن.

مستەفا وەڵامی سڵاوی دوو لاوەکەی دایەوە بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بێت هیچی لێ بکڕن. دوای تێپەڕبوون بەلای خانوەکەدا، جەلال بۆ هاورێکەی ڕوون کردەوە کە ئەو فرۆشیاری کوبەیە لە یەکێک لەو هەشت ژوورەی ئەو خانووە دوو نهۆمیەدا دەژی. ئەو وەک بریکاری

خاوەن موڵکەکەیە لە کۆ کردنەوەی کرێی مانگانەی خانوەکەدا لە کرێچیەکان، زۆربەشیان لە حیزبدان.

ئەو دوو هاوڕێیە چوونە ژوورێک لە ژوورەکانی نهۆمی دووهەم، لەوێ دوو گەنجی باڵا کورت چاوەڕێیان بوون. مەجید زۆر گەرم پێشوازی کرا. هەڵسوکەوتی هەمووشیان بەرامبەر بە یەکتر وەک ئەوە وابوو کە ئەمانە برادەری کۆنی یەکترین، گەرچی ئەمە یەکەمین بینینە. وە هەر خێرا یەکێک لەو لاوانەی لە ژوورەکەدا بوون، خۆی دەرخست کە ئەویش خەڵکی ئەو شاریە مەجیدی لێوە هاتووە. ئەمە ئەنوەرە، لاوە قژ زەردەکەی دانیشتووی بەغدایە وەک خوێندکاری کۆلیژ. هەڵسوکەوتی ڕەنگدانەوەی چاکە و ساویلکەیی بوو پێکەوە، ڕەنگدانەوەی ئەوە بوو کە شیوعیەکی سادەو سەربازێکی باشە، بەڵام سیفەتی سەرکردەی پێوە دیار نیە.

بەڵام گەنجەکەی تر (هاشم) پێوەی دیار بوو خاوەن ئەزموونەو ڕۆشنبیریەکی فراوانتری هەیە لە هاوڕێکانی، جەلال و ئەنوەر، لەسەرخۆ ترو بە ئەدەب تریشە، بەڵام لە هەموان کەمتر سادەیی پێوەدیارە. مجامەلەکانیشی جۆرێک لە زۆرلەخۆکردنی تێدایە؛ چاوەکانی گەمژەییەکی پێوە دیارە، خاووخلیچ، قسەکردنی خاو، زەحمەت بوو بتوانێت خێرا بێت لە هیچ شتێکدا، تەنانەت ئەگەر ئارودۆخەکەیش پەلەکردن بخوازێت.

لە جەوێکی خۆش و پڕ لە نوکتەدا؛ هەر چوار هاوڕێکە نانی نیوەڕۆیان خوارد، بە جۆرێک حەسودیت پێدەبردن، خواردنەکەیش سەموونێک و ماستاوێک و چەند خەیارێک بوو. "مێز" ی نان خواردنەکەیش ڕۆژنامەیەکی کۆن بوو لە سەر زەوی ڕاخرابوو، هەر چواریان دەوریان دابوو. شتومەکی ژوورەکە پێکهاتبوو لە دۆشەکێک کە لە کۆنی و شلەمەنی ڕژان پیایا، خورابوو، بەتانیەکی دڕاوو پینەکراو لەگەڵ سەرینێکی پەڕ کە ڕەنگە لە نەوەکانی ڕابووردووەوە مابێتەوە، مێزێکی تەختەی بچکۆلەی لەقولۆق و تاکە کورسیەک و شتێکیش کە ناویان نابوو "دۆڵاب". لە سووچێکی ژوورەکەیشدا پرێمزێکی نەوتینە کە ڕۆژانێک لە

بازاڕی هەڕاجدا کڕدراوە، وە هەر بەردەوام بوو لە بینینی ڕۆڵی خۆیدا بۆ ناو گەرم کردن و چا کوڵان، ژوورەکەیشی پڕ دەکرد لە دەنگەدەنگ و گەرمی هەرکات بخرایەتە کارو کتریەکی چای بنرایەتە سەر. شەربەیەکی شێرامیکی ناویشی تێدا بوو لە دەستکردی خۆماڵی، ئەویش "سەلاجەی" ژوورەکە بوو.

دوای نان خواردن، زۆر خێرا چا تێکرا. لەمەیشدا ئینکاری نازایی پەرەمێزەکە ناکرێت. دوای چا خواردنەوە، ڕاوێژی سیاسی گەرم بوو کە لە خوولەکەکانی یەکەمی یەکتربینینی ئەو چوارەدا، پچڕپچڕو بێ بەرنامە دەستی پێکردبوو. تەنها سیاسەت سەنتەری قسەوباسە لەم کۆمەڵگا بچووکەی دانیشتووی ئەو ژوورە بچووکەن. سیاسەت ئەو بابەتە بوو کە بە خێرایی دەگەڕانەوە سەری هەرکات لە چەند چرکەساتێک یان چەند خوولەکێکدا بە هۆکارێک لێی غافڵ بوونایە. مەجید گووتی:

- هاوڕێیان، کاتی ئەوەیە باسێک لە بارودۆخی حیزب بکەین بەشێوەیەکی ڕێکوپێک تر.

لێرەدا دەوری سەرەکی دەوری هاشم بوو کە هەتا گەیشتنی مەجید، بەرپرسی یەکەم بوو. ئەو ڕاپۆرتێکی ڕاگەیاند بە دەم، ئەو زانیاریانەی خستەڕوو کە لەلای کۆبووبوونەوە. دەردەکەوت کە خۆی ئامادە نەکردبوو بۆ قسە بە شێوەیەکی گونجاو، ئایدیاکانی و بابەتەکانی زنجیرەیەکیان نەبوو، بەڵکو نیوە خۆبەخۆیەک بوون. بەڵام هەرچۆن بێت سەرکەوتوو بوو لە پێشکەش کردنی وێنەیەکی واقیعی تا ئاستێکی باش دەربارەی ئەوەی بەسەر ڕێکخراوە شیوعیەکان هاتووە، بەتایبەت لە پایتەخت. ئەو ئامۆژگاریەیشی یاد خستەوە کە مەحمود بەر لە گرتنی گووتبووی. باشترینی ئەو "ئامۆژگاریە" یش داوای بەردەوام بوون بووە لەکارداو دەستپێشخەری بۆ کۆکردنەوەی ئەو کادرو ڕێکخراوە حیزبیانەی مابوون، ئیتر لێدانی دوژمنە چینایەتیەکەمان هەرچۆن بێت، ئەگەر عەمر ڕووخا پێویستە زەید بخەنە جێگای، ئەگەر فلان لیژنە تێکشکێنرا، لەسەر هاوڕێیانی تری

حیزبە دەستپێشخەری پێکهێنانی لیژنەیەکی نوێ بکەن. نابێت هەرگیز شیوعیەکان خۆیان ڕادەستی بێ هیوایی بکەن.

هەریەکە لە ئەنوەرو جەلالیش بەشداریی قسەوباسیان کرد، وە کەمێکیش زانیاریان خستەسەر ئەوەی هاوڕێکەیان هاشم، بەدرێژیی یادی خستەوە.

مەجید بە بایەخ و دوودڵی و سەرسووڕمانەوە گوێی بۆ هاوڕێکانی گرتبوو. هەموو گیانی بووبوو بە گوێچکەیەک بۆ بیستنی ئەوەی دەگووترا ، ئەمە یەکەمجار بوو هەندێکیشان ببیستێت، کاروبارێکی مەترسیدار کە ژیانی خۆیی لە پێناودا تەرخان کردووە. ڕاستە، بەر لە هاتنی بۆ بەغدا، هەندێ هەواڵ و قسەوباسی بیستبوو دەربارەی ئەوەی بەسەر حیزب هاتبوو، ئیتر لە نێوان درۆو ڕاستیدا. بەڵام هەندێکی تریان کە لەم ژوورە بچووکەدا یاد خرانەوە لە گەڕەکی "حمام المالح"، شتێکی کتوپڕ بوو سەبارەت بەو، چونکە لەوەوبەر بەبیریدا نەهاتووە ئەم هەموو شتە لە ژیانی ناوخۆیی حیزبدا ڕوویدا بێت، وە دوژمنی چینایەتی توانیبێتی لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا، ئەوەندە دەستی لە حیزب وەشاندبێت.

- بەڵێ، ناوەندی سەرکردایەتی حیزب لە ماوەی هەشت مانگدا، پێنج جار بەر لێدان کەوتووە، واتە بە ڕێژەی هەر چەند هەفتەیەک جارێک! ئەمانە چ میحنەتێکی گەورەن تووشی حیزب هاتوون. لێدانەکانی دوژمنە چینایەتیەکەمان، جار لە دوای جار، بەر سەری سەرکردایەتی کەوتووە.

ئای لەم ڕۆژە سەختانە! تیرۆری ڕەشی پۆلیسی، گرتنی فراوان کە هەزارانی گرتۆتەوە، چالاکیەکی گەرمی پیاوانی پشکنینی تاوانکاری، شکەنجەی بەردەوام لە ژێرزەمینەکانی بەهجەت عەتیەو نائل عیساو هاوشێوەکانیان لە مخابەراتی بریتانی، خیانەتکاریی ئەو کەسانەی توانایان لەدەستداوە، ئەو ترسنۆکانەی پەیمانەکەیان نەبردۆتەسەر، ئەو

ترسنۆکانەی لەبەردەم جەللادەکاندا، بەسەرشۆڕی بەچۆکا هاتوون و شەرەف و ویژدان و هەموو ئەو شتانەیان فرۆشتووە کە لەلای مرۆڤ پیرۆزن.

دیوارەکانی زیندان چواردەوری هەزاران هاوڕێیان گرتووە، گرتووخانەکانی پۆلیسیش پڕ بوون لە هەزاران. نامێرەکانی داپلۆسینیش لە هەموو شوێنێکدا دەگەڕان بۆ خەباتگێڕان و ناردنیان بۆ زیندانەکان. شەوو ڕۆژ ئاشەکەی دادگای عورفیی عەسکەریی لەگەڕدا بوو بۆ ڕەوانە کردنی پۆل پۆل لە تێکۆشەران بەرەو بەندیخانەکانی کوت و نوگرە سەلمان و مەنفاکانی (بەدرە) و (شثاثة) و (عانە) و هەروەها بەرەو پەتی سێدارەیش.

- عەگال بەسەرو چاکەت لەبەر حەوت ساڵ، ئەوانی تر چوار ساڵ.

ئەعسانی بەمجۆرە بوو، ئەو لەو ڕۆژگارەدا، سەرۆکی یەکێک بوو لە ئەنجوومە عورفیە سەربازیەکان و حوکمی دژی خەباتگێڕە شیوعیەکان دەردەکرد.

بارودۆخی دەرەوەی زیندان و گیراوەکانیش باش نەبوو. مەعنەویەتی زۆر کەس لاواز بووبوو، ژمارەیەکی زۆریش لە گۆڕەپانی خەبات دەکشانە دواوە، لەو کەسانەی دوابەدوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینی کانون، لە ڕۆژانی هەڵچوونی شۆڕشگێریدا، لە ڕیزەکانی پێشەوەی خۆپیشاندانە میللیکانەوە دەڕۆیشتن و شەقام و گۆڕەپانەکانیان پڕ دەکرد لە هوتافات.

حیزبی شیوعی بریندار بوو، خوێنی لێدەچۆڕا، دوژمنیش بەردەوام لە تیرباران کردنیدا بوو. ڕێکخراوەکانی ئێجگار بچووک بووبوونەوەو چووبوونەوە یەک، بە جۆرێک کە مەجید هەرگیز بیری بۆ ئەوە نەچوو بوو. ئامانجی یەکەمیش لەم هەڵمەتی تێرۆرو سەرکوتکاریەی هێزی کۆنەپەرستی پێچەوانە ڕێکیخستبوو، تۆڵە سەندنەوەی ڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨ بوو.

هەڵمەتی کۆنەپەرستان دژی هەموو حیزب و هێزە نیشتمانیەکان بوو، ئەو میحنەتەی حیزبی شیوعیش کاریگەریەکی دیاری لەسەر تەواوی بزووتنەوەی شۆڕشگێری جێهێشتبوو. لە پراکتیزە کردندا دەرکەوتبوو کە حیزبی شیوعی گیانی بزووتنەوەی شۆڕشگێری و سەرە

ڕمەکەی بوو. ئێستا ئەو سەرە، برینێکی گەورەی پێوەیەو جەستەی حیزبی وەستاندووە. بزووتنەوەی شۆڕشگێری لە داکشانێکی ڕاستەقینەدایەو هەڵمەتی تێرۆریستی گەیشتۆتە لووتکە. "هاوڕێیانی هاوڕێگا" هەڵاتوون، ئەوانەیشی حەزیان لە "خەباتی وەرزیە" وەک ئاسکێکی ترسێنراو، ئەو شەقام و گۆڕەپانانەیان چۆل کردووە کە بەر لە ساڵێک پڕیان دەکردن لە هوتافاتی بەرز.

باڵوێزی بریتانی و وصی[4] سەر عەرشی عێراق و بریکارەکانی کۆلۆنیالیزم، نوری سەعید، پێکی سەرکەوتنیان دەخواردەوە، دەرەبەگەکان و کۆنەپرستان هەموویان پیرۆزباییان پێشکەش دەکرد بەو دەستانەی "دروستکاری" ئەم سەرکەوتنە بوون. بۆچی نا، ئەوان بەمە ڕزگاریان بوو لەو مۆتەکەیەی کە خەریک بوو دەیخنکاندن. ئەوان لە جەژنی سەرکەوتندا دەژیان بەسەر بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی عێراقدا، جەژنی دەرچوونیان لە مەترسی کانونی ١٩٤٨. میللەتیش دووجار لە کشانەوەدا بوو. زۆر کەس وایاندەزانی حوکمەکەیان ئەوەندە پتەوە ئیتر هەرگیز ناجووڵێنرێت، چونکە "ڕووخێنەران" بە گورزێکی گەورە ڕاونراون و چیتر ناتوانن بە کارێکی تر هەستن، لای کەم هەتا ساڵانێکی تر.

ستوونی ڕۆژنامەکان بە گووتەی بەکرێگیراوو جەللادەکان پڕ دەکرا لەو هەڵەوەڕیانەی دەربارەی سەرکەوتنیان بوو لە "پاکتاو کردنی گێرەشێوێنەکان" داو بیانووە گەشبینەکانیان دەربارەی "ئاسایی بوونەوە" چاوەڕوانکراوەکەیان، وە تەنانەت عەلی حیجازی، بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی ئەوکاتە کە بەکرێگیراوێک بوو کەمتر گەش بینی پێوە دیاربوو، بەلایەوە قورس نەبوو بڵێت عێراق هەتا سێ ساڵی تریش " چالاکی شیوعیانە" بەخۆیەوە نابینێت.

---

[4]. دوای مردنی (مەلیک غازیی یەکەم) لە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێلدا، لە ساڵی ١٩٣٩ هەتا ١٩٥٣، عبد الاله ڕادەسپێردرێت (وصی) بۆ سەر تەختی عەرشی عێراقی. ئەمەیش بەو هۆیەوە کە مەلیک غازیی دووهەم هێشتا منداڵ بووە، بۆیە خاڵی کە یەکێک بووە لە میرەکان، ڕادەسپێردرێت بۆ جێگای پادشا هەتا ئەو تەمەنی دەگاتە ١٦ ساڵ. لە بەرەبەیانی ١٤ ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ دا، لە هێرشدا بۆ سەر کۆشکی پادشایەتی، خۆی و هەموو خێزانەکەی دەکوژرێن بە مەلیک غازیشەوە.

حیزب و دەستە برجوازیەکانیش دابەش بووبوون بە لایەنگرانی سەرکوت کردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێری و دژەکانیدا. ئەوانەیشی لایەنگری داپڵۆسین بوون، پێویست نەبوو چالاکیە حیزبیە-سیاسیەکانیان ڕابگرن. جا بۆ چالاکی ڕابگرن؟ ئەی هەر ئەوان نەبوون پەنایان برد بۆ ڕێکخراوەکانی دەستەوتاقمەکانی دوژمن و چەقۆکێشیش دژی تێکۆشەرە شیوعیەکان لە کاتی ڕاپەڕینە شۆڕشگیریەکەی ساڵی ١٩٤٨ دا بە ئامانجی لێدان لە بزووتنەوەی شۆڕشگیری؟ بەڵام ئەوانەی "دژ" بە سەرکوتکاری بوون، وایان پێ باش بوو "دوکانە" حیزبیەکانیان دابخەن و بۆ ماوەیەک بە فەرمی، هەروەک خشۆکەکانی زستان، بچنە حاڵەتی "سڕبوونەوە"، یان لای کەم چالاکیی پراکتیکی بوەستێنن بەبێ ئەوەی بە فەرمی ئەمە ڕابگەیەنن. بەڵام پیاو ڕاست بڵێ، ئەمانە بەردەوام بوون لە باسی ساڵۆن و ئاهەنگ و قبوڵەکانیان. ئەگەر گوێیەکت لە قسەوباسیان بگرتایە لە یەکێک لە ساڵۆنەکاندا، گوێت لێدەبوو دەڵێن:

- با شیوعیەکان بە برینەکانیانەوە بتلێنەوە، ئەگەر سەرکەوتنیان بۆ بنوسرێت، هەمووومان تێکدەشکێنن، وولاتەکەیشمان پێوە وێران دەکەن. ئەی بیرتان چووەوە دوای خۆپیشاندانەکانی کانونی دووهەمی ١٩٤٨ چیان کرد؟
- من ڕقم لە شیوعیەکانە وەک عەقیدەو ڕێکخراوی سیاسی. بەڵام لە بەرژەوەندی وولات نیە بەم توونديە لێیان بدرێت. سەرکەوتن بەسەریاندا، لووتی ئینگلیزو کۆشک بەرز دەکاتەوە.
- بەڵام ئەزیزم، هەر بەخێرایی بیرت چووەوە! ئەی ئەوان نەبوون خوێندکاران و لاوانیان هان دەدا بۆ خۆپیشاندانە گەورەکان و هوتافە سەرکێشەکان لە هەموو شارێک و هەموو شەقامێکدا؟ ئەی کرێکارانیان هان نەدەدا بۆ مانگرتن دژی خاوەن کارەکان؟ نابێت ئەوەندە خێرا ئەوەمان بیر بچێتەوە.
- لێدان لە شیوعیەکان بێ سوود نیە، بەڵام زیانێکیشی تێدایە، چونکە ئەمە بە ئاشکرا پێگەی ئینگلیزو کۆشک پێکەوە، بەهێز دەکات.

ئا بەمجۆرە لە ساڵۆنەکانیاندا ڕاوێژیان دەکرد.

بەڵام بەڕێز منتظر لەو سەردەمەدا، لە دیدگایەکی ترەوە دەیڕوانیە پرسی لێدانی حیزبی شیوعی. پاگەندەکانی ئەو ئەوە بوو کە هەر ڕێکخراوی سیاسی برجوازی دەمێنێتەوە، وە خۆیشی وادادەنا لەناو پیاوە سیاسیەکانی ئەم ووڵاتەدا، تێگەیشتووترینیانە. وە لەنێو شیوعیەکانی عێراقدا، خۆی بە شارەزاترین کەس دەزانی لە مارکسیزم-لینینیزمدا. وە کاتێک ئەو میحنەتە ڕووی کردە حیزبی شیوعی، ئەو بەڕیزە دژی ئەوە وەستایەوە کە سالانێک بوو لەگەڵیدا بوو، وای دادەنا ئەوە ڕاستە کە ناوی حیزبی شیوعی لە پاشماوەی دەستەکەی ئەو بنرێت. ڕەنگە بیری لەوە نەکردبێتەوە کە ڕێکخراوێکی شیوعیانەی ڕاستەقینە هەیە، وە ئارەزوی ئەوەی نەبوو ئەو حیزبە بە حیزبی خۆی بزانێت، ڕێی ئەوەیشی لێنەدەگرت هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ڕێکخراوێکی"شیوعی" ی هەبێت، چونکە بەپێی خەمڵاندنەکانی ئەو، بوونی حیزبێک بەو ناوەوە، سوودێکی گەورە بەو بەڕێزە دەگەیەنێت.

* * *

حیزب لە میحنەتێکی ڕاستەقینەدا دەژیا –بێگومان میحنەتێکی وەختی. ئازارەکانی و زیندانیەکانی هەر زیادیان دەکرد. هەر لەو ژوورە بچکۆلەیەدا، هاوڕێیان وێنەیەکی دیاریکراویان لەسەر بارودۆخی حیزب کێشا، دڵتەزێن، ئەگەرچی تەواو نەبوو. ئەو وێنەیە بووە خاڵێکی میحوەری لەپێش چاوی مەجیدداو لە بەردەم بیرکردنەوەکانیدا. ئایا دەشێت حیزب تووشی ئەم هەموو شتە بووبێت؟ کەواتە چی شتێک بە سەلیمی ماوەتەوە لە حیزبدا؟

ڕووناکیەکە وەک نیشانەیەک بۆ وەختی خەو کوژێنرایەوە. مەجید لەسەر پێخەفەکەی ڕاکشاو هەموو ئەو ڕووداوانەی بەبیردا هاتەوە کە ئەو ڕۆژە بیستبوونی، ئەمانەیشی دەبەستەوە بەو باسانەوە کە بە درێژیی ئەو ماوەیەی ڕابووردوو لە ڕۆژنامەکانەوە بڵاوکرابوونەوە، وە هەر لەوەیشەوە، لە بیری خۆیدا ئەو وێنانەی شیدەکردەوە دەربارەی

باروودۆخی حیزب که خراپه بەردەمی. وە ئیتر بیری دەجوولا، جارێک بەرەو شارە بچکۆلەکەی و جارێکیش بەرەو ژوورە بچووکەکەی گەڕەکی حمام المالح، بۆیە خەو چاوەکانی جێهێشت. بەلام ئەمەی لێنەبووە ئەو ماندوێتیە ئاساییانەی خەلکی تووشی خەوزڕان دەکەن. ئەو هەر بیر دەکاتەوەو بیر دەکاتەوە. کاتژمێرەکە کاژێری سێی دوای نیوەشەوی لێدا، ئەو تا ئێستایش ڕاکشاوەو لە بیر کردنەوەدا نوقم بووە: حیزب بە چ باورودۆخێکی سەختدا تێدەپەڕێت؟ ئەمە چۆن دوژمن توانیویەتی ئەم گورزە دووبارەودووبارە فراوانانە بسرەوێنێتەوە حیزب؟ چۆن توانیویەتی یەک لە دوای یەک، ئەم زەبرە بە سەرکردایەتی حیزب بگەیەنێت لە ماوەی چەند مانگێکدا؟ ئەی ئێستا دەبێت چی بکرێت؟

دواجار مەجید بەدەم بیرکردنەوەوە، گەیشتە ئەوەی کەمێک هێمنی بگێڕێتەوە بۆ خۆی، بەڕای خۆی، گەیشتە ئەوەی باروودۆخەکە ئەوەی بۆ شیدەکاتەوە؛ هۆکاری گەیشتنی حیزب بەم حالە چیە: ئەگەر ڕووخانی چەند کەسێکی ترسنۆک نەبوایە کە جێگایەکیان لە سەرکردایەتی حیزبدا داگیر کردووە، مەحالٚ بوو دوژمن سەرکەوتووبێت لە دەستوەشاندندا لە حیزب ئا بەم جۆرە. دەبا ئەو ترسنۆک و سووکانە هەر بڕۆن! کێ ناچاری کردوون بێنە ناو حیزبەوە، خۆیان بۆ هیلاک دەکەن کە ئەو ووزەیەیان پێ نیە؟ بۆچی هاتوونەتە حیزبەوە ئەگەر ناتوانن بە وەفا بن بۆی و نازناوی ئەندامێتی حیزبی و شەرەفی شیوعیانەیان لە هەموو لەکەیەک بپارێزن؟ ئای لەم ترسنۆکانە! لە شکەنجە ترساون، لە زیندان و مردن ترساون، سەرشۆڕی و چەمانەوەیان لەبەردەم دوژمندا پێ قبوڵ بووە، قبوڵی ژیانێکیان کردووە هەموو چرکەیەک مردنی تێدایە!

بەلام ئەم بوونەوەرە تێشکاوانە کە خۆیانداوە بە دەست سوڵتانی قامچیەوە، ئەوە ئەو ئاوێنەیە نیە دەموچاوە ڕاستەقینەکەی حیزبی شیوعی عێراق تیایا ڕەنگدەداتەوە .. ئەو بوونەوەرانە دوورن لە حیزب و نامۆن بە شیوعیەت.

لە لووتکەی حیزبدا، پیاوانێکی ڕاستەقینە هەبوون لە جۆرێکی تر، لەو پاڵەوانانەی خۆیان بە نموونە خاوێنەکەیانەوە بەستبۆوەو تا دوا هەناسەشیان، دڵسۆزی حیزب و پرنسیپەکانی بوون .. فەهد ئەو کەسە بوو لە بۆتەی خەباتدا، پڕ لە ئەزموونی ژیان، مرۆڤێک لە ڕیزەکانی ئەو خەڵکە سادەیە هاتبووە دەرەوە کە لە ناو میللەتەوە هەڵقووڵا بوون و گیرۆدەی هەمان ئەو شتانە بوون کە میللەت گیرۆدە بوو بە دەستیەوەو هەستی بە هەموو ئەو شتانە دەکرد کە میللەت هەستی دەکردن، گفتیشی بەخۆی دابوو، هەموو ژیانی خۆی، بۆ خزمەتی ڕەنجکێشانی وولاتەکەی تەرخان بکات. مەجید لەوکاتەدا ئەوەی دەخستەڕوو کە بەسەر حیزب هاتووە، بیری لەو پیاوە چاکە دەکردەوەدو گووتی: "ئەوە ئەو خەباتگێڕە شیوعیەیە کە دەبێت من بیکەمە نموونە وە هەموو هاوڕێیەکی تریش بیکەنە نموونە، ئەوەیە شیوعی ڕاستەقینە. فەهد نموونەیەکی پێشکەش نەکردووە کە شیوعیەکانی پێ وەسف بکرێت لە ڕۆژەکانی ژیانیانداو بەس، بەڵکو فێریشی کردوون چۆن خەباتگێڕی شیوعی دەبێت بمرێت لە پێناوی حیزبەکەیدا. ئەو دەیزانی چ ڕێگایەکی هەڵبژرادووە لە ژیانیدا، ئەو تۆپەڵێک بوو لە خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ حیزبەکەی و شانازیی بە هەموو ئەو شتانەوە کە لە پێناوی چینی کریکارو هەموو کارگەراندا پێی هەستاوە، هەر لەبەر ئەوە، تا دوا چرکەی ژیانی سەربەرز مایەوەو وەک شێر سەرکەوتە سەر سێدارەو بە ڕووی جەللادەکاندا نەڕانی:

- شیوعیەت لە مردن بەهێز ترەو لە سێدارە بڵند تر.

پیاوانی تریش لە هاوڕێیانی فەهد هەبوون کە هەمان چین دروستی کردوون. حازم کە لەژێر پەتی سێدارەدا بەڕووی جەللادەکانیدا دەقیژێنێ:

- ئەگەر جارێکی تریش گەڕامەوە بۆ ژیان لە ڕێگای شیوعیەت زیاتر هیچی تر هەڵنابژێرم.

- هەروەها صارم کە لە بن پەتی سێدارەدا، بە سروودی نەمری بۆ خەباتی گەل ماڵ ئاوایی لە ژیان کردو شانازی دەردەبڕی بەو خۆپیشاندانە میللیانەوە کە لەو گۆڕەپانەوە دەردەچوو ئەوی تێیدا لە سیدارە درا.

ئا ئەمانە ڕووخساری ڕاستەقینەی حیزبی شیوعی عێراقیین، ئەوانەی نە مردوون و نە دەمرن. کەواتە خانووەکە لە بناغەوە نەجووڵاوە، ئەگەرچی زیانی گەورە بە سەقف و دیوارەکانی گەیشتووە.

کەسانی تریش هەن لە هاوڕێیانی تری فەهدو حازم و صارم، سەدان و هەزاران خەباتگێڕی خۆگر هەن لەوانەی بەرامبەر جەللادەکانیان وەستاونەتەوەو بە شەرەفەوە بەرگەی ماندوویەتی خەبات و شێوەی جیاوازی ئازاردان و زیندان و گرتووخانەکانیان گرتووە. ئەوانەیش ڕووخساری گەشی بزووتنەوەی شیوعیین لەم وڵاتەدا. دوژمن، چ لە ترساو چ لە ڕقدا، ئەو دەموچاوانەی لە نێوان دیوارو تەلبەنەکاندا بەند کردووە. بەڵام تیشکەکەی دەرگا داخراوەکان و دیوارەکانیش دەبڕێت، خۆرو گەرمیەک دەهێنێت کە شەوگار ڕاودەنێت، بەفر دەتوێنێتەوەو بەهار نزیک دەکاتەوە.

لە دەرەوەی زیندانەکانیشدا ئەو کەسانە هەن کە بەبێ دوودڵی ئەو ئاڵایەیان هەڵگرتووە، ئەو بەچکە فەهدانەی پەیمانەکەیان بردە سەر، ئا لەوانەیشدا دووبارە ڕووخساری ڕاستەقینەی حیزبی شیوعی دەبینینەوە. هەموو ئەمانە گەشبینیمان زیاد دەکەن، باوەڕمان بەوە بەرز دەکەنەوە کە برینەکە سارێژ دەبێت و ئاڵاکە تا هەتایە دەشەکێتەوە.

مەجید ئەیدەزانی ئەو شەوە سەختە درێژەی یەکەم لەو ماڵە تازەیەیدا لە گەڕەکی حمام المالح، چەند نووستووە. بەڵام هەرچۆن بێت شەو تێپەڕی، ڕۆژی دواتر هات، ئەو ڕۆژەیش هەر ڕۆژی قسە کردن و بیرکردنەوە بوو سەبارەت بە مەجید، هەرچەندە چەند کەسێکی تر لە دانیشتوانی ئەو ماڵە، دەرچوون بۆ بینینە حیزبیە ئاساییەکانیان. هاشم سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە قسە کردن. ئەمجارەیان خۆی باشتر ئامادە کردبوو بۆ لێدوان،

وەڵامەکانی لەسەر چەند پرسیارو داوایەکی مەجید چڕ کردبۆوە. سەرلەنوێ باسی ڕووداوەکانی نێو حیزبی کرد، بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر بارودۆخی ڕێکخراوی پایتەخت و ڕێکخراوەکانی ترو لێکدابڕانی ڕێکخراوەکانی حیزب بە تەواوی و بێ ئاگایی لەوەی کە ڕووی تێکردوون، هەروەها باسی تێشکاوبی ڕێکخراوەکانی کرد لەژێر زەبری لێدانە یەک لە دوای یەکەکانی پۆلیسداو کەمبوونەوەی مەعنەویەت و بێبڕوایی و کشانەوەی گەلێ کەس لە تێکۆشان و لەو نارەحەتیە زۆرو هەمەجۆرانەی لە کاردان لەو بارودۆخە نائاسایی و شازەدا کە حیزبی پێدا تێدەپەڕێت.

مەجید لە ڕۆژانی داهاتوودا، بە چاوی خۆی ئەو بارودۆخە سەختەی بینی کە حیزبی تێدایە، بەڵکو بارودۆخێکی سەختتر لەوەی هاشم و ئەنوەرو جەلال یادیان خستبۆوە. چی لە ڕێکخراوەکانی پایتەخت ماوەتەوە؟ ڕێکخراوێکی بچکۆلە، پاشماوەی ڕێکخراوەکە لە نێو کرێکاران و زەحمەتکێشەکاندا، کەمێکیشی لە نێو خوێندکارانی کۆلێژەکاندا، چەند هاوڕییەکیش لە نێو ڕۆشنبیران و نیمچە ڕۆشنبیراندا، کەمێکیش لەمانە لە کازمیە. واتە دەیان هاوڕێیەک لە هەموو پایتەختدا ماونەتەوە دوای پێنج لێدانی یەک لە دوای یەک.

ژمارەیەکی زۆر هاوڕێی خۆبەخش مابوون لەوانەی نەکەوتبوونە دەست دوژمن. بەڵام ئا لەو بارودۆخە سەختەدا، پەیوندی کردنەوەیان بە ڕێکخراوی حیزبەوە ئاسان نەبوو، ئەگەرچی حیزب ئێجگار پێویستی پێیان بوو. فڵان هاوڕی پەیوەندیی پچڕاوەو لەماڵەوە دانیشتووە، یان خۆی شاردۆتەوە لە شوێنێک و لەلای خۆشیەوە یەک تاکە هاوڕێ ناناسێت لەو هاوڕێ کەمانەی لە ڕێکخراوەکەدا کاری لەگەڵ کردوون، کەسیش ئەو ناناسێت و نازانێت لە کوێ خۆی شاردۆتەوە. بۆیە ناتوانێت باوەڕ بە کەسانێک بدات کە نایانناسێت، وە چارەنوومی خۆیشی ڕادەستی کەسێک ناکات باوەڕی پێی نەبێت. ئا بەوجۆرە پەیوەندیەکەی پچڕاوەو دوور لە حیزب کارەکانی وەستاندووە هەتا کاتێکی نادیار. ئەم دوورەپەرێزیە لە ڕێکخراوەکەداو لە تێکۆشانی ڕۆژانەدا، هەر تواناو کەفائەتێک نیە حیزب بەهۆی دابڕانی ئەو کەسانەوە لەدەستی دابێت و بەس، بەڵکو هەر خۆیشی

یاریدەدەرە لە دابەزینی مەعنەویەت و لاواز کردنی گیانی تێکۆشەرانە لە لای ئەو هاوڕێیانەیش خۆیان، وە سەبارەت بە هەندێکیشیان هەر لە ماڵ دەمێننەوە بەبێ بیرکردنەوە لە گەڕانەوە بۆ حیزب.

وا ڕێدەکەوێت پەیوەندیی لەگەڵ یەکێک لەو هاوڕێ دابڕاوانەدا دروست دەبێتەوە، پەیوەندیەکانیش هەر لە بینینی سەر شەقامەکاندا بەند دەکرێت، ئیتر ئەمە بەبێ ئەوەی بواری بدرێت ناوی دروست و ناونیشانی ماڵ و کاری ڕێکخەرە حیزبیەکەی بزانێت، وە دانسقەیش بوو لەو ڕۆژگارەدا ڕێکخەرەکە "ڕیسک" ی ئەوە بکات داوای ناوو ناونیشان لەو هاوڕێیەی بکات کە پەیوەندیی دروست کردۆتەوە لەگەڵ حیزب هەتا بتوانێت لەکاتی پێویست یان دابڕاندا بیدۆزێتەوە. گەلێ جار ئەو پرسیارە بێ وەڵام دەمایەوەو دواییش هاوڕێکەی وازی لێدەهێناو ئیتر نەدەگەڕایەوە بۆ لای.

ئەنوەر بەدەم ڕاخستنی ڕۆژنامەیەکی کۆنەوە وەک "مێز" بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ کە پێکهاتبوو لە شووتی و ماستاوو نانی گەرم کە بۆنی بە ژوورەکەدا بڵاو بووبووەوەو ئیشتیهای دانیشتوانی دەکردەوە، گووتی:

- من وای بۆ دەچم ئەندامێتی حیزب دوای ڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨ بە شێوەیەکی سەیر زیادی کرد. هەر لەو کۆلیژەی لێی دەخوێنم، بەر لە ساڵێک لەمەوبەر، ژمارەی ئەندامانی حیزب گەیشتە دوو ئەوەندەی ئەو حیزبیە ناخۆبەخشانەی کە ئێستا لە هەموو پایتەختدا بوونیان هەیە.

هاشم و جەلال لایەنگری ئەو ڕایە بوون، ئەوەشیان یاد خستەوە کە ئەوانە بەر لە ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش، هەر لە بەغدا بوون، زۆر سادە، باسی ئەو فراوان بوون و "هەڵاوسان"ەیان دەکرد کە بەر لەساڵێک، لە پایتەخت، تووشی ئەندامێتی هاتبوو لە حیزبدا، واتە دوای ئەو سەردەمە شۆڕشگێرەی بە شوێن ڕاپەڕینی کانوندا هات.

له گەڵ شوێن، دوای نانی نیوەڕۆ، خەڵکی بیر لە کەمێک حەوانەوەو خەو دەکەنەوەو ڕادەکشێن. بەڵام لێرە، دانیشتوانی یەکێک لەو "کۆمەڵگا" بچووکەی لە ژوورێکی گەرەکی حمام المالحدان، دواین شتێک کە بیری لێ بکرێتەوە خەوتنە. ڕاوێژ چاکترە لە خەو. تەنانەت ئەگەر راوێژێکی جیدییش لە ناوا نەبوو، ئەوا "چەلەحانێ" یەکی خۆشیش لە خەو خۆشترە. مەجید هەر لێرە لە ژوورەکەدا، یەکەمین نوکتەی پێکەنیناوی بیست، ئەگەر بۆمان هەبێت پێی بڵێین نوکتە:

- جارێک بەلای مستەفادا تێپەڕیم، ئەو کوبە فرۆشەی هەر لەم کۆڵانەدا دەوەستێت، کچێکی بچکۆلە لێی پرسی: مامە! ئەوە سکت هەیە؟ ئاگات لە وورگی خۆت نیە؟
- مستەفا وەڵامی چی بوو؟
- چاوەڕێ دەکەی وەڵامی چی بووبێت؟ هێرشی بردە سەر منداڵەکە بە جنێودان: " ...... ". ئەگەر منداڵەکە هەڵنەهاتایە، ئەوا کوبەفرۆش هەرچۆنی بویستایە لە سووکایەتی پێکردن دەیکرد.

مەجید ئەو عەسرە بۆ یەکەمینجار سوورێکی بە شاردا خوارد –سووڕانەوەیەکی کورت بە مەبەستی شارەزا بوون لە کوچەو شەقامە نزیکەکان، ئێوارەیش هەر چواریان پێکەوە سوورێکی تریان خوارد. فەسڵێکی تریش لە قسەو ڕاوێژی بێ بەرنامە ئاڵوگۆڕ کرا. ئا لەو بارودۆخەدا کە بە قووڵی داکشابووە خوارەوە، ئەو بارودۆخەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی تێدا دەژیا لە عێراقدا، ئەنوەر ئامادە بوو گرەو لەسەر ئەوە بکات کە ڕاپەڕینی کانون لە یادی دوو ساڵەیدا، خۆی نوێدەکاتەوە! بێگومان ئەمە هەر وەهمێک بوو، بەڵام ئەمە نیشانەی باوەڕ بوون بە توانای مەزنی گەل.

ڕووناکیەکە وەک نیشانەی خەوتن کوژێنرایەوە. بەڵام مەجید باوەڕی وا نەبوو بەو زوانە بخەوێت. ئەو لە "جیهانێکی نوێ" ی فراواندایە، نوێ بە شەقامەکانیەوە، بە ئۆتۆمۆبێل و

بازاڕی گەورەیەوە، تازەیش لە کێشەو مەشغەڵەتەکانیدا. ئەو جارێکی ترو دوان و سیان ڕووداوەکان وەبیر دێنێتەوە. بیری دەکردەوەو پرسیاری لە خۆی دەکردو هەتا خۆی وەڵامی خۆیشی بداتەوە. ئەو شەوە شتێکی ناخۆش ڕوویداو زنجیرەی ئایدیاکانی پچڕاند، ئەویش پرخەپرخی یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی لەو ژوورەدا خەوتبوو.

مەجید بەدەم خستنەڕووی ڕووداوەکان و شیکردنەوەیانەوە، شتێکی نوێی بۆ دەرکەوت کە مەترسیەکی تێدا بوو، ئەگەرچی شتێکی تەواو سادەیش بوو. ئەو باوەڕەی لەلا دروست بوو کە یەکێک لەو هۆکارە گرنگانەی یاریدەدەر بووە بە دوژمنە چینایەتیەکان لە سەرکەوتندا لە تێسرەواندنی لێدانە توندوتیژەکانی حیزبدا، ئەمە لە کەمی ووریایی شۆڕشگێڕانەوە هاتووە لە لای کادرەکانی حیزب لە کاری نهێنی و تەگبیری خۆپاراستندا. ئەگەر ئەوان ئەزموونێکی فراوانتریان هەبوایە لە کاری نهێنیدا، ئەوا دەیانتوانی لە گەلێک لە لێدانەکانی دوژمن خۆیان بپاراستایە. زۆر لە هاوڕێیان، لە ڕێڕەوی گرتن و ڕاوودونانندا، ساویلکانە، بەڵکو گەمژانەیش هەڵسوکەوتیان کردووە، چونکە ئەوان هیچ حیسابێکیان بۆ ڕێکەوتە نالەبارەکان نەکردووەو تەگبیری حاڵەتی پێویست و ناکاویان نەکردووە بۆ خۆلادان لە هەندێک بەرکەوتن. ئەگەر فەهدو حازم و صارم لە زینداندا نەبوونایە لە کاتی ئەو میحنەتەدا، دوژمن سەرکەوتوو نەدەبوو لەو لێدانە قورسانەدا کە بەر حیزب کەوتبوو – مەجیدا بەنهێنی، ئا بەم جۆرە بیری دەکردەوە.

دەبێت مەجید بۆ لێکدانەوەی شتێکی تریش بگەڕێت! چەپۆکەکانی پیاوانی پۆلیس، نەگەیشتوونەتە هەموو شیوعیەکان. بەبێ شک ژمارەیەکی زۆریان لە دەست پۆلیس ڕزگاریان بووەو ئازاد ماونەتەوە. ئەی ئا ئەو نەگیراوانە لە کوێن؟ بۆچی ژمارەی ئەندامانی حیزب ئەوەندە کەمی کردووە؟

چارەسەری ئەم "لەغزە"یان گران نەبوو: لێدانەکان بەر بڕبڕەپشتی حیزب و تۆڕی کادرەکانی کەوتووە. بێگومان جەستە ئیفلیج دەبێت، کاتێک بۆ چەند جارێک دەشکێت و

دەشکێتەوە. بەڵام حیزب دەژیاو باشیش بوو، هەرچەندە بە شێوەیەکی وەختی ئیفلیج بووە. ئەزموونی سەرکردەو کادرەکانی لەکیسچووە، بۆیە لە زۆر بواردا ڕێکخراوەکانی بریندار بوون، وە هەروەک ئەو سوپایەی لێهاتووە کە لە بەرامبەر دوژمنێکی بەهێزتردا، شەڕێکی دۆڕاندبێت. بۆ ئەوەی بواری ئەو سوپا تێشکاوە نەبێت خۆی ڕێکبخاتەوە، ئەوا دوژمن زۆر عنادانە بەردەوامە لە هێرش. لە ماوەی یەک ساڵدا، چەند ڕێکخراوی حیزبی بۆ جارێک و دوان سیان و چوار تێکشکێنراون! لێدانێکی توندوتیژ ڕێکخراوەکەی تێکشکاندووە، دوژمنیش وادەزانێت ئیتر لای کەم، هەتا ساڵانێک، هەموو شتێک کۆتایی هاتووە. بەڵام کاروبارەکە شێوەیەکی تر دەڕوات، بە تەلەفۆن کردن بۆ بەشە جیاوازەکانی پشکنینی تاوانکاری "ئاسایشی گشتی"، هەواڵ لەسەر کەسایەتیەکی دووهەم وەردەگرن "نائل عیسی":

- هەلەو! گەورەم لە فلان کارگە، تێبینی چالاکی شیوعیانە دەکرێت.
- گەورەم! شیوعیەکان لە فلانە کۆلیژ هەستاون بە چالاکیەکی هەستپێکراو.
- گەورەم! فلانە شیوعیم بینی کە لە یاسا هەڵاتووە، بەڵام نەمتوانی بیگرم.

ئەم تەلەفۆن کردنانە دەمارەکانی "گەورەم" کرژ دەکات کاتێک لە ئۆفیسە فەرمیەکەی خۆی دانیشتووەو ئەویش بە دەوری خۆی، تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێت و سەرۆکی فەرمانگەکەی بێ تاقەت دەکات هەتا بەم هەواڵانە، دڵسۆزی خۆی دەربڕێت، ئینجا زووزوو ژوورەکە جێدەهێڵێت و دێت و دەڕوات، مەزاجێکی توورە، لە هەموو هەنگاوێکیدا وورگی دەلەرێنێتەوەو نەعلەت لە مارکس و لینین و ستالین و فەهدو هەموو شیوعیەکی "ڕووخێنەر" دەکات، ئینجا دەکەوێتە جنێودان بە پیاوانی فەرمانگەکەی کە بێتوانان لە هەڵکێشانی ڕەگی شیوعیەتدا لە بنەوە لەم وولاتەدا. ئاخ، خۆزگە ئینگلیز دەیتوانی "ئامێرێکی جادوویانە" دروست بکات کە بتوانێت هەموو مرۆڤێک لەوانە دەربخات هەڵگری باوەڕی شیوعیانەی ڕووخێنەرن!

* * *

سوارچاکەکانی پاکتاوکردنی شیوعیەت هەڵە بوون لە حیساباتەکانیاندا، ئەوان بێئاگا بوون لەوەی هەوڵی مەحاڵ دەدەن، شیوعیەت لەم ماوەیەدا لەسەر ئەم زەویە بە پیتە، ڕەگی خۆی قووڵ داکوتاوە، دوژمن هەرچەند ڕەق بێت لە تێرۆرەکانیدا، بێتوانا ماوە لە هەڵکێشانی ئەو ڕەگانەدا. کەلەپووری شۆڕشگێرانەو ئەرێتی خەباتگێڕانەو پێکاناڵانی ناکۆکیە نیشتمانی و چینایەتیەکان –ئەمانە هەموو شیوعیەت بەهێز دەکەن، شیوعیەتیش هێزی خۆی لە میللەتێکی مەزنەوە وەردەگرێت کە تێشکان نازانێت، ملکەچ کردن بۆ چەوسێنەران ڕەتدەکاتەوە، دوای هەر شەڕێکیش کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بەرەی بەرگری لێکردنی، فەوجی نوێی لە جەنگاوەرە نەبەزەکان بۆ ڕەوانە دەکات. بۆیە لەوانەیە دوژمن شەڕێک یان چەند شەڕێکی تریش بباتەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت ئەو گەلە تێبشکێنێت، ناتوانێت هەتا سەر، لەبەردەم ئیرادەی ئەو گەلەدا خۆی بگرێت.

چەنجار دوژمن ئەو لێدانە قورسانەی ناراستەی حیزب کردووە. بەڵام هەر بە خێرایی دەموچاوی نوێ و گەنجانەی ئاگراویی بە حەماس و پڕ لە خۆگری و باوەڕ دەرکەوتوونەتەوە، لەو خەباتگێڕە سادانەی خۆیان لە دەست دوژمن دەرباز کردووە. لە ڕیزی بنکەکانی حیزبدا کەسانی چالاکی نوێ سەرهەڵدەدەن کە سەرلەنوێ ڕێکخراوەکەیان دادەمەزرێننەوەو ئەو ئاڵا ئەمرە هەڵدەگرنەوە کە لەوەوبەر هاوڕێیان بەرزیان کردبۆوە. دەشێت پەلامارێکی تری ئەو ڕێکخراوە بریندارە بداتەوە کە هێشتا لە قۆناغی یەکەمی دامەزراندنەوەیدایە. بەڵام کەسانی تر خەریکی دەستپێشخەریین لە کاری بەدەستوبرداو جێگای ڕووخاوەکان پڕ دەکەنەوەو ئاڵا ئەمرەکەیان هەڵدەبڕن و بۆ جاری دووهەم و سێهەم و چوارەم دەکەونەوە کار کردن بۆ بیناکردنەوەی ڕێکخراوەکە. ئای لەم ئەرێتە خاباتگێڕیە جوانە!

دوژمن ئامرازو توانایەکی زۆری لەبەردەستدایە، خاوەنی هەزاران سیخوڕی چەکدارە، زیندان و گرتووخانەی تەواویشی لەبەردەستدایە، چەندیشی پێویست بێت لە پارە ئامادەیە لەبەردەستیدا بۆ پاکتاو کردنی شیوعیەکان، یاسایش بەو شێوەیە بەکاردەهێنێت کە لە بەرژەوەندی خۆیەتی، کاتێکیش بەرژەوەندیەکانی دەخوازێت، ئەو یاسایانەیش دەخاتە ژێر پێی بۆ لەناو بردنی شیوعیەکان. شیوعیەکان خاوەنی هیچ کام لەو توانایانە نەبوون. بەڵام هەر خۆگر مابوونەوە، چونکە بە باشی خۆیان ڕێکخستبوو، بەرگریشیان لە پرسێکی دادپەروەرانە دەکردو گەلیش بەرگریی لەوان دەکرد.

زریانی تیرۆر بەسەر هەموو عێراقەوە بوو، زۆر بوون ئەوانەی ئەمەیان بە زوڵمێک دادەنا لەم دونیایەدا. بەڵام تێکۆشەرە شیوعیەکان، ئەوانەی ئیرادەی حیزبەکەیان و نەریتە خەباتگێڕیە ئەمرەکان لە گیانیاندا بەرجەستە بووبوو، لەبەردەم ئەو ڕۆژە سەختانەدا خۆیان نەدەدا بەستەوەو نەدەڕووخان، ئیتر نە لە ژوورەکانی پشکنینی تاوانکاریدا، نە لە زیندانەکانی ئەبوغرێب، نە لە قەڵای ابی حنیک لە بیابانە دوورەکاندا -بەندیخانەی نوگرە سەلمان- وە نە بارودۆخی خۆشاردنەوەو دەربەدەریی ئەوانەی بەندنەکراو مابوونەوە. ئەوان هەر خۆگر مانەوە، خۆگریەکی تەواو، ئەوان نەیاندەویست مەیدانەکە چۆڵ بکەن و لەبەردەم سەختیەکاندا خۆیان بدەن بەدەستەوە، خۆگر بوون و پاڵپێوەنەری کار بوون، لەبەر ئەوەی بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن کە خۆیان بە ئیرادەی خۆیان هەڵیان برژاردبوو، لەبەر ئەوەی بەرگری لە نموونەیەکی خاوێن و پرسێک دەکەن کە بە دڵنیاییەوە ئایدەیەکی هەیە. ئەوان لە هیچ شتێکیاندا لەوانە نەدەچوون کە لەبەرامبەر چەند درهەمێکدا یان لە پێناوی بەرژەوەندیە خۆویستیەکەی خۆیان یان پرسێکی دۆڕاودا بە کارەکانیان هەڵدەسن.

کەمایەتیەک لە هاوڕێ نەبەردەکان لە ڕێکخراوی بەغداو ڕێکخراوە حیزبیەکانی تریشدا، ڕووبەڕووی دەسەڵاتی دەوڵەت وەستابوونەوە کە گەیشتبووە لووتکەی سەرکەوتن، بەرامبەر هەرچی هێزو تواناو ئامرازی سەرکوت کردن و سیخوڕی هەیەو بەڕووی دوژمنانی شیوعیەتدا دەیانقیژاند:

- نەخێر، سەرنەکەوتوون بەسەر حیزبی شیوعیدا هەرگیز، بەڵکو ئێوەن قەڵاکەتان لە ڕووخاندایە.

ئا بەوجۆرە حیزبی شیوعی ئەو میحنەتەو هەموو میحنەتەکانی دوای ئەویشی تێپەڕاند.

- ئەمڕۆ نامەبەرەکەی حیزب لە حلەوە هاتە لامان. چاوەڕێی وەڵامی پرسەکەیشی دەکات –ئەمە هاشم ڕایگەیاند، کاتێک بەر لە نیوەڕۆ لە دەرەوە گەڕایەوە.

ئەرێ لەوێ چی دەگوزەرێت، لەو شارە بچکۆلەیە، لەوێیش حیزب ڕێکخراوێکی فراوانی هەبوو، لەوێیش ڕێکخراوەکان بەر لێدانی یەک لەدوای یەک کەوتن، بەڵام ڕێکخراوەکە هەر ماوەو خۆگریشە.

- ئەوە نامەکەیە هاوڕێ!

بارودۆخەکە خراپ نیە، لیژنەی حیزبی لە پەیوەندیەکی ڕێکوپێکدا ماوە لەگەڵ هاوڕێیان و شانەکان. لاوێکیش داوای کردووە بێتە نێو حیزبەوە، لە نامەکەیشیدا ئەوەی یاد خستۆتەوە کە شەرەفە بۆ ئەو لەم بارودۆخە سەختەی بە وولاتدا تێدەپەڕێت، خزمەت بە حیزبی شیوعی بکات. ناونیشانێکی تازەشیان هەیە بۆ نامەگۆڕینەوە لەگەڵ حیزب.

مەجید بیری کردەوە، ئا لەم ڕۆژە سەختانەدا تێکۆشەرێکی نوێ قبوڵ دەکرێت لە ڕیزەکانی حیزبدا! نا، ئەم حیزبە هەرگیز ناکەوێت مادام میللەتێکی شۆڕشگێری مەزنی وەک ئەم میللەتەی بەدواوەیە.

هێشتا کات ماوە بۆ نانی نیوەڕۆ. هاوڕێیان هەموویان، بەپێچەوانەی خووەکانی خۆیانەوە، بە تەواوی بێدەنگ دانیشتبوون. گەرمی ژوورەکە لەگەڵ بەرزبوونەوەی گەرمیی هەتاودا تا نیوەی ئاسمان بەرز دەبۆوە. هەریەکە لە هاوڕێیان باوەشێنێک یان پارچە کارتۆنێکیان بەدەستەوە بوو خۆیان فێنک دەکردەوە. ئەنوەر بە سوعبەتەوە گووتی:

- ئەمڕۆ لەلای مستەفا بانگکراوین بۆ کوبەبە خوارد. هەموو شەوگارەکە شەونخونی کێشاوە هەتا کوبەبەیەکی تایبەتیمان بۆ دروست بکات. ئای کە کوبەبەکەی خۆشە!
- ئێ باشە، مەجید گووتی، ئەی ئەمڕۆ لەگەڵ هاوڕێ قوتابیەکەماندا پەیوەندیت گرتووە.
- نەخێر، سبەینێ دەیبینم. بەندێک کاغەزی تەنکیشمان بۆ دەهێنێت، زۆر تەنک.
- چەند تێبینیەکم هەیە کە دابەش بکرێت بەسەر هاوڕێ قوتابیەکانماندا هەر لە سبەینێوە، هەروەها بەسەر هاوڕێیانی کرێکارو ڕۆشنبیرو ئەوانی تریشدا.

لەو ژوورە بچکۆلەیەدا کە ژوورێکی نێو خانوویەکی سادە بوو لە گەڕەکی حمام المالح، بڕیاری دابەش کردنی ئاگادارییە حیزبییەکان درا، ئاگاداریی کورت و سادە، بەڵام بە هەرحاڵ، هەر ناودەبرێت بە "ئاگاداریی حیزبی-توجهات الحزبیة". بەر لە دەرچوونی ئەو ئاگادارییانە لەو ژوورە، نامەیەکی حیزبیشی لە ڕێکخراوی پارێزگای حلەوە بۆ هاتبوو! کەواتە ئەو ژوورە لەوە دەرچوو هەر تەنها ماڵێکی سادەی چەند خوێندکارێک بێت، بەڵکو بووە، یان بەرەو ئەوە دەچوو ببێتە "بارەگای نوێ" ی سەرکردایەتی و ئاگادار کردنەوە. لەماوەی چەند مانگێکدا، پێنج "بارەگای سەرکردایەتی" لەناوبراوە. ئەوا لێرەدا، لە گەڕەکی حمام المالح، بارەگایەکی نوێ، بارەگای شەشەمی سەرکردایەتی حیزب پێکدێت. لەو بارەگایەدا نە تەلەفۆن هەیە، نە مۆبیلیات و فەرشی ناوماڵ، نە، تە، نە .. هتد. لەگەڵ ئەوەیشدا دوژمنە سیاسیەکان، سەنگێکی گەورەی بۆ دادەنێن و چاودێریی جیدیی هەموو شتێک دەکەن کە لەوێوە دەردەکرێت.

مەجید نە ڕۆشنبیریەکی تیۆری وای هەبوو نە ئەزموونی سیاسی و ڕێکخراوەیی کە بۆ ئەم ناوەندە نوێیە دەست بدات. ئەو خۆیشی بیری لەوە نەکردبۆوە دەگاتە ئەم ناوەندە، وە لە کەسیشی داوا نەدەکرد ئەوەی پێببەخشن. بەڵام دەبێ چی بکات؟ دەبێت لەم فەرمانە حیزبیانەو لەم بەرپرسیارێتیە ڕاکات ئا لەم بارودۆخە سەختەدا؟ نەخێر، چارە نیە هەستان نەبێت بە ڕۆڵی بەرپرسیارێتی، ئەمە لەکاتێکا ئەم بارودۆخە شتێکی سەپاندووە کە بواری

هەڵبژاردنی تیا نەماوە. هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ئەرک و شەرەفە، بەتایبەت لەوکاتەدا کە حیزب کەوتۆتە ئەم میحنەتە قورسەوە. ئەوانەی لە بارودۆخێکی ئاساییدا ئەرکێکی دیاری کراوت پێدەسپێرن یان هەڵتدەبژێرن بۆ ناوەندێکی دەستنیشانکراو، ئەوەیان شتێکی ترە، مافی ئەوەت هەیە قبوڵی بکەیت یان رەتی بکەیتەوە، بەبێ هیچ شەرمێک. بەڵام چارەسەر رەتکردنەوە لە کاتێکدا کە وەک سەربازێکیت لە بەرەی جەنگدا، لە جێی هاورێیەک کە فیشەکی دوژمن دەیپێکێت، ئەوە نە سادەییەو نە هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە هاورێ جەنگاوەرەکانت، بەڵکو ئەوە ترسنۆکیە، وە بە راکردنیش دادەنرێت لە بەرەی خەبات.

هاشم بەدەم قسە کردنەوە دۆڵابە تەختەییە کۆنەکەی کردەوە کە لە سووچێکی ژوورەکەدا دانرا بوو، هەندێ کاغەزی تێدا ئەمدیوەودیو کرد، بەڵام هیچی تێدا نەدۆزیەوە کاغەزو نامیلکە نەبێت. دیارە بۆ شتێکی دیاریکراو دەگەرێت. دوای گەرانێکی کورت، نامیلکەیەکی دەستنووسی دەرهێناو دایە دەست مەجید:

- ئەوە ژمارەی یەکەمی "الصراع - ناکۆکی". ژمارەیەکی هەتیو. دەیان دەستێک خەریکی کۆپی کردنی بوو کاتێک دەرچوو، دابەش کردنەکەیشی خراپ نەبوو.

مەجید لاپەرەکانی هەڵدایەوەو سەیرێکی بەرگەکەی و ناونیشانی ووتارەکانی کرد، بڵاوکراوەی "الصراع" بە پیتی گەورەو لەژێر ئەو ناوەیشدا نووسرابوو "زوبانحاڵی چینی کرێکاری عێراق". دوای چاوپیاخشانێک، تەنها پرسیاری مەجید ئەوە بوو:

- بۆچی ژمارەی تری لێدەرنەکرا؟
- چونکە ئەو ناوەندە سەرکردایەتیەی ژمارەی یەکەمی دەرکرد، لێدرا. بریار وا بوو ژمارەیەکی تری لێدەربچێت، وابزانم چەند ووتارێکیشی ئامادە کرابوو، بەڵام ئەوە روویدا کە لە هیچ ئەژمار کردنێکدا نەبوو.

مەجید بەر لە هەرچی ویستی لەوە تێبگات کە بۆچی "زوبانحاڵی چینی کرێکاری عێراق" ە نەک "زوبانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق". بەڵام دوودڵ بوو لەوە، بۆیە وازی لەو پرسیارە هێنا. وە بەدەم خوێندنەوەی سەرووتاری بڵاوکراوەکەوە بیری کردەوە: "پێویستە دەرکردنی بەردەوام بێت". دوای ئەوە ژمارەیەکی تری لێدەرچوو، ئەوە ژمارەی دووهەم و کۆتایی بوو. ئەمەیش لەبەر ئەوەی مەجید ڕای گۆڕرا لەو بارەیەوە، وە وایدەبینی وا چاکترە ڕۆژنامەکەی حیزب "القاعدة" دەربکرێتەوە، ئەگەر توانا هەبێت.

- هاوڕێیان نان ئامادەیە.

ئەنوەر بەدەم ڕاخستنی "سفرەی نانخواردنەوە" -ڕۆژنامە کۆنەکە، ئاگاداری کردین. خواردنەکە شووتیە. هەموان بە ئیشتهاوە دەستیان کردن بە نان خواردن، بەجۆرێک وەک ئەوەی ڕاهێنان بکەن بۆ پێشبڕکێی خێرایی لەسەر نان خواردن. جەلال کەوتە چالاک کردنی هەموان لە قووتدانی خواردنەکەدا، کەس لە دانیشتوانی ژوورەکە نەدەچوونە ئەو پێشبڕکێیەوە، ئیتر نە لە خێرایی خواردندا نە لە چەندایەتی خواردنەکەدا. ئەنوەر بەر لە هەموان لە "سفرە" کە چووە دواوە وەک ئەوەی تێری خواردبێت، بە زەردەخەنەیەکەوە بۆڵەیەکی لێوەهات:

- خواردنەکە چەور بوو. دەبێت چای خەستی بکەین بەسەرا.
- خۆت ئەتوانیت چایەکمان بۆ لێنێیت لە قوڕ خەستتر بێت.
- بەسەر چاو. پرێمزێکمان هەیە وێنەی نیە لە پایتەختی عێراقدا. لەخۆوە نیە مستەفای کوبەفرۆش تەماعی کردۆتە پرێمزەکەمان. ئەو دەزانێت چۆن و بە چ خێراییەک ئاو دەهێنێتە کوڵ.

کاتژمێرەکە لە چواری پاش نیوەڕۆ نزیک بووبووەوە. گەرمیی ژوورەکە، لە نهۆمی یەکەمی خانوەکەدا زیاتر دەبوو. ئامرازی خۆفێنک کردنەوەیشیان باوەشێنێکی لە پووش دروستکراو یان کارتۆنێک بوو کە ئەو گەرمایەیان پێ کەمدەکردەوە. هێشتا پارچەیەک

سەهۆڵیش مابوو کە لە سووچێکی ژوورەکەدا لە پەڕۆیەکەوە پێچرابوو. هەرکەس تینووی بوایە دەیتوانی سەهۆڵاوێک بکات و بیخواتەوە.

قسەوباس و ڕاوێژ هەر بەردەوامە. هەندێک ڕاکشاوو هەندێک دانیشتوو، تەنها مەجید لەسەر تاکە کورسیی ژوورەکە دانیشتبوو لە پشت مێزە دارینە کۆنەکەوەو خەریکی "الصراع" و چەند بڵاوکراوەیەکی تری حیزبی بوو. بیریشی دابەش کردبوو لە نێوان ئەو بڵاوکراوانەو ڕاوێژەکاندا. جارجارە دەیخوێندەوەو جارجارەیش بەشداریی قسەی دەکرد.

- سڵاوتان لێبێت!

## ئەمە کێیە؟

هەموان چاویان بڕیە دەرگا کراوەکەی ژوورەکەو هەر بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیش وەڵامی سڵاوی میوانەکەیان دایەوە کە لە دەرگاکەدا وەستابوو. پیاوێکی درێژ، دەموچاوێکی ئەسمەر، تێکسمڕاو، جلوبەرگی "مەدەنی" لەبەردایەو لەبەردەم دەرگاکەدا وەستاوەو هەردوو دەستی لە گیرفانیدا و زۆر ئاسایی ڕووی کردە دانیشتوان:

- تکایە، ژوورێکی چۆڵ هەیە بۆ کرێ لەم خانوەدا؟ بەدوای ژوورێکدا دەگەڕێم بۆ کرێ.

لەمەدا مەجید شتێکی کتوپڕی تریشی هەست پێکرد: ئەو زۆر باش ئەم میوانە چاوەڕوان نەکراوە دەناسێت. ڕوانینی میوانەکەیش کەوتە سەر مەجیدو هەر لە یەکەم چرکەوە ناسیەوەو سڵاوێکی ئاسایی لێکردو کەوتە پرسیار لە تەندروستی و هۆکاری بوونی لەو شوێنەدا. مەجید بە ووشەی کورت کورت وەڵامێکی دایەوە کە پڕ بوو لە سەرسووڕمان و

دڵەڕاوکێ. چاوەڕێی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەگەری خراپتریش بوو لەم "میوانە" ناحەزە. ئەنوەریش وەڵامی دایەوە:

- ژووری چۆڵ نیە. هەموو ژوورەکان لەم کاتەدا گیراون.

میوانەکە کشایەوەو هەر بەو خێراییەی دەرکەوت بەو خێراییەیش لەچاو وون بوو. مەجید بەبایەخێکی پڕ لە دڵەڕاوکێوە بە هاوڕێکانی گووت:

- ئەم پیاوەی ئێستا هاتە لامان مفەوەزێکی نهێنیە لە پشکنینی تاوانکاری. من دەناسێت، گەرچی نازانێت خۆم شاردۆتەوە. دەبێت بەر لەوەی هەموو شتێک لەدەست بچێت، بەخێرایی خۆمان ئامادە بکەین.

هەر سێ هاوڕێکە لە ڕاگەیاندنەکەی مەجید ڕاچڵەکین، دڵەڕاوکێ و شڵەژان ڕووخساریانی داگرت. کەمێک بێدەنگی بەسەر ژوورەکەدا هات هەتا هاشم کۆتایی پێهێناو گووتی:

- نا، مفەوەزی نهێنی نیە. مستەفای کوبەفرۆش زۆر باشی دەناسێت.
- من چەندان ساڵە ئەمە دەناسم. ئەمە لە پۆلیسی شارەکەی ئێمە ئەفسەر بوو. بەر لە دوو ساڵ لە دەورەیەکی مفەوەزی دەرچوو، بووە مفەوەز. بەر لە ماوەیەکیش بیستم "خزمەتەکانی" نەقڵ کردووە بۆ پشکنینی تاوانکاری. ئەوە پرسەکەیەو هیچ بواری ئیجتهادی تێدا نیە.

سەرلەنوێ بێدەنگیەکی پڕ لە دڵەڕاوکێ ژوورەکەی داگرت، ئەمە لەکاتێکا مەجید کەوتە کۆکردنەوەی بڵاوکراوە حیزبیەکان وەک خۆئامادە کردن بۆ جێهێشتنی ماڵەکە. هاشم هەر دوودڵ بوو لەوەی مەجید گووتی، ئەو پیاوە میوانە لە پیاوانی پشکنینی تاوانکاری نیە. ئەنوەر بە کارێکی سادە بڕیاری یەکلایی کردنەوەی پرسەکەی دایەدەست:

- کەمێک چاوەڕێ بن. من ئەڕۆم پرسیارێک لە مستەفا دەکەم و ڕاستیەکەی وەردەگرم.

بەخێرایی دەرپەڕیە دەرەوە بەرەو سەری کۆڵانەکە، بۆ ئەو شوێنەی کوبەفرۆشە دەستگێڕەکەی لێدەوەستێت. پاش کەمێک گەڕایەوەو بە هەناسەبڕکێوە گووتی:

- مستەفا باش نایناسێت، دڵنیایش نیە لە کارەکەی. ئەو وای بۆدەچێت دەڵاڵانە وەردەگرێت، وە بۆ کەسێک دەگەڕێت پێویستی بە دەڵاڵێک بێت! مستەفا گووتیشی یەکێک لە دروایسێکان زۆر باشی دەناسێت، وە ئەتوانێت لە دراوسێکەیش بپرسێت.

سەبارەت بە هاوڕێیانی ژوورەکە، ئەو ڕوونکردنەوانەی ئەنوەر لە کوبەفرۆشەکەوە دەستی کەوتبوون، هەر ئاڵۆزیی پرسەکەی زیاد دەکرد. بەڵام مەجید هەر سوور بوو لەسەر قسەی خۆی و بەدەم ڕێکخستنی بە پەلەی کاغەزەکانەوە گووتی:

- من ئەیناسم، پێویست ناکات لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێت، دەبێت هەر ئێستا ئامادەکاری بکەین بەر لەوەی هەلمان لەدەست بچێت.

ئەنوەرو جەلال هەردووکیان لەژێر کاریگەریی دەربڕینە پڕ لە دڵنیاییەکەی مەجیددا ڕازی بوون، بەڵام هاشم هەر دوودڵ و ڕاڕا بوو، ئایا باوەڕ بەوە بکات کە هاوڕێکەی دەیڵێت یان بە خەملاندنەکەی خۆی و کوبەفرۆشەکە! کوبەفرۆش بە پەلە هات بۆ ژوورەکە، بەدەم هەناسەی کورت کورتی گەرماو هیلاکیەوە، بە خێرایی و بە سیمای کەسێکەوە کە هەواڵێکی مەترسیداری پێ بێت:

- چووم بۆ ماڵی دراوسێکەو پرسیاری ئەو کەسەم لێکرد کە پێش کەمێک هاتبووە لاتان. ئەو باشی دەناسێت، پێی گووتم مفەوەزە لە پشکنینی تاوانکاری، بەڵێ بە دڵنیاییەوە مفەوەزە.

- براکەم سوپاس، داوای لێبووردنیش دەکەین کە بووینە مایەی هیلاک کردنت.
- برایان، هەقتان لە هیلاکی من نەبێت! هاتووم ئاگادارتان بکەم ئەو پیاوە مفەوەزی نهێنیی پشکنینی تاوانکاریە. ئاگاتان لە خۆتان بێت و چارەیەکی خۆتان بکەن ئەگەر شیوعیین، ماڵەکە جێهێڵن ئەگەر شیوعیین.

هەر بەوجۆرە، کوببەفرۆشەکەیش خەمی لێهاتبوو، هیچ بریارێکی پێشوەختیشی نەدابوو هەتا خۆی دڵنیایەکی تەواوی وەرگرتبوو وە بە خێرایی خۆی گەیاندبووە ئێمە هەتا هەواڵەکەمان بداتێ. ئەو بەغداییەکی زەحمەتکێش و نەخوێندەوارو سادە، بەڵام شتێکی هەر لە سیاسەت دەزانی و بە هەناسەبڕکێیش هاتبوو هەتا بەو ووشە سادانە چاکەو عاتیفەی خۆی بەرامبەر شیوعیەکان و ڕقی خۆی لە ڕژێمی حوکم دەرببڕێت کە ئا ئەم قۆمیسەرە نهێنیە دەیپارێزێت.

کات نەماوە تەنها چەند خوولەکێک نەبێت بۆ دەرچوونی هەر چوار هاوڕێکە کە هەموو شتەکانی ماڵەکەیان خستبووە بندەستیان و لە بڕوانامەو شتومەکی ناوماڵ، دۆڵابە تەختەکە نەبێت! خواحافیز ژوورەکە، ئەی بارەگای سەرکردایەتی! خواحافیز ئەی کوببەفرۆشە باشەکە! بەڵام ئەم چوارە بۆ کوێ بچن؟ ئایا هیچ ماڵێکی تری فەرش کراویان هەیە ڕووی تێبکەن؟ نەخێر، ئا لەو بەغدا گەورەیەدا شوێنێکیان نەبوو ڕووی تێبکەن و تیایا بگیرسێنەوە. ناشتوانن لەبارودۆخێکی ئاوەهادا لە ئوتێل بمێننەوە، ئێستا گرنگ ئەوەیە ئەم ژوورە جێبهێڵین کە هەر پێش کەمێک ئەو میوانە لەعنەتیە لەبەر دەرگاکەیدا وەستابوو. ئێستا کاری پێویست ئەوەیە بە سەلامەتی لە خاڵی مەترسی دووورکەوینەوە، دوای ئەوە ماڵێکی تر هەر دەدۆزینەوە، لەوانەیە پۆلیس نەدا بەسەر ئەم ژوورەیشدا کە ماوەیەکە تیایا دەژین، ئیتر تەنانەت ئەگەر چۆڵیشی نەکەن. بەڵام ئایا دەتوانن بەدڵنیاییەوە تیایا بمێننەوە دوای ئەو ڕووداوەی ڕوویدا؟ نەخێر، هەرگیز.

- هاوڕێیان وا ئێستا ژوورەکەمان جێهێشت، ڕوو بکەینە کوێ؟

دەتوانرێت ڕۆژەکە لە چایخانەکان و کۆڵانەکاندا ببرێتە سەر. بەڵام ناکرێت شوێنێک نەبێت بۆ شەو تیایا بمێننەوە. ئەوەی لە هەموان زیاتر گوێی نەدەدا بە دۆزینەوەی خانوویەکی نوێ مەجید بوو. هاشم ڕۆڵی سەرکردایەتی وەرگرت و ئاگاداریی دەرکرد بۆ چارەسەری گرفتەکە:

- ڕووی کردە ئەنوەرو جەلال: ئێوە بڕۆن پێکەوە ژوورێک بەکرێ بگرن لە هەر کوێیەک بێت لە گەڕەکی حمام المالح نەبێت.
- ئەنوەر گووتی: ماڵێک دەزانم ژووری چۆڵی تێدایە بۆ کرێ، یەکسەریش ژوورێکمان دەستدەکەوێت.
- من و مەجیدیش دەڕۆین بۆ شوێنێک کە شارەزایم. هاوڕێ مەجید با بڕۆین.

ئا بەوجۆرە چوار هاوڕێکە بوونە دوو گروپ، ئەمە دوای ئەوەی چەند ڕۆژێک خەباتی شۆڕشگێڕیی لەژێر سەقفێکدا کۆی کردبوونەوە. دوای ئەو ڕۆژەیش ئیتر پێکەوە لەژوورێکدا نەژیان.

هاشم و مەجید، ئەو کاتژمێرانەی لە ڕۆژ مابووەوە، لە بازاڕی شۆرجەو چایخانەکانیدا بەسەریان برد. بازاڕی شۆڕجە لە سەرسووڕهێنەرترینی بەغدایە، قەرەباڵغ لە زۆرترین کاتژمێرەکانی ڕۆژدا، ئەمە هەروەک ئەوەی لەوێ بەردەوام خۆپیشاندانی جەماوەریی ڕێکنەخراوو ناراستەکراو هەبێت. ئەوان وا هاتوون خۆپیشاندان بکەن، بەڵام بەبێ ئەوەی بزانن چۆن و بۆچی خۆپیشاندان دەکەن! وێنەکە ئاوای دەنواند لەلای مەجید لە کاتی گەڕاندا بە بازاڕەکەدا. فزوڵیەت هانی دەدا بە ووردی بە هەردوو چاوەکانی و گوێچکەکانی چاودێریی ئەو شتانە بکات کە ڕوویدەدا لە نێوان فرۆشیارو کڕیاردا:

- سوێند بەو کەعبەیەی تێی چووم تاکە فلسێک قازانجت لێ وەرناگرم. دەمەوێت ئەم کاڵایەت بە نرخی خۆی پێ بفرۆشمەوە، چونکە تۆ مرۆڤێکی باشیت و منیش حەزم بە مامەڵەیە لەگەڵ خەڵکی باشدا.

مەجید لە سەرەتاوە وای بۆدەچوو ئەو حاجیە فرۆشیارەی دوکانێکی عەتاریی هەبوو، بەو توونە قسە لەگەڵ برادەرێکی یان خزمێکی دەکات کە هاتووە کاڵایەکی لێبکڕێت. بەڵام بەزوویی بۆی ڕوون بووەوە، ئەم سوێند خواردنەی هەر شتێکە فێری بووەو بۆ هەموو دوکاندارەکانی بازاڕیش "دەست دەدات". حاجیەکی تریش بە هەمان شێوە سوێندی بۆ مەجید خۆی خوارد.

لە کاتێکا هاواری فرۆشیارە گەڕۆکەکان و هەڕاج کردن زیادی دەکرد لە بازاڕەکەداو هەریەکە بانگەوازی دەکرد بۆ کاڵاکەی خۆی، پیاوێکی بە تەمەن لە دوکانەکەیەوە بازێکیداو کەوتە ڕاکردن بەدوای منداڵێکدا کە تەمەنی لە ١٠ ساڵانێک زیاتر دەبوو. دیار بوو منداڵەکە مەشقی ڕاکردنی هەبوو لە نێو بازاڕو قەرەباڵەغیەکاندا، بۆیە لە دەست کابرا هەڵهاتوو لەنێو خەڵکەکەدا وون بوو. خەتاکاریی منداڵەکەیش دزینی جووتێ گۆرەوی بوو لە دوکانەکە، وەک پیاوەکە گووتی.

مەجید سووڕانەوەی بازاڕەکەی تەواو کرد، لە چایخانەیەکدا دانیشتن، بیری لەوە دەکردەوە کە بیستبوونی و بینیبوونی، بەخۆیی گووت: "هەرچی لێرەدا ڕوودەدات غەش و فێڵە! ئەمەیە پەیوەندیەکانی سەرمایەداریی".

دوای کەمێک لەوەی تاریکی داهات، هاشم و مەجید چایخانەکەیان جێهێشت و لە گەڕەکی (عقد النصاری) چەند کۆڵانێکی باریک و تاریکیان بڕی و چوونە خانوویەکی دوو نهۆمیەوە کە لەسەر تەرزێکی بەغداییانە دروست کراوبوو. خاوەن خانووەکە خۆی لە ژوورێکی نهۆمی خوارەوەدا نیشتەجێ بوو، وەک دواتر دەرکەوت، وە لەسەر کرێی ژوورەکانی تری خانوەکە دەژیا. دوو لاوەکە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتنە سەرەوە بۆ نهۆمی دووهەم، چوونە ژوورێکی خۆشی بچووکەوە کە دەرگاکەی لەسەر پلیکانەیەک بوو دەچووە سەربانی خانوەکە، تاکە پەنجەرەکەیشی بەسەر دەرگای دەرەوەی نهۆمی خوارەوەو بەشێک لە گۆڕەپانەکەی نێو ژوورەکانی خوارەوەدا دەیڕوانی.

هاشم لەدەرگایدا، کەس وەڵامی نەبوو. پاشان کلیلێکی لە گیرفانی چاکەتەکەی دەرهێناو دەرگای ژووری کردەوە، بە دەنگێکی نزمیش ڕایگەیاند:

- ئەمە ماڵە تازەکەمانە. لێرە لەگەڵ هاوڕێیەکی تریش دەژین کە هەر کەمێکی تر دەگەڕێتەوە.

هەموو ئەو شتومەکانەی لەو ژوورەدا بوون، دۆلابێکی تەختەی کۆن و پێخەفێکی نوستن و چەند ڕاخەرێک بوو. لێرە "پەرەمێزێک" نەبوو لەو چەشنەی بە تایبەتی بۆ ژوورەکەی حمام المالح دروست کراوبوو! ناواخنی دۆلابەکەیش پەرتووکی مارکسیستانەو چیرۆکی خەباتگێڕی بوو، لەوانە چەند دانراوێکی مەکسیم گۆرکی، لەگەڵ بڵاوکراوەی حیزبی دەستنووس و لە چاپدراوو کاغەزو کاربۆن. هاتنەوەی هاوڕێی سێهەمیش کە دانیشتووی ئەسڵی ژوورەکە بوو زۆری نەخایاند، هاوڕێیەکی ڕاونراو کە لە چاوی پۆلیس خۆی شاردۆتەوە، ماڵی خۆیانی جێهێشتووەو لێرە ژوورێکی گرتووە بەکرێ.

عوسمان بە سڵاوەوە خۆی کرد بە ژوورا، تەوقەیەکی میواندارانەی گەرمی لەگەڵ کردین و بە زەردەخەنەیەکەوە بەخێرهاتنی کردین کە مرۆڤدۆستی و فەرەحی پێوە دیار بوو. لەسەر لایەکی پێخەفەکە؛ دەم بە خەندەو بێدەنگ دانیشت. مەجید ڕووی تێکرد:

- وا دیارە چاوەڕێی ئەم داگیرکاریە کتوپڕەی ژوورەکەت نەبوویت.
- موشەڕەفتان کردم و دڵخۆشتان کردم. لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا بووم کە ماوەیەکە هاوڕێ هاشمم نەبینیوە.

عوسمان لاوێک بوو لە تەمەنی بیست ساڵیدا، باڵا مامناوەندی، ستایلێکی جوان، دوو چاوی ڕەش، لەسەرخۆیی و زیرەکی بە ڕووخساریەوە دەبینرا. ماوەیەکی کەمیشە، بە ئاگاداری و ڕای هاشمیش، گواستویەتیەوە بۆ ئەم ژوورە. هیچ کەرەسەیەکی خواردن دروست کردن و چا لێنانی نیە، جگەرە ناکێشێت، هیچی نیە پێشکەشی میوانەکانی بکات

زەردەخەنەو ووشەی جوان نەبێت. قوتابییەو بەهۆی ڕاونانیەوە لە پۆلیسەوە وازی لە خوێندن هێناوەو کەسوکاری جێهێشتووە. لێرە دەخەوێت و لە شوێنە هەرە هەرزانەکانی بازاڕ نان دەخوات. بە عەیبەیشی نازانێت ئەگەر نە چاو نە جگەرە پێشکەش بە میوانەکانی نەکات. چاوەڕێ ناکات شتێکی لەو جۆرەیش لە میوانەکانیەوە وەربگرێت.

پێخەف بەشی یەک کەس دەکات –ڕاخەرێک و لێفەیەک و بەتانیەکی هەیەو بەس. بەڵام وەرز هاوینە، هاوینیش، وەک دەڵێن، لێفەی هەژارانە. مەجید بەهیچ جۆرێک بیری لە پێخەف نەدەکردەوە. بەڵام لە ناخەوە ئارەزووی ڕادیۆیەکی دەکرد کاتێک گوێی لە دەنگی ڕادیۆیەک بوو لە ژوورێکی نهۆمی خوارەوە، ئاخ، ئەگەر ڕادیۆیەکی دەبوو.

- خۆزگە ڕادیۆیەکمان دەبوو! ئەم ژوورە ڕادیۆیەکیشی تێدا نیە، هەروەک ژوورەکەی گەڕەکی حمام المالح. ڕۆژنامە زەردەکان[5] کە بە پێنووسە بەکرێگیراوەکان دەردەکرێن، سەرچاوەی سەرەکین، بەڵکو تاکە سەرچاوەی هەواڵ و ڕووداوەکانن. ئەمەیش گرفتێکی جیدییە.
- ئێمە ڕاهاتووین لەگەڵ ژیانێکی بێ ڕادیۆدا.
- ئەگەر ڕادیۆیەکمان هەبوایە دەمانتوانی گوێ لە بەرنامەکانی ڕادیۆی مۆسکۆ بگرین. بەڵام وا دیارە هێشتا ڕادیۆ، هەتا ئێستایش هەر "کەمالیات" بێت سەبارەت بە ئێمە.
- باری دارایی ئێستا ڕێگەمان نادات ڕادیۆیەک بکڕین، بەڵام دوای مانگێک دەیکڕین.

---

[5]. ڕۆژنامە زەردەکان -الصحافة الصفراء- بەو ڕۆژنامانە دەگوترێت کە مەبەستیان وورووژاندنی ڕای گشتییە، ئەمەیش بۆ پەیدا کردنی دەستکەوت و قازانجێکی زیاتر. مێژووی دەرکەوتنی ئەم زاراوەیەیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕکابەریە توندوتیژەکانی نێوان نیۆرک وۆرڵدو نیۆرک جورناڵ-ئەمێریکان لە ١٨٩٦ دا. ئەمە لە بەکارهێنانی وێنەیەکەوە دەستپێدەکات لە نیۆرک وۆرڵددا بڵاوکراوەتەوە، منداڵێک بووە بە بەرگێکی زەردەوە، دوو گوێی گەورە، ددانەکانی هاتوونەتە پێشەوە، سەریشی بێوێنە بووە. ئەمە بە منداڵە زەردەکە ناودەردەکات: (Yellow Kid) – (تێبینی وەگێڕ).

ئەم سێ هاوڕێیە دوو شەو پێکەوە ژیان. زۆربەی کاتژمێرەکانی ڕۆژ، هاشم و عوسمان مەجیدیان بە تەنها جێدەهێشت لە ژوورەکەدا تا بخوێنێتەوەو بنووسێت و وەڵامی یەکێک لە نامە حیزبیەکان بداتەوە. ئەنوەرو جەلالیش لە ژوورێکدا جێگیر بووبوون لە حەیدەرخانەو شتەکانیان گواستبۆوە بۆ ئەو ژوورە.

ئەڵقەی ئەو هاوڕێیانەی مەجید لە بینینی نوێ و ڕاستەوخۆو گۆڕینی نامەی حیزبیەوە دەیانناسێت، هەموو ڕۆژێک زیاد دەکات، گەرچی نە دەزانێت و نە هەوڵ دەدات بزانێت ناویان چیەو ناونیشانیان کوێیە. دوای ڕۆژێک لە عقد النصاری، لە یەکێک لە چایخانەکانی شۆرجەدا هاوڕێیەکی ناسی کە پێیان دەگووت نەعیم، باڵا مامناوەندیەکی ڕیش و سمێڵ تاشراو، لووتێکی درێژ، بە ستایلێکی باشەوە، شێوەی لە ڕۆشنبیران دەچوو. هەمیشە جانتایەکی چەرمی پێ بوو لەوانەی کە محامیە مەشغوڵەکان پێیانە.

- هاوڕێ مەجید، بە شەوقەوە چاوەڕێی ئەم یەکتر بینینەم دەکرد.
- خۆشحاڵم بە بینینیت.
- دەتوانم هاوبەشی بکەم لە دروستکردنەوەی چەند پەیوەندیەکدا لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی دابڕاون. هاوڕێیەکی دابڕاو، خوشکەکەی ناردووە بۆ سەردانی هاوڕێیانی بەندیخانە هەتا داوایان لێبکات کۆمەککاری بن لە دروستکردنەوەی پەیوەندیی هاوڕێیاندا بە حیزبەوە. ئەوانیش ناونیشانەکەیان بۆ ناردم، ئەویش لەلای خۆیەوە ناونیشانی هاوڕێ دابڕاوەکانی تر دەزانێت.
- ئەی ئەو بەندکراوە کێیە کە ناونیشانی ئەو هاوڕێ دابڕاوەی بۆ ناردوویت؟
- ئێستا دوو برام و خوشکێکم و برازێکم لە زیندانن. تەنها من توانای هەڵاتنم بۆ ڕەخسا کاتێک پۆلیس چواردەوری ماڵەکەمانی گرت. من لە دەرەوە بووم، ڕووداوەکەم بیست و ئیتر نەچوومەوە ماڵەوە.

"مەجید بیری کردەوە -چ ڕووداوێکی پڕ بایەخە- پیاوێک لە حیزب دادەبڕێت و دەیەویت هەرچۆن هەیە پەیوەندی دروست بکاتەوە. تەنانەت دوودڵ نابێت لەوەی خوشکەکەی بنێرێت بۆ لای هاوڕێ بەندکراوەکان، لەوانەیە یارمەتی بدەن بۆ چارەسەری گرفتەکەی، هەڵەیش دەرنەچووە لە کارەکەیدا. وە هەر بەتایبەتی لەڕێی ئەو هاوڕێیانەوە ڕێگای پەیوەندی کردنی دۆزیوەتەوە بە حیزبەوە. ئای کە گیانێکی تێکۆشەرانە لەم هاوڕێیانەی حیزبدایە، نەخێر، دوژمن بەسەر ئەم حیزبە مەزنەدا زاڵ نابێت".

ڕۆژانی داهاتوو یەکتر بینینەکانی نێوان مەجیدو نەعیم دووبارە بۆوە، ئاڵوگۆڕی تێڕوانینیان لەسەر گەلێ بابەت کرد. جارێک کەوتنە بەر چاودێری پۆلیسی نهێنی، بەڵام توانیان لە دەستیان دەرچن. دوای ئەوە مەجید داوای کرد ئێواران، لەژێر باڵی تاریکیدا، یەکتر ببینن، لە شوێنی تر، دوور لە شۆرجە. نەعیم وەڵامی دایەوە:

زۆر باشە! بەو جۆرە یەکتر دەبینین کە دەتەوێت. با بشزانیت، "چەکێک" ی ترسناکم پێیە دژی هەر پۆلیسێکی نهێنی کە خۆی بخاتە مەترسیەوەو دوام بکەوێت و هێرش بکاتە سەرم. چەکەکەم هەمیشە لێرەدایە، ئا لەم جانتایەدا.

مەجید وایزانی ئەم "چەکە" دەمانچەیەکی باشە، نەعیم لە جانتاکەیدا هەڵیگرتووەو لە کاتی پێویستدا بەکاری دەهێنێت. بۆیە حەزی کرد ئەو چەکە ببینێت.

- ئەو چەکە چیە پێت؟
- تووتنێکە زۆر باش هاڕراوە. چەکێکی ترسناکە، زۆربشە.
- بەڕاستیتە یان گاڵتە دەکەیت؟
- بەڕاستیمە. ئەگەر سیخوڕێک هێرش بکاتە سەرم، کەمێک لەم تووتنە هاڕراوە دەکەمە هەردوو چاویەوە. بەوە کوێر دەبێت و توانای جووڵەی نامێنێت لە جێی خۆیداو هیچ نابینێت.
- هەرگیز ئەم "چەکە ترسنامەکە" م نەبیستبوو کە بۆت باس کردم.

نەعیم باوەڕی تەواوی بەوە بوو کە دروست نیە لە بەغدا بمێنێتەوە، مانەوەی دواجار بەوە کۆتایی دیت کە دەکەوێتە دەست پۆلیس و ژیانی کۆتایی دەهێنن. بۆیە خۆی ئامادە دەکرد بۆ جێهێشتنی پایتەخت. ئەو ڕۆژانەی دەژمارد کە دەگاتە کاتژمێری جێهێشتنی بەغدا. هەرچەندە مەجید بەمە ڕازی نەبوو، بەڵام بەلایەوە دروست نەبوو، دژی ئیرادەو ئارەزووی نەعیم خۆی، بیسەپێنێت بەسەر هاوڕێکەیدا لە بەغدا بمێنێتەوە. بەڵکو یارمەتی نەعیمی دەدا بە سەلامەتی بەغدا بەجێبهێڵێت. ئەو لە شوێنێکی تر گیرسایەوە، دوور لە بەغدا، لەوێیش هەر بەردەوام بوو لە خەباتی خۆی. بەڵام مەجید هەر نەیزانی ئایا ڕۆژێ لە ڕۆژان نەعیم "چەکە ترسناکەکە" ی بەکارهێناوە دژی سیخووڕەکان یاننا؟

* * *

ئەمە ڕۆژی سێهەمە مەجید لە ژوورەکەی عقد النصاری جێگیر بووە. وەک ڕۆژانی ئاسایی، بە تەنها لە ژوورەکەدا مابۆوە. کات بەیانی بوو. ئەو بیری لە لاوازیی خۆپاراستن و توانا دەگمەکان دەکردەوە. ئەم پرسە بیری ئەوی داگیر کردبوو، چارەسەریشی وەستاوە لەسەر کاروبارێکی زۆر. بەڵام چارە چیە؟

دەنگەدەنگێک لە خوارەوە زنجیرەی بیرکردنەوەکانی پچڕاند، لە پەنجەرەکە نزیک بۆوەو سەیرێکی دەرگای دەرەوەی کرد لە نهۆمی خوارەوە کە دەنگەدەنگ و هەراکەی لێوەدەهات، ئەویش شتێک بوو دڵخۆش نەبوو پێی: ژمارەیەکی کەم لە پیاوانی پۆلیس دایان بەسەر ماڵەکەدا، لە پێشیانەوە ئۆفیسەرێک بوو، پۆلیسێک بە پەلە ڕێگای سەربانی گرت کە بە بەردەم ژوورەکەی مەجیددا تێدەپەڕی بۆ سەربان، ئەمەیش وەک ئەوەی لەوە بترسێت نێچیرێک لە دەستی دەربچێت، بەهەمان خێراییش هاتەوە خوارەوە. لە حەوشەی خانوەکەدا لە خوارەوە، هەراکە هەر بەردەوام بوو. لە خاوەن خانوەکەوە، پیاوێکی مەسیحی چوارشانەی پیر، ڕێگیریەک دەکرا لە ئۆفیسەری پۆلیس و دەیوەستاندو بە دەنگێکی بەرز لە ڕوویدا دەوەستایەوە:

- چۆن دێنە ماڵەکەمەوە بەبێ ئەوەی موختارتان لەگەڵدا بێت و ڕەزامەندیی دادوەرتان پێبێت؟ ئەی یاسا نالێت لەم کاتانەدا پێویستە موختارتان لەگەڵدا بێت و ڕەزامەندی دادوەریشتان بەدەستەوە بێت؟ بۆچی خۆتان لە سەروو یاساوە داناوە؟

ئۆفیسەرەکە بە نەرمی هەڵسوکەوتی دەکردو بە دەنگێکی نزم و ئاسایی دەدوا بەرامبەر بەو مەدەنیەی پیایا هەڵشاخابوو:

- کاکە گیان، ئێمە لەم ماڵەدا بۆ کەسێک دەگەڕێین گەلێ تاوانی کردووە.
- ڕێگەتان نادەم ماڵەکەم بپشکنن بە مەرجی یاسایی نەبێت.

مەجید گوێی لە هەموو قسەکان بوو بەڕوونی. "بۆ تاوانبارێک دەگەڕێن دانیشتووی ئەم ماڵەیە .. بێگومان تاوانبار لە چاوی ئەوانەوە! ئایا ئەو کەسە عوسمان یان هاشم وە یان مەجید خۆی نیە؟ ئایا ئەمە هیچ ئاڵۆزیەکی تێدایە؟" شتەکە ڕوونە. دوای ئەوە مەجید چاوەڕێی بیستنی شتی زیاتر نەبوو کە لە نێوان پۆلیس و خاوەن ماڵدا دەگوزەرا، بەڵکو زۆر بەخێرایی سەرکەوتە سەر سەربانەکە، لەوێیشەوە پەڕیەوە بۆ سەربانی دووهەم و سێهەم و دەستی گرت بە عەمودێکی کارەباوەو دابەزیە نێو کۆڵانێکەوە کە دەکەوتە پشت ئەو خانووەوە پۆلیس دابووی بەسەریدا. ئا بەم شێوەیە ئەمجارەیش لەدەست پۆلیس هەڵهات. بەڵام هێشتا مەترسیەکە هەر ماوە بۆ هاشم و عوسمانی هاوڕێی. دەی مەجید، خێرا بکەوە گەڕان بەدوایاندا! دەبێت هەرچۆن هەیە بدۆزرێنەوەو ئاگادار بکرێن لە ڕووداوەکە هەتا نەگەڕێنەو ماڵەوەو نەکەونە ئەو تەڵەیەوە.

مەجید بە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە، بە پەلە خۆی گەیاندە ئەو چایخانەو شوێنانەی پێشتر هاوڕێکانی لێدادەنیشتن. ئای کە جێی داخ دەبێت نەیاندۆزێتەوەو بگەڕێنەوەو بکەونە ئەو کەمینەوە کە بۆیان دانراوە! هەر لە ناکاوێکدا ڕەنگی ڕۆشن بووەوە کاتێک بە دانیشتووانی یەکێک لە چایخانەکاندا دەیڕوانی: ئۆخەی، ئەوە هاشمە لە سووچێکی چایخانەکەدا

دانیشتووە. بە خێرایی چووە لای و بە چپە ڕووداوەکەی بۆ باس کرد. هەردووکیان پێکهاتن لەسەر ئەوەی دابەش بن و بکەونە گەڕان بەدوای هاوڕێی سێهەمیاندا هەتا نەکەوێتە دەست دوژمن، هاشم بەرەو ئەو چایخانەو شوێنانەی شکی لێیانەو مەجیدیش دەگەڕێتەوە سەری ئەو کۆڵانەی بۆ ماڵەکە دەچێت تا چاودێریی عوسمانی هاوڕێی بکات و بیوەستێنێت ئەگەر هاتەوە بەرەو ماڵەوە. بەمجۆرە سەلامەتی ئەو هاوڕێیەیش زامن کرا.

چارەکێک تێنەپەڕی هاشم دەرکەوتوو عوسمانی لەگەڵدا بوو بەرەو ئەو کۆڵانەی مەجید لێی وەستا بوو:

- بە سەلامەتی گەڕاینەوە! با بەرەودواوە بگەڕێینەوە.

بۆ کوێ؟ ئەمجارەیش ئەم سیانە بێ ماڵ کەوتنەوە. لەوانەیە هەریەکە لە هاشم و عوسمان جێگایەک بدۆزنەوە بۆ خۆیان. بەڵام مەجید کەسێک ناناسێت لەم شارەداو خاوەنی هیچیش نیە. ووشەکە لای هاوڕێکانێتی و چارەنووسیشی لە دەستی ئەواندایە. دەبێت هەر چاوەڕێی بڕیاری ئەوان بێت. قسە بەردەوامە لەسەر ئەمە. عوسمان کە خەڵکی بەغدا بوو ڕایگەیاند:

- بە شێوەیەکی کاتی، شوێنێک بۆ مەجید مسۆگەر دەکەم لای هاوڕێیەکی کرێکار هەتا تەگبیرێکی باشتر دەکەین.
- هاشمیش ڕایگەیاند: منیش بەدەوری خۆم شوێنێک بۆ خۆم و خۆت دابین دەکەم. دەچینە لای ئەنوەرو جەلال لە ژوورە تازەکەیاندا.

عوسمان لە هاوڕێکەی وون بوو هەتا دوای ماوەیەکی کەم لەگەڵ هاوڕێکەدا بگەڕێتەوەو بە مەجید بڵێت:

- دەتوانیت لەگەڵ ئەم هاوڕێیە بڕۆیت و چەند ڕۆژێک لە ماڵەکەی بمێنیتەوە هەتا چارەسەرێکی باشتر دەدۆزرێتەوە.

- سوپاس. بەڵام تۆیش ڕاونراویت و پێویستت بە شوێنێکە لێی بژیت.
- ئەو شوێنەی بۆی دەچیت بۆ من گونجاو نیە، لەوێ زۆرن ئەوانەی دەمناسن.

ئەمە سێهەمماڵە کە لە ماوەی هەفتەیەکدا لە بەغدا، مەجیدی تێدا دەژی. دەبێت لە دوی دەرچەیەک بگەڕێین لەم ڕێگا داخراوە. چارە نیە، دەبێت مەجید بیرێکی جیدیی لەم کێشەیە بکاتەوە. بەڵام دەبێت ئێستا گوێ بۆ بریاری هاوڕێکانی بگرێت.

- هاوڕێ کرێکارەکەم با بڕۆین. ئامادەم لەگەڵت بێم بۆ هەر کوێیەک دەتەوێت.
- دوام کەوە بەرەو ماڵ. من عەبودم و لەگەڵ دایکم لە ژوورێکدا دەژیم. شوێنەکەمان زۆر بەرتەسکە. بەڵام ئێمەی کرێکار دڵمان زۆر فراوانە.

عەبود کرێکارێکی شیوعی شۆڕشگێری بە حەماس، جۆرێک باسی حیزبەکەی دەکات وەک ئەوەی باسی خۆشەویستترین شتی بکات، خاوەن هەستێکی چینایەتی دروست، سەرباری سادەیی و لاوازیی ئاستە تیۆریەکەی. لەگەڵ مەجیددا کۆڵانێکی تەنگەبەریان بڕی هەتا گەیشتنە بەردەم دەرگایەکی پان کە لە دەرگای گەراجە کۆنەکان دەچوون. مەجید خۆی لە چۆڵایەکی گەورەدا بینیەوە کە پڕ بوو لە پاشەڕۆو منداڵ و ژن. لەنێو منداڵەکاندا ژمارەیەکی کەم هەبوون کە دەبوایە لە پۆلە جیاوازەکانی قوتابخانە بوونایە. بەڵام "هەژاری" لێرەدا هێشتوونیەتەوە بۆ یاری کردن و خۆهەڵگێڕانەوە لەناو خۆڵداو شەڕە جنێوو جارجارە شەڕو لێدان لەگەڵ یەکتر بەدرێژایی ڕۆژەکە. ئەمانە لە منداڵانی زەحمەتکێشەکانی پایتەختی عێراق بوون.

دانیشەو یەک کاژێر لە عەسردا سەیرکە لەو بۆشاییەدا چی دەگوزەرێت. بەبێ شک ژمارەیەکی زۆر ڕووداوی سەیرو سەمەرە تۆمار دەکەیت، ئیتر پێکەنیناوی و حەزین! سی هەتا چل "شەڕ" لە نێوان منداڵاندا، سی هەتا چل تێسرەواندنی دایک و باوکەکان لە منداڵەکانیان، ژمارەیەکی زۆر "پێکادان" ی نێوان ژنان، سەدان سەتڵ ئاوی پیس لە ژنانەوە دەهێنرێنە دەرەوەی ژوورەکانیان و لە گۆڕەپانە هاوبەشە "گشتیەکەدا" دەرژێنرێن، بیست

سی کۆبوونەوەی بچکۆلەی ژنان دەبەسترێت، سەد بەڵغەم لە پیرو پەککەوتەو نەخۆشەوە دەکێشریت بەو زەویەدا. ئەم بینایەی عەبودو دایکی تێدا دەژی، شتی سەیری تێدایە. بیناکە لە "یەک نهۆم" پێکهاتووە، ٣٢ ژووری پێکەوە نووساوی تێدایە کە دەرگاکانی هەموویان لەسەر مەیدانێکی چوارگۆشەی فراواندایە. ٣٢ خێزان لەو ژوورانەدا دەژین، بە خێزانەکەی عەبودەوە.

عەبودو مەجید چەند هەنگاوێک لە ژوورەکەیانەوە دوور بوون، عەبود بە هاوڕێکەی گووت:

- هاوڕێ ئێمە لێرەدا دەژین، لەم "کووچەیەدا". کرێکەی زۆر هەرزانە، ژوورەکانیش هەموویان بە کرێ دراون.
- دەتوانن دوو تیپی تۆپ تۆپێن لە دانیشتوانی ئەم "کووچە" یە دابمەزرێنن!
- هەموو ئەوانەی لێرەدان لە کرێکاران و زەحمەتکێشانن. تیایانایە بێکار "هیچ کارێکیان دەست ناکەوێت، ئەگەرچی خێزانداریشن. دەمانەوێت هانیان بدەین دژی بێکاری، بەڵام بە ئاسانی ناجووڵێنەوە، سادەو دواکەوتوون هەندێکیان نەبێت. دایە! میوانێکی ئازیزمان هاتووە، بەبێ شک دڵخۆش دەبیت بە هاتنی".
- ئەی بەخێر بێنەوە خۆشت و میوانەکەیش، کوڕەکەم-دایکی بەدەم پینەی کراسەکەیەوە وەڵامی دایەوە.

مەجید لە ماڵە تازەکەیدا جێگیر بوو، لە نێوەندی سەختیەکی زۆردا کە ڕێی پێنەدەدا بە ئەرکە حیزبیەکانی هەستێت بە شێوەیەکی گونجاو. ئەم حاڵەتە بێتاقەتکارە بەردەوامە لە "کووچە" کەدا، ئیتر ئەمە لە دەنگەدەنگی بەردەوامەوە لە "خان" هەتا هاواری منداڵان و ژنانیش، دایکی عەبودیش بەردەوام و بەبێ وەستان چەنەی ئەدا. پیرێکی کراوەی دڵ باشی ڕووخۆش، بەڵام تا ئاستی بێتاقەت کردن قسەی دەکرد، هەر ژنێکی ببینیایە دەکەوتە قسە، لەگەڵ هەموو منداڵێکی گۆڕەپانەکەدا، لەگەڵ هەر پیاوێک بەلایدا تێبپەڕیایە.

هەرچەند بۆی بکرایە لەگەڵ مەجید قسەی دەکرد، لەگەڵ کوڕەکەی دەکەوتە قسە هەرکاتێک بگەڕایەتەوە ماڵەوە. ئەگەر کەسی نەدۆزیایەتەوە چەلەحانێی لەگەڵ بکات، لەگەڵ خۆی دەکەوتە قسە کردن، لەگەڵ دیوار، دەرگا، بەڕە ... جارێکیش دەنگی بەرز دەکردەوەو جارێک نزم. بۆ بەدبەختییش، خەڵکی دانیشتوانی کوچە، لە دوودڵی نەدەکەوتن بەرامبەر دایکی عەبود. ئەو دوودڵانە، میوانەکەی نێو ژوورەکەی پیرەژنیان دەبینی و فزولیانە دەکەوتنە تێڕوانینی. ئەوەیشیان لەدەست خۆیان نەدەدا پرسیار لە پیرە بکەن دەربارەی، ئەمە کێیەو چی دەکات لێرە، دایکی عەبودیش بە سادەیی وەڵامی پرسیارەکانی ئەو فزولیانەی دەدایەوە:

- ئەوە خزممانە. لە دەرەوەی بەغداوە هاتووە بۆ چارەسەر، دکتۆر دەرمانی بۆ نووسیووە، ماوەی هەفتەیەک دەیخوات و دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو دکتۆرە. ئای، خۆزگە دەتانزانی چارەسەری لای ئەو دکتۆرە چەندی تێدەچێت! تەنها بۆ پشکنینی، یەک دیناری لێسەندووە! سەیرکەن، دینارێک بۆ پشکنینێک، ئیتر ئەمە بەبێ دەرمان کە لە دەرمانخانە کڕیویەتی! دە خوایە هەژار نەخۆش مەخە. سەیری ئەم زەمانە! ئێمە هەر بۆ دکتۆرەکان کار دەکەین!

ئەگەر پرسیارکەرەکە بوەستایە، ئەوا دایکی عەبود یەک کاژێری تەواو هەر باسی ئەو نەخۆشیە درۆیەو تێچوونی گرانی چارەسەرو بەرزبوونەوەی نرخی دەرمان و هتدی دەکرد. مەجیدیش گوێی بۆ ئەم درۆیانە گرتووە کە ڕۆژانە چەندانجار دووبارە دەبنەوە. مەجید بە تەواوی بێتاقەت بووبوو، چیتر ئاسان نەبوو بۆی نامەو بڕوانامەکان بخوێنێتەوەو ئەوە بنووسێت کە دەیەوێت. بەڵام وایدادەنا کێشەکە سادەیە مادام مانەوەی لێرە وەختیە، تەنها بۆ ماوەی هەفتەیەکە.

- خواحافیز پورەی ئازیز.

- خوا ئاگای لێت بێت کوڕەکەم، ئەمە ماڵی خۆتە، هەرکات حەزت کرد، دەتوانیت بگەڕێیتەوە لامان و لای ئێمە بژیت. خوا سەرتان بخات –ئەمانە ووشەی داپیرەبوون بۆ مەجید. ماڵەکەی جێهێشت و هەرگیز ڕێی لێ نەکەوتەوە.

## لە شارۆچکەیەکی سنووریدا

زۆرجار سەفەر "هەم دیدەنی و هەم بازرگانیە" پێکەوە. مەجید وا بیری دەکردەوە. دوای جێهێشتنی ژوورەکەی دایکی عەبودیش، بارودۆخەکە وایدەخواست. دەتوانێ بچێت بۆ بەعقوبەو چەند ڕۆژێک لەوێ بمێنێتەوە، دەتوانێت بگاتە شاری خانەقین بۆ ئاگاداری پەیدا کردن لە بارودۆخی ڕێکخراوە حیزبیەکەمان و ئامادەی کۆبوونەوەیەکی هاوڕێیان ببێت. لە ماوەی ئەو دیدەنیەدا، هاوڕێیان کار لەسەر چارەسەری کێشەی نیشتەجێبوون دەکەن. ئەمە بیرکردنەوەی مەجید بوو کە لە یەکتر بینینێکدا لەگەڵ هاشم خستیەڕوو. ئەمەی دوایش وڵامی دایەوە:

- منیش پێم باشە. لەگەڵیشت دێم بۆ بەعقوبە.

سبەینێ بەیانی هەردووکیان لەنێو نەفەرەکانی باسێکی تەختەی کۆندا بوون کە لە بەغداوە ڕێگای گرتبووەبەر بەرەو بەعقوبە. ماوەکە لە شەست کیلۆمەتر زیاتر نیە، بەڵام ئەم ئۆتۆمۆبێلە بە دوو کاژێر ئەم ماوەیەی بڕی. وەستان لە "خان بنی سعد" پێویست بوو، ئیتر نەفەرەکان بیانەوێت یانا، ئەمەیش بۆ ئەوەی مەکینەی ئۆتۆمۆبێلەکە بحەوێتەوە.

ئەوان هەردووکیان لە ئۆتێلێکی بچکۆلەدا مانەوە لەوێ، پاگەندەی ئەوەشیان دەکرد کە هاتوون بۆ شاهیدی لە پرسێکدا لە دادگا، مەحکەمەکە سێ ڕۆژ دواخراوە. هاشم دوای دوو ڕۆژ گەڕایەوە بۆ بەغدا، مەجید بە تەنها لە ئۆتێلەکە مایەوە. کەس ناناسێت و

ناشتوانێت پەرتووکە مارکسیستەکان بخوێنێتەوە، هەمووشیان قەدەغەن لەوێ. تەنها کەسێک کە کەمێک بیناسێت، پۆلیسێکی هاتووچۆیە. ئەو پۆلیسە لە هەمان ئۆتێل دادەنیشێت لە ژوورێکی تەنیشت ئەوەوە، هەر ئەویش دەستپێشخەری کرد لە دروستکردنی پەیوەندی و ناسیاریدا لەگەڵ مەجیدی دراوسێی.

- پۆلیسەکە رووی کردە مەجیدو گووتی: وادیارە تۆیش وەک من لێرە نامۆیت.
- بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.
- شارێکی ناخۆشە. پێی دەڵێن ناوەندی پارێزگا، بەڵام ئەوەندە بچووکە کە هەڵناگرێت لە ناوەندی قەزایەک یان ناحیەیەک زیاتر بێت. وا دیارە تۆیش وەک من بێتاقەتیت، یاری دۆمینە دەزانیت؟
- بەداخەوە، هەلی ئەوەم دەست نەکەوتووە فێری ئەو یاریە ببم.
- ئەی تاوڵە؟
- تاوڵەیش نازانم.
- تۆ ئەهلی زەمانی کۆنیت برام! کەواتە با بڕۆم بۆ چایخانەکەو لەوێ یاری بکەم هەتا کاتی خەفارەتەکەم.

ڕۆژی دواتر لاوێکی باڵا بەرز، کراسێک و پانتۆڵێکی کۆنی لەبەرا بوو بە جووتێ نەعلەوە، بۆ دوکانی خەیاتێک دەگەڕا لە بازاڕی ئەو شارۆچکەیەی ئەمە یەکەمجارە پێی تیناوە. ئەوە مەجیدە بۆ ناونیشانی ئەو هاوڕێیە دەگەڕێت کە بە هۆیەوە پەیوەندی دەکات بە ڕێکخراوە حیزبیەکەوە لە خانەقین. ئەم سەفەرە زانیاریەکی نوێیدا بە مەجید: لەو شارەی دەکەوێتە سەر سنووری عێراق-ئێران، خەڵکی بە چوار زمان قسە دەکەن، کوردی، فارسی، تورکمانی، عەرەبی. مەجید لە گەڕاندا بە شارا ووشەی پۆلیسی هاتوچۆکەی بیر کەوتەوە "بەعقوبە بە ناوەندی پارێزگا دادەنێن، بەڵام بچکۆلەیە، بچووکتر لە ناوەندی قەزایەک"! ناوەندی قەزای خانەقین لە ناوەندی پارێزگای دیالە گەورەترە!

مەجید گەیشتە ئەو دوکانەی بۆی دەگەڕا. سێ کەسی لێیە، زەحمەتە هەڵیهێنێت کامەیان خاوەنی دوکانەکەیە کامیان میوان. مەجید پرسی:

- تکایە کاک سەفا ئەحمەد کێیە؟
- منم، فەرموو چیت دەوێت؟ لاوێکی باڵا مامناوەندی وەڵامی دایەوە، ستایڵێکی ڕێک، گەنم ڕەنگ، دوو سمێڵی ڕەشی گەورە.
- عەبدلحەسەن ناردوومی و دەپرسێت ئایا جلەکانی دووررراوەو تەواو بووە –ئەمە نیشانەی نهێنی یەکتر ناسین بوو. سەفا یەکسەر تێیگەیشت و بایەخێکی زیاتریدا بە میوانەکەو بە گەرمی تەوقەی لەگەڵ کرد:
- تۆیش و مامۆستا عەبدولحەسەن بەسەر چاوم. بەدلەکە دوای دوو ڕۆژ تەواو دەبێت، ئەمەیش وەڵامە نهێنیەکە بوو. فەرموو، کەمێک بحەوێرەوە.

لە کاتی جێهێشتنی دوکانەکەدا، مەجید نامەیەکی حیزبی بچووکی دایە دەست سەفای هاوڕێی. لە نامەکەدا هاتووە هەڵگری نامە لە لایەن ناوەندی حیزبەوە لە بەغدا، نێردراوە بۆ کۆبوونەوە بە لیژنەی حیزبی و ئیشرافی ڕێکخراوەکە. هەردووکیان پێکهاتن لەسەر ئەوەی ئێوارە یەکتر ببیننەوە بۆ وەرگرتنەوەی وەڵامی نامەکە، وە ئیتر جیابوونەوە.

مەجید کەوتە گەڕان بەدوای شوێنێکدا بۆ چایەک و نانێکی نیوەڕۆ، مانگیش ڕەمەزانە، ئیتر بەبێ ئەوەی بزانێت قەدەر لەم شارە بچکۆلەیەدا چی لێ شاردۆتەوە. بەهۆی ڕەمەزانەوە چایخانەو ڕێستۆرانتەکان لە ڕۆژدا داخرابوون، جگە لە چایخانەیەکی سەرەکی کە مۆڵەتی بەرپرسانی حکومی وەرگرتووە داینەخات. "نوێنەرە حیزبیەکە" هەر لەو چایخانەیە پیاڵەیەک چای خواردەوەو کەمێک حەسایەوە. لە بیرکردنەوەکانیدا نوقم بووبوو کاتێک کتوپڕ، دوو پۆلیس لە بەردەمیدا ڕاوەستان و یەکێکیان گووتی:

- فەرموو لەگەڵمان بۆ مەرکەزی پۆلیس.
- چیتان لێم دەوێت؟

- داوا کراویت بۆ ئەوێ، پێویست بە قسەکردنیش ناکات. لەوێ هۆکارەکەی دەزانیت.

مەجید زۆر بە پەلە چاوێکی خێرای گێڕا بە دەوروبەریدا، ڕەنگە هەر بە شێوەیەکی نائیرادیش بووبێت. ئەوە چی ڕوویدا؟ ئاوا بەم ئاسانیە کەوتە دەست دوژمن؟ لە شارەکەی خۆی دوژمن نەیگرت کە لەوێ چاک و خراپ دەیناسن، نە لە بەغداو نە لە هیچ شوێنێکی تریش. بەڵام خۆی بە پێی خۆی هاتە ئەم شارە بچووکە تا بکەوێتە تەڵەوە! ئەم کەسێکی جیاوازەو "لە عەدالەت هەلاتووە"، بۆیە لە هەموو کاتێکدا بۆی هەیە بگیرێت. بەڵام گرتنی ئا بەم شێوەیە، شتێکە هەموو دەمارەکانی دەهەژێنێت. ئای لەم "کێکە"! ئەی ئێستا چار چیە؟ ڕاکات لەدەست پۆلیسەکان؟ ئەی بۆ کوێ ڕاکات لە شارێکی بچووکدا کە کەسی تێدا ناناسێت، تەنانەت کۆڵان و دەرچەکانیشی شارەزا نیە؟ بەڵام ئایا واز لە بیری ڕاکردن بهێنێت و خۆی بدات بەدەست فەرمانی واقیعەوە؟ پێویستە هیوای ڕزگار بوون وون بکات؟ نەخێر، نە خۆبەدەستەوەدان و نە بێ هیوایی. لەگەڵ پۆلیسەکان لە چایخانەکە دەچێتە دەرەوەو قاچەکانی دەداتە دەست هەوا، وە ئیتر بزانێت لەوەودوا چی ڕوودەدات. دەبێت ئەم هەوڵە بدات، گەرچی بێگومان، زامنی سەرکەوتنیشی نیە.

باشە ئەی بۆچی ئەم پۆلیسانە توند نەبوون بەرامبەری؟ بۆچی هەر تەنها دوو پۆلیسیان ناردووە بەبێ هاوەڵی مەفرەزەیەک لە پیاوانی پشکنینی تاوانکاری بە مەبەستی گرتنی؟ بۆچی قۆڵیان نەگرت و کەلەپچەیان نەکردە دەستی؟ کەواتە وا چاکە با خاوەخاوێک بکات و لەپێشدا پرسیارێک بکات. ڕەنگە کاتێکی گونجاویش پەیدا ببێت بۆ هەڵاتن ئەگەر پێویستی کرد. بەڵام ئایا دوای ئەمە، دوای ڕاکردن لە دەستی پۆلیس، بچێتەوە بۆ دوکانی خەیاتەکە؟ نا، نابێت بچێتەوە. مەجید لەو دوکانە بوو، لەوێوە ڕۆیشت و لە چایخانەیەک دانیشت، دوای کەمێک ئەم پۆلیسانە پەیدا بوون بۆ گرتنی. بۆیە ڕێی تێدەچێت سەرچاوەی ئەم بەڵایە، خاوەن دوکان خۆی بێت، ڕەنگە خاوەن دوکان بریکاری دوژمن بێت. تا ئێستا هیچ شتێک دیار نیە.

پۆلیسەکان لەگەڵ لاوە بەند کراوەکەدا لە چایخانەکە چوونە دەرەوە، ئەمەی دوایی، چاوێکی گێڕا بە دەوروبەری خۆیداو کەسی تری نەبینی کە لەوێدا نیشانەی ئەوە بێت بەدوایەوەن. کەواتە با پۆلیسەکان بخاتە قسە:

- تکاتان لێدەکەم ئاگادارم بکەن لە هۆکاری بانگ کردنم لە سەنتەری پۆلیسەوە.
- پرسەکە ئاسانە. یەکێک خەبەری لێداویت کە ئێرانیت و بە دزیەوە هاتوویتەتە ناو عێراقەوە. ئەگەر عێراقی بوویت ئەوا هەر یەکسەر بەردەدرێیت، ئەگەر ئێرانییش بوویت، ئەوا فڕێت دەدەنە ئەودیو سنوورو دەچیتەوە بۆ لای کەسوکاری خۆت. داوای پێناسەیەک یان کەفیلێکت لێدەکەن.
- تاوانێکی سەیرە! من عێراقیم بە باوک و باپیرمەوە، هیچ بیانوویەکیش نیە بمبەن بۆ سەنتەری پۆلیس.
- ئێمە بە فەرمانی ئۆفیسەری سەرا هاتووین، ناتوانین لە هیچ فەرمانێکی سەرۆکەکەمان یاخی بین. دەتوانیت لەوێ لەگەڵ ئۆفیسەرەکە خۆی ڕێبکەویت.
- برام وازم لێبێنن، بە ئۆفیسەرەکەیشتان بڵێن کە دڵنیابوون لە پێناسە عێراقیەکەم و بەرتانداوم. نابینین عێراق نەسڵم؟
- ئۆفیسەر دەفتەری نفوسەکەت یان پێناسەکەت دەبینێت و ئیتر ئەوە بەسەو دوایش کەس دوات ناکەوێت. مەجید دینارێکی دەرهێنا بۆ پۆلیسەکان هەتا وازی لێبهێنن و بەری بدەن. دینارێکی تەواو مەبلەغێکی کەم نیە. بێ ئەقڵیە ئەگەر ڕەتی بکەنەوە. ئەم دینارەیان لەکیس بچێت، زیانێکی گەورەیە. بەڵام چارەنووسیان چی دەبێت ئەگەر ئۆفیسەرەکە بەم بەرتیلە بزانێت!
- برام، ئەگەر بەدەست ئێمە بوایە هەر ئێستا بەرمان دەدایت. بەڵام لەو سیخوورە ئەعلەتیە دەترسین، لە ئۆفیسەر دەترسین. ئۆفیسەرەکە هەموو ڕۆژێک مەبلەغێکی گەورە بەرتیل وەردەگرێت و لە کەسیش ناترسێت. بەڵام

سزای توندی ئێمە دەدات ئەگەر پاکەتە جگەرەیەک لە کەسێک وەربگرین و پێمان بزانێت.

ئای لەم موسیبەتە! مەجید هیچ پێناسەیەکی پێ نیە. لەوانەیە پێستی بگورون هەتا عێراقێتی خۆی دەسەلمێنێت. ڕەنگە ئەمە لە فەرمانگەی پۆلیس شتی زۆر لێبکەوێتەوە، لەوانەیە هەر خۆی بیناسێت، ئەوجا پرسەکە لە تۆمەتی ئێرانی بوونەوە دەبێتە تاوانی شیوعیەت. ئەمە شتێکی دەگمەنە، بەڵام ڕێدەکەوێت ڕوو بدات، هەروەک چۆن زار لە یاریی تاوڵەدا بە قسەی یاریکارەکەی دێت. بە هەرحاڵ، لە شار هەندێ ناسیارو خزمی مەجید هەن. ناوێکی تر بۆ خۆی دادەنێت و هانایش بۆ یەکێک لەوان دەبات بۆ دەرباز بوون لە دەست پۆلیس. دواییش دەگەڕێتەوە بۆ دوکانی خەیاتەکە بۆ پەیوەندیی کردن بە هاوڕێیانەوەو ئاگاداریی پەیدا کردن لەسەر بارودۆخی ڕێکخراوەکە بەر لە گەڕانەوەی بۆ بەغدا.

ئەم بەناو ئێرانیە، برا بۆ ژووری فەرماندەی پۆلیس. پۆلیسەکان سڵاوی سەربازیانەی خۆیان کردو یەکێکیان گووتی:

گەورەم! ئەمە ئەو کەسەیە کە خەبەری لێدراوە گوایە ئێرانیەو بەدزیەوە هاتۆتە ژوورەوە. لەسەر فەرمانی جەنابی ئۆفیسەر گرتوومانەو هێناومانە. پاگەندەی ئەوە دەکات ئەسڵی عێراقیە.

- ئەسڵ؟ مفەوەزەکە ڕووی کردە مەجید: ناوت چیەو چی دەکەیت لێرە؟ عێراقیت یان ئێرانی؟
- ناوم سەعید محەمەدە (ئەمە ئەو ناوە بوو مەجید بۆ خۆیی هەڵبژارد بوو)، عێراقیشم لە باوک و باپیرمەوە. لە کەکوکەوە هاتووم و بەدوای کاردا دەگەڕێم لە کۆمپانیای نەوتی ئێرە.

- دەفتەری نفوسەکەت یان هەر بڕوانامەیەکی ترم بدەرێ کە عێراق بوونت دەسەلمێنێت. هەموو ئەو ئێرانیانەی دەگیرێن پاگەندەی ئەوە دەکەن کە عێراقین.
- دەفتەری نفوس هەڵناگرم. کەس لەلای ئێمە دەفتەرنفوسەکەی هەڵناگرێت بۆ کاروباری فەرمی نەبێت لە فەرمانگە حکومیەکاندا. جگە لەوەیش پۆلیس داوای پێناسە لە هاوڵاتیان ناکات.
- ئەوە ڕاستە بۆ ئەو ناوچانە. بەڵام ئێرە ناوچەی سنووریە، دەبێت هەموو کەس دەفتەری نفوس هەڵبگرێت هەتا عێراقی و بێیانی لێک جیابکەینەوە.
- ئەگەر جارێکی تر گەڕامەوە دەفتەری نفوسەکەم هەڵدەگرم.
- مفەوەز ڕووی کردە پۆلیسەکە: ئا جارێ بیپشکنن. گیرفانی مەجید گەڕان و هیچیان نەدۆزیەوە پێنووسێک و چەند دینارێک نەبێت. ئێستا دەبێت کەفیلێک بهێنێت شاهیدی بدات کە تۆ عێراقیت و ببێتە کەفیلت هەتا بەرت بدەین. یان ئێمە بە گیراویی دەتنێرین بۆ شارەکەی خۆت کە کەفیلێک پەیدا بکەیت یان پێناسەیەک نیشان بدەیت لەوێ.

هەوڵەکانی "سەعید محەمەد" مفەوەزی ڕازی نەکرد.کە وازی لێبهێنێت و بەبێ کەفیل بەری بدات، بە تۆزێ پارەیش بەری نەدا. بردیان لەبەر دەرگای گرتووخانەکەیاندا بیخەنە ژێر چاودێریی، دەوامی فەرمی ئەو ڕۆژە کۆتایی هات. فەرماندەی پاسەوانەکانی گرتووخانەکە پێی گووت ئۆفیسەری خەفەر دوای کاژێرێک دەگاتە ئێرە، ئەوکاتە دەتوانێت کەفیلێک بهێنێت و کۆتایی بە مامەڵەکەی بهێنێت.

- بەڵێ باشە. تکایە بە پۆلیسێک بڵێ با بچێت ئەو کەفیلە بهێنێت کە لەم ناونیشانەیە.

مەجید فایەق ناوێک دەناسێت، خەڵکی شارەکەی خۆیانەو برادەری منالیەتی، ئێستا بەهۆی نەقڵی باوکیەوە لەوێوە بۆ ئەم شارۆچکەیە، چەند ساڵێکە لە خانەقین دەژی.

بێگومان فایەق کەفالەتی دەکات و لەم گرفتە دەربازی دەکات. ئەوا پۆلیس لەسەر داوای مەجید کەوتەڕێ بۆ هێنانی فایەق بۆ فەرمانگەکە. کاتێک کەفیل دەگات ئۆفیسەریش دەگات.

فایەق لەگەڵ پۆلیس هات و مەجید بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد، ئیتر ئەمە وەک هەرکەسێک کە هاوڕێیەکی مناڵی دەبینێتەوە. هەر لە یەکەم چرکەساتیشدا چپاندی بە گوێی کەفیلەکەیدا: "بیرت نەچێت، لێرە خۆمم ناو ناوە (سەعید محەمەد)، خۆ گومانی تێدا نیە یارمەتیم دەدەیت".

- فایەقیش چپاندی: "ئەترسم، ئەترسم". ئینجا بە دەنگی بەرز ڕایگەیاندو هەرچییش لەوێ بوو گوێی لێ بوو: "من ئەم کەسە ناناسم و ناتوانم ببمە کەفیلی".

مەجید لەم هەڵوێستەی فایەق سەرسام نەبوو کە ئینکاری ناسینی ئەوی کرد. بارودۆخەکە قورسە، ئەویش بەڕاستی دەترسێت، لە ستەم و تێرۆر دەترسێت. لەژێر زەبری ترسدا ئینکاری برادەرەکەی کردو یارمەتی نەدا بۆ دەرباز بوونی لەو نشێوە. بەدەم بەرێ کردنیەوە مەجید بە دەنگێکی لەسەرخۆ گووتی:

- فایەق دەتوانیت بە شێوەیەکی تر یارمەتیم بدەیت. سوپاست دەکەم ئەگەر یارمەتیم بدەیت. بچۆ بۆ دوکانی عەلای خزممان لە بازاڕ، پێی بڵێ من، سەعید محەمەد، دەمەوێت بێت و ببێتە کەفیلم هەتا پۆلیس دڵنیا بێت من عێراقیم نەک ئێرانی. ناوەکەمت بیر نەچێت، سەعید محەمەد، هەتا عەلاء لەبیری بێت و بەزوویی بێت.
- هەموو شتێک تێگەیشتم. بە چەند خوولەکێک عەلاء دەنێرم بۆ لات. خواحافیز!

فایەق گفتەکەی بردە سەر. عەلاء دوای چارەکێک گەیشتە فەرمانگەی پۆلیس، هەر لە دوورەوە مەجیدی خزمی بینی و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

- ئای بەخێر بێیت سەعید محەمەد. ئەی بۆچی هەر یەکسەر داوات نەکردم؟ بۆچی فایق بانگ دەکەیت بێتە کەفیلت کە ئێمە لێرەین؟
- نەمویست ببمە هۆی ماندوو کردنتان. بەڵام دواجار بارودۆخەکە هەر ناچاری کردم.

هەردووکیان پێکەوە چوونە ژووری ئۆفیسەر هەتا دوو پیاڵە چا بخۆنەوە. هەر دوای چەند خوولەکێکیش ژووریان بەجێهێشت و ئۆفیسەر خواحافیزیی لێکردن و بە داوای لێبووردنیشەوە گووتی:

- ببوورە کاک عەلاء، نەمانزانی ئەم پیاوە خزمی ئێوەیە.

سەعید محەمەدیش بە هەلی زانی بڕوانامەیەکی ڕێ لێنەگرتن (عدم التعرض) لە پۆلیس خۆی وەربگرێت هەتا لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ بەغدا لە ڕێگا "بەزم" ی پێنەگێڕن. یەکەم شتێکیش کە بیری لێدەکردەوە دوای بەردانی، گەیشتن بوو بە دوکانی خەیاتەکە.

(عەلاء) ی خزمی نەیدەزانی مەجید شیوعیەو ڕاونراوە، لێیشی نەپرسی نەڕێ بۆچی ئەم ناوە تازەیەی لە خۆی ناوە لەم شارە. ئەمانە هیچی گرنگ نیە بەلایەوە. ئەو خزمێتی، پەیوەندیی خزمایەتییش پێشکەش کردنی ئەم یارمەتیەو زیاتریش دەخوازێت. ئایا بۆ پیاوێکی وەک عەلاء دەستدەدات یارمەتی خزمێکی نەدات کە پێویستی بە یارمەتیەتی؟ قەدەر وای ڕێکخستووە عەلاء لەم شارە بژی و کار بکات، بەڵام نە شوێنە نەسڵیەکەی خۆیی بیرچۆتەوەو بیر دەچێتەوە نە خزمەکانی ئەو شوێنەیش.

- عەلاء بە توونێکی زۆر ئاسایی پرسی: ئێستا، ئەزیزم مەجید، پێم بڵێ لە کوێ کار دەکەیت؟

- له کۆمپانیای نەوت لە کەرکوک.
- حامیدی خزمیشمان لەوێ کار دەکات. حانوتێکی گرتووە لەوێ. بێگومان دەیناسیت و یەکتر دەبینن.
- بێگومان، دەزانم —ئەمە وەڵامی مەجید بوو. تووشی شڵەژان هاتوو ویستی بابەتەکە بگۆڕێت —زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو یارمەتیەت. ڕێم بدە با بڕۆم هەندێ لە کاروبارەکانم جێبەجێ بکەم.
- ئەوە مەحاڵە. هەر ئێستا دەچینەوە بۆ ماڵەوە، تۆ میوان نیت، هەر کەسی ماڵەکەیت.
- دوای جێبەجێ کردنی کارەکەم دەگەڕێمەوە بۆ لاتان، کاری برادەرێکمە. بۆ نانی ئێوارە دێم.
- زۆر باشە. ئەمە ماڵی ئێمەیە. ئەو دەرگایەیە کە لێی نزیک بووینەوە.

ئێوارە مەجید بەدەم ڕێگاوە بەرەو ماڵی عەلای خزمی، بیری دەکردەوە بەم ستایڵە خراپەوە، هەفتەیەکی تەواوە ڕیشی نەتاشیوە، کراسێکی کۆنی لەبەردایە کە ئارەق و پیسی، ڕەنگە ئەسڵیەکەیان داپۆشیوە. پانتۆڵێکەیشی لە کراسەکەی باشتر نەبوو، جووتێ نەعل کە ڕۆشنبیران لە ماڵی خۆیاندا نەبێت، بەکاری ناهێنن. یەک مانگ تێپەڕیوەو بیرێکی لە ستایلی خۆی نەکردۆتەوە. بەڵام ئێستا بیری لێدەکاتەوەو حەزیشی دەکرد ئەوە بکات ئەگەر لە بارودۆخێکی باشتردا بوایە!

مەجید ئێوارە لە ماڵی عەلای خزمی، خواردنێکی مومتازی خوارد، دەمێک بوو لەو خواردنەی نەخواردبوو. وە هەر لەوێ، برادەرەکەی مناڵیشی، فایەق، هات بۆ سەردانی، ئەو برادەرەی کە بە ڕۆژ لە سەنتەری پۆلیس گووتی نایناسم، باوکی فایەقیش هات. هەموو شتێک باسکرا سیاسەت نەبێت! ئەمە ئێوارەوەختێکی دەگمەن بوو لەو ئێوارانەی مەجید ماوەیەکی درێژ بوو نەیبینی بوو، ئێوارەیەک بەبێ باسی حیزبی و سیاسی. فایەقیش تاکە

کەسە کە "پیشە" ڕاستەقینەکەی مەجیدی برادەری دەزانێت، بەڵام خۆی لێ بێدەنگ کردبوو، سووریش بوو لەسەر ئەوەی ئاشکرای نەکات.

سفرەکە پڕ کرا لە چاکترین میوە بۆ میوان و پێشکەش کرا بۆ خواردن. مەجید نەریتە ئاساییەکەی ئەم خەڵکەی شکاندو چەقۆو چەتاڵی بەکارهێنا. ئەمەیشی بەبێ مەبەست کرد. پەنجە درێژەکانی دەبرد بۆ ترێ و قۆخ و سێوو شووتی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە تێڕوانینی سەرسووڕماوانەو پێکەنینی گاڵتەجاڕی کە ژنی ماڵەکەو مناڵەکانی تەقاندیانەوە. پێبکەنن بە ئارەزووی خۆتان! میوانەکەتان گوێ بەو پێکەنینە نادات. بەیانی جێتان دەهێڵێت و جارێکی تریش ناگەڕێتەوە.

مەجید لە جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکەی و کۆبوونەوە بە هاوڕێیان، سەرکەوتوو نەبوو. لە کاتێکا شاری جێدەهێشت، بەوەی زانی هاوڕێیانی لێرە بە ڕووداوەکەیان زانیبوو، هەوڵیشیان دابوو ڕزگاری بکەن و بگەنە لای و بیگێڕنەوە بۆ عێراق لە حاڵێکدا ئەگەر پۆلیس فریێدایە ئەودیو سنوور.

ڕۆژی دوایی دوو لاو بە یەکێک لە کۆڵانەکانی گەڕەکی (بنی سعید) دا لە بەغدا دەڕۆیشتن، هەروەک هەمیشەیش لە کاروباری حیزبی و سیاسی خۆیان دەدوان. ئەوانە مەجیدو هاشم بوون.

## سەرلەنوێ لە بەغدا

- مەجید پرسی: ئامەمان لە پارێزگاکانەوە بۆ هاتووە؟
- لە حلەو هەولێرو بەسرەوە، هەموویان لەیەککاتدا.

- هیچ شتێکی تازە هەیە دەربارەی بارودۆخی هاوڕێیانمان و ڕێکخراوەکانمان لەو شارانە؟
- بەرەو باشتر دەڕۆن.

مەجید نامەکانی وەرگرت. ناتوانێت لەسەر شەقام و لە چایخانەکاندا بیانخوێنێتەوە. دوکانێکی گونجاویش نیە تیایا دانیشێت بۆ خوێندنەوەیان. بوەستە! وا چاکە بچێتە ئەو مزگەوتەی لێیەوە نزیکەو کاتێکی نائاسایی لە (بیت الماء) دا بباتەسەرو نامەکانی تێدا بخوێنێتەوە. ئەمە لە ڕۆژانی داهاتوویشدا، لەژێر زەبری پێویستی و لە چاوەڕوانی جێگایەکی گونجاودا بۆ نیشتەجێ بوون و کار کردن، دووبارە بۆوە.

- مەجید پرسی: ئەی کێشەی نیشتەجێ بوون، هاوڕێ؟
- تا ئێستا هیچ سەرکەوتنێکمان بەدەست نەهێناوە. دەتوانیت لەلای ئێمە بخەویت بەشێوەیەکی وەختی هەتا چارەی دەکەین.

"دەبێت لە ئێستاوە خۆم ئەم کێشەیە چارەسەر بکەم -مەجید لەگەڵ خۆی بیری دەکردەوە- بۆچی ئەنوەر دەتوانێت ژوورێکی تر بۆ خۆی بەکرێ بگرێت، بۆچی مەجید نەتوانێت"؟

دوای کەمتر لە کاژێرێک، ئەم لاوە نامۆیە بە بەغدا، لە کۆڵانێکی حەیدەرخانە بەدوای ژوورێکدا دەگەڕا بەکرێی بگرێت بۆ خۆی. ڕۆژی دوایی کەوتەوە گەڕان و ئەوەی دەستکەوت کە دەیەویست.

- مامە گیان، ناتوانم لە نیو دینار زیاتر بدەم بە کرێی مانگانە –مەجید گووتی.
- کوڕەکەم، ئەم ژوورە بە دینارو ڕوبعێک دەدەم بەکرێ. بەڵام مادام تۆ مرۆڤێکی باشیت، هەر دینارێکت لێوەردەگرم.

ڕێکەوتنەکە لەسەر کرێی مانگانە بە سێ ڕوبع [٧٥٠ فلس] کۆتایی هات! مەجید ئەوەیشی بۆ ڕوون بۆوە، پەیدا کردنی شوێنێک بۆ ژیان زۆر ئاسانە. لۆمەیەکی خۆیشی کرد کە پێشتر ئەم سەرنجەی لەلا دروست نەبووبوو.

شەو دانەهاتبوو مەجید لە ژوورە تازەکەیدا، لەسەر تاکە لێفەیەکی کۆن کە لە هاوڕێیانیەوە بۆی مابۆوە، خۆی لێڕاکێشا بوو. نە بەتانیەکی هەبوو نە لە هاوینی بەغدایشدا بەتانی پێویستیەکە، پشتیەکیشی نەبوو. بۆیە لە ڕۆژدا نەعلەکانی پێڵاو بوون، بەشەویش پشتی. هیچ شتێکی ناومالێشی نەبوو جانتایەکی کۆن نەبێت بۆ بڵاوکراوەو بڕوانامە حیزبیەکان. شتەکانی بە کرێی شەربەیەک و پەرداخێکی ئەلەمنیۆم زیاد بوو.

ژوورەکە لە شوێنێکی "ستراتیژی" دا، بەسەر دەرگای خانوەکەوە بوو، پەنجەرەیەکیشی هەبوو لەسەر کۆڵانەکە. دروا‌سێی نەبوو ژوورێکی بچکۆلەی تر نەبێت کە ژن و مێردێکی بە تەمەنی تێدا دەژیا. پیاوەکە کارگوزاری پاککەرەوە بوو لە شارەوانی، بەیانیان لە ماڵ دەردەچوو عەسر دەگەڕایەوە. دڵخۆش بە پیشەکەی وەک ئەوەی هەموو پێویستیەکی دەستکەوتبێت. ژنەکەی فارسێکی بەساڵاچووی لووت درێژو لەش گران بوو، تەنها بێ منال، بە عەرەبیەکی شکاو قسەی دەکرد. کەس نازانێت ئەم ژن و مێردە چ ڕێکەوتێکی سەیر کۆی کردوونەتەوە جگە لەوانەی لە غەیب دەزانن. لەژێر ژووری ئەو کارگوزارەوە داڵانێکی تر هەبوو دەچووە سەر گۆڕەپانی سەرەکی خانوەکە کە لە ١٦ ژوور پێکهاتبوو ١٦ خێزانی تەواویان تێدا دەژیا. لەو خانوەدا هەرواهوریا بێوەستان و پێکادانی نێوان منالان و ژنان و گۆرانی ووتنی ئەوانەیشی هیچیان لە هونەری گۆرانی نەدەزانی بەردەوام بوو.

ژوورەکەی مەجید جیاوازیەکی گرنگی تریشی هەبوو: دەرگایەکی تەختە لە نێوان ژوورەکەی و ژووری دروا‌سێکەیدا. لەو ژوورەدا مامەی خاوەن خانوو خۆی دەژیا، خاوەنی ئەو خانووەی ژووری داوە بە کرێ بە مەجیدو ئەوانی تریش. ئەگەر دایان بەسەر ئەم ژوورەی "خان" یشدا، ئەوا مەجید دەتوانێت ئەو دەرگایە بکاتەوە یان بیشکێنێت و دزە بکات بۆ

ژوورەکەی مامەو لەوێوە بۆی دەرچێت. ئەمە شتێکی گرنگ بوو مەجید بیری لێدەکردەوەو سووریش بوو لەسەری، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەمە لەلای هیچ بوونەوەرێک بدرکێنێت.

مامەی گەورە جارجار سەری مەجیدی دەداو لەگەڵیدا دەدواو پێی خۆش کە ڕێزی لێدەگرت. دەهات و خۆی بەسەر گۆچانەکەیدا دەچەماندەوە، مێزەرێکی سەوزو جبەیەکی پاکوتەمیز، لە ژێریەوە کەوایەک لە نەریتی کۆنی بەغدایی. چەمابۆوەو شتێک لە پشتیەوە بەرز بووبۆوە، لووتێکی بچکۆلەی هەڵکشاو لەگەڵ دوو چاوی بچووک، بەڵام بە تەندروستیەکی باشەوە، خانوە بەکرێدراوەکەیشی بە داهاتێکی باش، ژیانێکی گونجاو بۆ خێزانەکەی مسۆگەر دەکات، ئەمە ئەگەرچی بەردەوام بۆڵەی بوو لەدەست کەمی داهاتەکەی و گرانی ژیان و بەرزبوونەوەی نرخ، بۆڵەی بوو لەدەست بێتوانایی لە دانەوەی قەرزە کەڵەکەبووەکانیدا!

* * *

مەجید توانی کارە حیزبیەکانی بەشێوەیەکی باشتر لە ڕابووردوو دەستپێبکات. ئاگاداریەکی ڕێژەیی لە پاشماوەی ڕێکخراوەکانی حیزب لە لایەک و "جێگیر" بوونی ڕێژەییشی لە جێگای نیشتەجێ بوونیدا لە لایەکی ترەوە، یارمەتی بوون بۆی. هاشم تاکە کەس بوو کە ژوورەکەیی دەزانی و ڕۆژانە سەری دەدا، ئەمە جگە لە یەکتر بینینیان لە شەقامەکاندا، ئێستا ئیتر دەتوانێت نامەکان بخوێنێتەوەو ئەوە بنووسێت کە دەیەوێت.

تیرۆری پۆلیسی کەمی نەکردبوو لەسەر بزووتنەوەی شۆڕشگێری، هێزە کۆلۆنیالیستیە-کۆنەپەرستەکەیش هەر بەردەوام بوو لە هەڵمەتە سەرکوتکارەکانیدا دژی حیزبی شیوعی. دادگای (نەعسانی) وازی لە ناردنی فەوجی نوێی خەباتگێڕان نەهێنابوو بۆ نێو زیندانەکان. بەڵام ئەندامە چالاکەکانی حیزب، وورده وورده خەریکە شۆکی لێدانە یەک لە دوای یەکەکان بەرباندەدا، بەهێزێکی زیاترەوە ڕادەپەڕن بۆ کار کردن، بەرامبەر بە تیرۆری دوژمن دەوەستنەوە، هەوڵی دامەزراندنەوەی ڕێکخراوە حیزبیەکان دەدەن لە هەموو شوێنێک، لە

بەغدا، لە کوردستان، لە خوارووی وولات و فورات، پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەک لە ڕێکخراوەکان لە پارێزگاکانی –بەسرە، سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، زۆری تریش دروست بۆتەوە. بەڵام برینەکە هێشتا نەستوورە، زحمەت بوونی کارەکان گەورەترو هەمەجۆر تر بوون، وە هێشتا لێرەو لەوێیش، لێدانی نوێ ئاراستەمان دەکرێت لەلایەن هێزە سەرکوتکارەکانەوە.

لە پایتەخت، بارودۆخی ڕێکخراوی حیزبی کەمێک باشتر بوو، کەسانی شۆڕشگێری بە حەماس دەردەکەوتن کە سەرکردایەتی پاشماوەی ڕێکخراوە حیزبیەکانیان دەکرد، لە نێوەندی بارودۆخێکی سەختدا، بە جیدیەتێکی زۆرەوە، کاریان دەکرد لە پێناوی دروستکردنەوەیدا. لە ڕێکخراوی حیزبی بەغدا، هاوڕێ ئەمین دەردەکەوت، لاوێکی کرێکاری شۆڕشگێر کە هەر تۆپەڵێک حەماس و زیندوویەتی بوو، بەدرێژایی هەموو ڕۆژەکە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانە حیزبیەکانی هەڵدەسووڕا، گەرچی لە خەباتی ژێرزەمینیدا بوو. لە ڕێکخراوەکانی گەڕەکی کازمیە دوو هاوڕێی چالاک دەرکەوتن، یەکێکیان کرێکارێکی بە حەماس و دووهەمیان خوێندکارێک کە لەبەر ڕاوودونان وازی لە خوێندن هێنابوو؛ هەموو هەوڵی خۆی بۆ کاری حیزبی تەرخان کردبوو. لەناو قوتابیانیشدا هاوڕێیەک دەرکەوت کە لە نامە حیزبیەکاندا نازناوی ژمارە (٩٩٩) مان پێدا بوو، یەکێکی تریش کە زۆر بە حەماس بوو سەرباری سەرچاوە چینایەتیە-ئۆرۆستۆکراسیەکەی، نازناوەکەی سەمیر بوو. لەنێو ڕۆشنبیرانیشدا دوو گەنجی بە خوێنگەرم دەرکەوتن، هەردووکیشیان کارگوزار بوون لە دامودەزگای نیمچە فەرمیدا (عازم و جەمیل). لە ڕێڕەوەی کار کردنیشدا، بەردەوام دەموچاوی نوێ دەردەکەوتن و ئەڵقەی کەسە چالاکەکانیان فراوان دەکرد. تۆڕێکی نوێ لە کادری حیزبی تازەپێگەیشتوو پێکدەهات و لە بنکەی حیزبیەوە سەریهەڵدەدا.

مەجید پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ڕێکخەری چەند شانەو هێڵێکی حیزبیدا پێکهێنا، ئەمە لەگەڵ پەیوەندیی بە نامە لەگەڵ هاوڕێیانی تر. هەموو ڕۆژێک نامەیەک لە (٩٩٩)

ەوە دەگەیشت، لە نووسینیشدا چالاک بوو، هەموو شتێکی گەورەو بچووکیشی بۆ حیزب دەنووسی. هاوڕێ کرێکارەکەیش (ئەمین)، سەرە قەڵەمەکانی خۆیی ئامادە دەکرد دەربارەی هەرچی کە دەیەویست لە یەکتر بینینەکانیدا لەگەڵ مەجید باسی بکات.

ژمارەیەکی نوێی بڵاوکراوەی "الصراع" دەرچوو، هاوڕێ چالاکەکان لە هەموو هێڵە حیزبیەکانەوە کەوتنە نووسینەوەی و دابەش کردنی. ئاستی بڵاوکراوەکە سادە بوو، ووتارو ووشەکانیشی لە هەڵە بەدوور نەبوون. سەرباری هەموو شتێکیش، پێناسەی بڵاوکراوەکە دەلیلی شتێکی نامۆ بوو: "زمانحاڵی چینی کرێکاری عێراق" نەک زمانحاڵی حیزبی شیوعی. بۆچی؟ کەس بیری لەوە نەکردبۆوە! ئەم هەموو شتە، ڕاوێژێک یان کێشەیەکیان دروست نەکرد لە ڕێکخراوەکانی حیزبدا، هەموان لەو شۆڕشگێرە سادانە بوون کە کەوتبوونە نێو کارکردنەوە بۆ سارێژی برینەکان و دامەزراندنەوەی ڕێکخراوەکان.

- هاوڕێ، ئەمە نامەیەکی پەلەیە لە بەندیخانەوە نێردراوە! – ئەمە لە هاوڕێیەکەوە بوو کە نامەکەی دایە دەست مەجید. ئەویش پرسی:
- کێ هێناویەتی بۆمان؟
- خێزانی هاوڕێیەکی بەندکراو کە چۆتە سەردانی کوڕەکانی و ئەوانیش نامەکەیان داوەتێ.
- جێی دڵخۆشیە. ئەی دەتوانرێت وەڵام بە هەمان خێزاندا بنێردرێتەوە؟
- بێگومان. لە هەموو سەردانێکی مانگانەدا، دەتوانین هەرچیمان دەوێت بەو خێزانەدا یان خێزانی تر بینێرین.

کەواتە دەتوانین ژمارەیەکی نوێ بخەینە سەر ژمارەی ئەو ڕێکخراوە حیزبیانەی تا ئێستا پەیوەندییان لەگەڵدا پەیدا کراوەتەوە. ئەوەیش ڕێکخراوی زیندانە، ڕێکخراوی یەکێک لە زیندانەکان. هەر دوای هەفتەیەکیش لەوە، ئەو دوو لاوە لە یەکێک لە شەقامە فەرعیەکاندا لە بەغدا یەکتری دەبینن و قسەوباسێکی کورت لە نێوانیاندا دێت و دەچێت،

یەکێکیان نامەیەکی بچووکی پێچراوە لە فۆرمی چکلێتدا دەداتە دەستی ئەویان -"دەبێت باش بشاردرێتەوەو بگەیەنرێتە دەست هاوڕێیان بە سەلامەتی". ئەو دوانە مەجیدو سەبار بوون. ئەمەی دواییان نامەکەی وەرگرت کە بە دایکیدا دەینێرێت بۆ هاوڕێیان لە زیندان، لەوانە یەکێکیان کوڕەی خۆیەتی.

* * *

کێشەکانی ژیان زۆرو هەمەچەشنەن. کێشەیەک کۆتایی نایەت یەکێکی تر سەرهەڵدەدات! دەبێت پێکەوە گونجانی خەباتگێڕانی حیزب بەهێز بێت، بەتایبەت لە ڕۆژانی میحنەتدا. مەجیدو هاشم ماوەیەک پێکەوە دەگونجان. بەڵام ئەم پێکەوە گونجانە تەمەنێکی درێژی تۆمار نەکرد، پەیوەندیەکەیان ساردو ناخۆش بوو بوو، دوای چەند هەفتەیەکی دیاری کراویش لە بینین و کار کردن پێکەوە، پەیوەندییان نارێکی تێکەوت. پێکدادانیان لەگەڵ یەکتر لەڕێڕەوی کار کردندا بوو، ئەمەیش بەهۆکاری جیاوازییان لە بۆچوونەکانیان و چارەسەرەکانیان بۆ ئەو کێشانەی ڕووبەڕوویان دەبۆوە. هەریەکەشیان دەرئەنجامەکانیان دەخستە ئەستۆی ئەوی تریان. کەسیش نەبوو لەو ڕووەوە حوکمێک بدات، نە لیژنەیەک نە تاکێک. بۆیە پەیوەندیەکە بەرەو باش بوون نەدەچوو.

مەجید هەر دوای چەند ڕۆژێکی کەم لە جێگیر بوونی لە ژوورە تازەکەیدا، کەوتە گرفتێکی تریشەوە. ڕاستە دڵخۆش دەژی لەم ژوورەدا، کەمی شتومەک و خۆراک و شتی تری بەلاوە گرنگ نەبوو. بەڵام ناکرێت هەموو کاژێرەکانی شەوو ڕۆژی لەو ژوورەدا بەسەر بەرێت. ڕۆژ لە کوێ بباتە سەر؟ ئەگەر لە کاژێرەکانی ڕۆژدا لە ژوورەکەی بێت دەبێتە جێی گومان و پرسیاری خاوەنی خانوەکەو دراوسێکانی. ئەگەر تەواوی ڕۆژەکەیش لە چایخانەکاندا بێت یان بە کۆڵانەکاندا بسوڕێتەوە دەبێتە مەترسی بۆی، ئەمە جگە لە ماندووبوونێکی بێ هۆو ڕێگر لە کارە حیزبیەکانی. کەواتە دەستکەوتنی ئەم ژوورە، کێشەکەی مەجیدی چارەسەر نەکرد، ئیتر با کێشەکەی کەم کردبێتەوەو چارەسەرێکی تێدا بووبێت. پێویستە

بارودۆخێکی باشتری هەبێت هەتا توانای هەستانی هەبێت بە ئەرکە حیزبیەکانی. دەبێت چی بکات؟ چارە ئەوەیە ژوورێکی تریش بگرێت بە کرێ، بێگومان لە گەڕەکێکی تر جگە لە حەیدەرخانە. ئەگەر ئەم دوو ژوورییە توانای ئەوەی بۆ بڕەخسێنێ ڕۆژەکە لە یەکێکیان بەسەر ببات، ئەوا دەتوانێت بڵێت بە شەو کار دەکات، ئێوارەیش دەگەڕێتەوە بۆ ژووری دووهەم و دەڵێت بە ڕۆژ کار دەکەم. ئەمە تاکە چارەیە لە بارودۆخێکدا کە توانایەکی لەمە باشتری تێدا بەرجەستە نابێت.

دوو ڕۆژ تێنەپەڕی مەجید ژووری دووهەمی دەستکەوت لە (باب الشیخ)، ژوورێکە لە حەوت ژوور کە هەریەکەیان خێزانێکی تێدا دەژی. مەجید کاتێک ژوورەکەی بەکرێ گرت، پاگەندەی ئەوەی دەکرد لە ماوەی هەفتەیەکدا خێزانەکەی دەهێنێت. وە ئیتر ئێستا دەتوانێت شەوان لە ژوورە تازەکەی بمێنێتەوە کە هیچی تێدا نیە پێخەفی نوستن نەبێت. کاژێرەکانی ڕۆژیش هەمووی، دەگەڕێتەوە ژوورەکەی لای مامە، لە سبەینێیشەوە کرێچیەکەی تەنها بە شەو کار دەکات. بەڵام ئایا پێویستە هاشم ژوورە تازەکەی مەجید بزانێت، ژوورەکەی (باب الشیخ)؟ نەخێر، هەرگیز. نابێت بزانێت. ئەوەندە بەسە هەر ژووری یەکەم بزانێت و ڕۆژانە لەوێ یەکتر ببینن یان هەرکاتێک پێویستی کرد. بێگومان هاشم حەزی بەم کارە نابێت، وە وایدادەنێت ئەمە شێوەیەکە لە لاوازیی باوەڕبووندا بە یەکتر. بەڵام چار چیە؟ پرسەکە باوەڕبوون و باوەڕنەبوون نیە بە یەکتر. شتەکەیش زۆر ئاسانە: دەبێت مەجید شوێنێکی هەبێت نە هاشم و نە کەسی تر نەیزانن. با هاشمیش خۆی، شوێنێکی لەو چەشنەی هەبێت کە نە مەجیدو نە کەسی تر نەیزانن.

شوێنێکی تریش هەبوو مەجیدی بۆدەچووو جارجارە لەگەڵ هاشمیش یەکتریان لێدەبینی. خانۆچکەیەکی بچووک، بە حەسیر سەری گیرا بوو لە یەکێک لە بازاڕەکانی شۆرجە. ئەو خانۆچکەیە بەدرێژایی ڕۆژ، پڕ بوو لە حەماڵ و زەحمەتکێش. بەتایبەت قەرەباڵەغیەکە لە کاژێرەکانی نیوەڕۆدا زیادی دەکرد، حەماڵ و هەژار ڕیزیان دەبەست لە "ڕێستۆرانتەکە" دا بۆ نان خواردنێکی سادەو هەرزان و کەمێک حەوانەوە دوای نیو ڕۆژ کار کردنی قورس.

مەجید فێر بووبوو گەڵێ ڕۆژ لەو "ڕێستۆرانتە-چایخانە" نانی دەخوارد. ٢٦ فلسی دەدا بە قاپێک برنج و شلەیەکی دەکرا بەسەرا، ئەویش هەر ناودەبرا بە شلە. ئەمە بە سەموونێکەوە، خراپیش نەبوو. دوای نان خواردنیش چایەکی دەخواردەوە بە تەنها سێ فلس.

ئەم خانۆچکەیە بۆ مەجید وەک شانۆیەکی گەڕۆک وابوو، دیمەنە نەبینراوەکانی شانۆگەریەکی درێژی تێدا دەخرایەڕوو. هەندێکیشیان لە چەند چیرۆکێکی مەکسیم گۆرگی دەچوون کە وەک تابلۆیەک، ژیانی زەحمەتکێشانی وولاتەکەی تێدا دەردەکەوت. زەحمەتکێشان بە جلە دڕاوەکانیانەوە کە وا دیار بوو دوای ئەوەی لەبەریان کردووە، بۆ تاکە جارێکیش نەشۆردرابێتن، لەم خانۆچکەیەدا دانیشتوون کە پاشەڕۆیەکی زۆری تێدا هەڵدراوەتەوە، هەر خەریکی ئەو نوکتانەن کە بە شێوەی سووکایەتی کردنێکی برایانە بە یەکتر، دانیشتوان دەخەنە پێکەنین، ئیتر بەبێ ئەوەی هیچ ناکۆکیەک دروست ببێت لە نێوانیاندا. بۆ هەندێکیشیان "نازناوی" پێکەنیناوی و ناشیرین دادەهێنن.

جارجارە لەنێو ئەمانەدا، کەسێک دادەنیشت کە زۆر لەوان جیاواز نەبوو لە جلوبەرگ و خووەکانیشیدا. نانی دەخواردو لە دانیشتوانیشەوە: لەوانەوە کە یەکتریان باش دەناسی، ڕووبارێک قسەی ناشیرین و ووشەی سووک دەدرا بەڕوویدا. لەوانەیە لە نێویشیاندا خزمی خۆیشی تێدابووبێت. ئەو پیاوە پۆلیسێکی نهێنی پشکنینی تاوانکاری بوو، ئەویش دەهات بۆ ئەو خانۆچکەیە بۆ نان خواردن، زۆریشی لەو قەومە دەناسی و پێیشی خۆش بوو بیانبینێت و قسەیان لەگەڵ بکات. فێری ئەوەیش بوو هەر کە لە خانۆچکەکە دەردەکەوت، گوێ بۆ دانیشتوان بگرێت چی بەیەک دەڵێن.

- ئا ڕێ بە جەنابی بەڕێوەبەر بدەن! فەرموو جەنابی بەڕێوەبەر (ئەم ڕستەیەی دوایی بە توانجەوە کۆتایی دێت).
- نا، نا، دەریکەن با ڕێستۆرانتەکەو شتەکان و کورسیەکان پیس نەکات.

- ابو عەلی خواردنی بۆ دامەنێ، ئەو پارەی حەرامت دەداتێ و فریشتە لە ڕێستۆرانتەکەت دەردەکاتە دەرەوە.
- ئەگەر سەری خێری تیا بوایە ئەوا وەک باوکی حەماڵ دەبوو. خوا لێی خۆش بێت، چەند پیاوێکی باش بوو! ئەگەر باوکت بمایەو ئا لەم حاڵەدا ببینیتایە هەر شێت دەبوو.

ابو عەلیی خاوەن ڕێستۆرانت، جارجار قسەوقسەڵۆکەکانی بە دەنگێکی گڕ کۆتایی دەهێناو ڕایدەگەیاند:

- چۆن خواردن دەدەیت بە سەگ ئاوا خواردنەکەی بدەرێ. پاشان ئەو شتانە بشۆ کە بەڕێزیان نانی تیا دەخۆن هەروەک ئەو شتەی سەگ تیایا دەخوات.

هەموو ڕۆژێک پۆلیسە نهێنیەکە گوێی لەم قسەڵۆکانە دەبوو بەبێ ئەوەی وەڵامی هیچیان بداتەوە دەگمەن نەبێت، هەر زەردەخەنەیەکی گەمژانەی دەکردو هەستی بە سووکی پیشەکەی و بێڕێزی خەڵک دەکرد بەرامبەری، ئەمە تەنانەت لە خزم و ناسیارەکانیشیەوە.

لە سەرەتاوە مەجید دەبوایە لە ناو ئەو خانۆچکەیەدا بمێنێتەوە، دوایی بۆی دەرکەوت ئەو کەسەی دوو مەتر دوور لێیەوە دانیشتووە، ئەوە پۆلیسی نهێنیە. بەڵام دوای چاودێری بارودۆخەکە، ووردە ووردە دڵنیابوو لەوەی مەترسی لە سیخوڕێکی ئاوا گێژ ناکەوێتەوە. سیخوڕەکەیش خۆی بیری لەوە نەدەکردەوە ئازار بە کەس بگەیەنێت لە ڕێستۆرانتەکەی ابو عەلیدا، وە بە هیچ جۆرێکیش بە بیریدا نەدەهات ئەو لاوەی لە تەنیشتیەوە دانیشتووە شیوعیەو لە دەست "عەدالەت" هەڵاتووە.

# ئامێرێک بۆ چاپ

بارودۆخی سیاسی، زیاترو زیاتر، دەرکردنی بەیانات و بانگەوازی حیزبی دەخواست بۆ جەماوەر، بەیانات بۆ ئاشکرا کردنی تاوانەکانی حوکمی پادشایەتی بەکرێگیراو، بۆ وورووژاندنی نارەزاییەتیەکان و رای گشتی دژ بە سیاسەتی دەسەلاتی سەروەر، بۆ لێدان لە چەواشەکاری و لاواز بوونی مەعنەویەت لە ریزی خەباتگێرە شۆرشگێرەکاندا، بۆ بەرزکردنەوەی گیانی باوەر بەخۆبوون. دەبێت بۆ هەموانی رابگەیەنین، سەرکەوتن بەسەر حیزبی شیوعی عێراقدا روونادات. ئەو کەسە ترسنۆکانەی لەبەردەم جەللادەکاندا بەچۆکدا هاتوون، ئەوانە نوێنەرایەتی رووخساری گەشاوەی حیزب ناکەن. ئەوەتا چەندان کەس پالەوانانە خۆیان گرت و ئالای بەرگری کردنیان لە حیزبەکەیان و چینەکەیان و گەلەکەیان و نیشتمانەکەیان بە بەرزی راگرت. بەلام چۆن بگەینە ئەو بەیانات دەرکردنانە؟ ئەوەی هەیە دەرکردنی بلاوکراوەی حیزبی و کۆپی کردنەوەیانە بە دەسخەت، زۆرجاریش خوێندنەوەیان زەحمەتە. چەند وێنە لەو بلاوکراوانە دابەش دەکرێن؟ بێگومان بە پێچەوانەی بلاوکراوەی چاپکراوەوە، هەر چەند وێنەیەکی کەم و دیاریکراوە. ئەمە کێشەیەکی جیددییە شایستەی بیرکردنەوەیەکی درێژە. لەمەوبەر هاورێیان لە بارودۆخێکدا بوون بواری بیرکردنەوەی نەداون بۆ چارەسەرێکی پراکتیکیانەی گرفتێکی لەم جۆرە. بەلام ئێستا، چەند هەنگاوێک نراوە بۆ دامەزراندنەوەی رێکخراوی حیزبی (لە هاوینی ١٩٤٩ دا)، بۆیە ئێستا دەکرێت بەدوای چارەسەری ئەم کێشەیەدا بگەرێین.

چۆن ئامێرێکی چاپکردن پەیدا دەکرێت؟ مەجید بیری لەوە دەکردەوە کە پێویستە ئامێرێکی چاپ پەیدا بکرێت بە هەر نرخێک بێت. ئایا ئەو ئامێرە دەکردرێت؟ ئەگەر ئەمە بکرایە، ئەوە چاکترین چارەسەر بوو، بەلام بەداخێکی گرانەوە، ئەو توانایە بەرجەستە نیە، نە پارە هەیەو نە تواناکانی تریش. کەواتە دەبێت لە رێگاکانی تر بگەرێین. دەبێت لەگەل هاورێیانی

تر ڕاوێژ بکرێت و پەنایان بۆ ببرێت، لەوانەیە ئەوان چارەسەرێکی گونجاو بدۆزنەوە بۆ ئەم کێشەیە.

مەجید شتەکەی لەگەڵ چەند هاوڕێیەک باس کرد. ئەوەیشی باش بوو کە ئەو هاوڕێیانە خۆشیان لەوانەبوون کە لەسەر بنەمایەکی واقیعیانە بیریان لەمە دەکردەوە. هاوڕێیەک وەڵامی دایەوە کە توانای دەستخستنی ئامێری چاپکردن نیە، وە تەنانەت ئەگەر دەستیشمان بکەوێت ناتوانین لەم کاتەدا بەکاری بهێنین. بەردەوام ئەم جۆرە بۆچوونە ڕەشبینانەیش هەر هەیە کە حەز دەکەن کێشەکە گەورە نیشان بدەن. هاوڕێیەکی تر گووتی دەتوانرێت بەناوی دامودەزگایەکەوە بکڕدرێت. ئەم ڕایە باشترە. بەڵام هاوڕێ جەمیل، کە فەرمانبەر بوو لە یەکێک لە دامودەزگاکاندا، خۆی بیری لە شتەکە کردبۆوە، تەنانەت بەر لەوەی کەس لەگەڵیدا باسی بکات، ئامادەگی تەواوی هەبوو بۆ پێشنیارێکی دروست: ئەو دامودەزگایەی کاری تیا دەکات، ئامێرێکی ڕۆنیۆی تازەو چاکی هەیە. ئەمە دامودەزگایەکی بێیانی، بازرگانی، کۆلۆنیالیستیە، سامانمان بە تاڵان دەبات و کرێکارەکانمان دەڕەتێنێت. بۆچی ئێمەیش بە دەوری خۆمان، تاڵانی نەکەین و ئامێرێکی ڕۆنیۆ لە شتومەکەکانیان نەبەین؟ هەر بژیت هاوڕێ جەمیل! ئەمە دەستپێشخەریەکی چاکە! ئەمە دزی نیە، بەڵکو "دەستبەسەراگرتنی شۆڕشگێڕانەیە – مصادرة ثورية". بێگومان ئەگەر پرسەکە دزینی خواردنێک و جلوبەرگێک و شتێکی لەو جۆرە بوایە، دروست نەبوو پەنا بۆ ئەو شێوازە ببەین. بەڵام ئامێرێکی چاپکردن لە دەستی دوژمن هەڵپڕوکێنیت بۆ بڵاوکردنەوەی ووشەی حەق لەنێو خەڵکیدا بۆ بەرگری لە گەل و بەرژەوەندی نیشتمانەکەت، ئەوە شتێکی دروستە، زۆر دروستە.

دەبێت بەزوویی ئەمە جێبەجێ بکرێت. کێ ئەو کارە جێبەجێ بکات؟ جەمیل خۆی وەک خاوەن پێشنیار، ئامادەی جێبەجێ کردنە. جەمیل پێشنیاریشی کرد کرێکارە شیوعیەکە، ئەمین، کۆمەک بکات لە گەڵیدا بۆ وەدیهێنانی ئەرکەکە. ئەی ئایا هاوڕێ ئەمین،

شیوعیەک لە خەباتی ژێرزەمینیدا، ڕازی دەبێت؟ بەڵێ بەدڵنیاییەوە، تەواو ئامادەیە. ئەی ئایا ئەوانیش پێویستیان بە یارمەتی کەسانی تر دەبێت؟ نەخێر .. جەمیل گووتی:

- ئەم کارە بۆ ئێمە هەردووکمان، جێبهێڵن. دوای دوو یان سێ ڕۆژ، ڕۆنیۆکە لەناو دەستتاندایە.
- ئەی بە چ شێوازێک ئامێرەکە لەوێوە دەگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنەی دەمانەوێت؟
- ئەمە ئاسانە، چارەسەری ئەوەمان دۆزیوەتەوە. "عارەبانەیەک" لە عارەبانەکانی حەماڵەکانی بازاڕی شۆرجە دەهێنین و ئامێرەکەی دەخەینە سەرو (ئەمین) لە شەقام و کۆڵانەکانەوە پاڵی پێوە دەنێت تا ئەو شوێنەی دەمانەوێت. ئەگەر حەزت کرد بۆ بەعقوبە! ئامێرەکە بە پارچە قوماشێک دادەپۆشین.

هەموو شتێک بە خێرایی و بە سەلامەتی کۆتایی هات. حیزب ئامێرێکی ڕۆنیۆی چاک و زۆر جوانی لەنێو دەستدایە! جوان وەک بووک! بەڵام گرفتەکە بە تەواوی چارەسەر نەکراوە. ئامێری چاپکردنمان نیە. هاوڕێکان نەیانتوانیوە ئامێری چاپکردنەکەیش بهێنن. چارە چیە؟ دەتوانین سوود لە هەر هاوڕێیەک وەربگرین کە بە خەتێکی جوان دەنووسێت هەتا ببێتە ئامێری چاپکردنی وەختیمان. ئەو بە دەست لەسەر ستێنسڵەکە دەنووسێت و دواییش بە ڕۆنیۆکە ڕایدەکێشین. بەڵام بێگومان بەکارهێنانی ئامێری چاپ باشترە. کەواتە با لە دوای بگەڕێین، ئەویش دەدۆزینەوە هەروەک چۆن ئامێری ڕۆنیۆکەمان دۆزیەوە. با لە هاوڕێیان بپرسین، ڕێکخەری هێڵی ڕێکخراوەکان.

ئەمجارەیان وەڵامی پۆزەتیف و خێرامان لە ئەنوەرەوە دەستکەوت، ڕێکخەری خوێندکارانی کۆلیژەکان:

- هاوڕێی خوێندکار (سەمیر)، گفتی تەگبیر کردنی ئەو شتەی داوە. ئەو لە یەکێک لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا، ستێنسڵەکەمان بۆ چاپ دەکات. لەوێ کاتبێکی چاپ هەیە، کەسێکی چاک، دۆستی حیزب، ئامادەیی نیشانداوە بۆ لە چاپدانی

ستێنسڵەکان بۆمان. دوای تەواوبوونی دەوام، لە فەرمانگەکەی دەمێنێتەوەو کار بۆ ئێمە دەکات.

- کارێکی چاکتان کردووە. ئەمە تەگبیرێکی مومتازە لەم کاتەدا. هیچ ڕێگرێک نەبوو لەبەردەم لە چاپداتی بڵاوکراوە حیزبیەکاندا.
- دەتوانرێت سبەینێ پاش نیوەڕۆ، یەکەم ستێنسڵ چاپ بکرێت، ئەگەر بمانەوێت.

مایەوە شتێک: ڕۆنیۆکە لە کوێ بخەینە کار؟ ئەمە نامێرێکی نهێنیە، بەکارهێنانی قەدەغەیە، لەکاتی بەکارهێنانیشدا بێدەنگ نیە، بەڵکو دەنگی دەبیسترێت ئەگەر لە شوێنێکی گونجاودا نەبێت. ئەو شوێنە گونجاوە لە کوێیە؟ هیچ شوێنێک نیە ژوورە تازەکەی مەجید نەبێت، ژوورەکەی باب الشیخ. ڕۆنیۆکەی برد بۆ ئەوێ.

* * *

ڕۆژێک مەجید لە "ڕێستۆرانتەکەی" ابو عەلی دانیشتبوو لە شۆرجەو نانی دەخوارد، هاوڕێکەی -هاشم- بە دەمار کرژیەکەوە دەرکەوت.

- بەخێر بێیت هاوڕێ، خواردنێکی خۆش و هەرزان، دیارە هێشتا نانیشت نەخواردووە.
- پێویستە بە پەلە هاوڕێی ڕێکخەری بەسرە بانگ بکەین بۆ ئێرەو لێرە کار بکات لە گەڵماندا.
- هەر لەسەرەتاوە ڕێکەوتووین لەسەر ئەمە. ئیتر تەنها لەسەر ئەوە وەستاوە ناونیشانەکەی بزانین و یەکێک بنامگەیەنێتە لای.
- ناونیشانەکەم دەستکەوتووە، خۆیشم شتەکە ڕێکدەخەم.

ڕۆژی دواتر مەجیدو هاشم لە ژوورەکەی حەیدەرخانە یەکتریان بینی، لێدوانێکی کورت دەربارەی هەمان بابەت ڕوویدا، هاشم لەو قسەوباسانە تووشی دڵەڕاوکێ و کرژیەک هات.

ئیتر یان بەهۆی ڕێنەکەوتنیەوە لەگەڵ مەجید یان هاوڕێیانی تر. ژوورەکەی جێهێشت و بەغدایشی جێهێشت بەرەو بەسرە.

لە ماوەی غیابی هاشمدا، ڕووداوی "گرنگ" لە ژیانی مەجیددا ڕوویدا: هەوڵەکانی سەرکەوتوو بوو بۆ دەستخستنی خێزانێک لە ژوورەکەیدا نیشتەجێ بێت لە باب الشیخ. بەرجەستە بوونی ئەم خێزانە، بارودۆخێکی باشتری بۆ مەجید دابین کرد لە ڕووی خۆپاراستن و کاری حیزبیەوە، هەروەک چۆن توانای بەکارهێنانی ڕۆنیۆکە لە ژوورکەدا مسۆگەر بوو.

خێزانێکی زەحمەتکێش، دایکێک و دوو کچە بچکۆلەکەی. گەورەکەیان چوار ساڵانێک بوو. باوکیان کرێکارێکی نەوت بووە لە کەرکوک، لە شیوعیەکانەو ئێستا وەک هەزاران تێکۆشەری تر، خراوەتە زیندان. هاوڕێیانی ڕێکخراوی کەرکوک پەیوەندییان کردو ئەو خێزانە شیوعیەیان نارده بەغدا تا لە ڕیزەکانی پێشەوەی خەباتدا بن، بۆ بەردەوام بوون لەسەر هەمان ئەو بابەتەی مێردەکەی بەند کراوە لە سەری. ئەم ژنەیش (ام نضال) لەوەوە بڕیاری نەداوە خۆی تێکەڵ بە تێکۆشانی سەخت بکات تەنها لەبەر شانازی کردن بەو شیوعیە بەندکراوەوە کە هاوبەشی ژیانیەتی، وە لەبەر پێداویستی داهاتێکیش نیە بۆ بژێوی، بەڵکو بەر لە هەرچی، بەهۆکاری خۆشەویستی و شانازیە بە حیزبی شیوعیەوە، بەهۆی ئارەزووی خۆیەوە بووە بۆ خەباتی شۆڕشگێڕی. ام نضال شیوعیەکی بە حەماس، گەنجێکی زەحمەتکێش، هەمیشە بە توونێکی پڕ لە شانازی و بە نرخەوە ووشەی "حیزب" بە دەمیدا دەهات. ئەوە ئەو ژنەو کچە بچکۆلەکانێتی لە بەغدا، لەگەڵ مەجیدن لە باب الشیخ. شتومەکی ناوماڵیشی گواستەوە بەغدا، هەموویشی بە سەرشان هەڵدەگیرێت و پێویستی بە ئۆتۆمۆبێل و حەماڵ نیە!

- خوشکەکەم و مناڵەکانی گەیشتن هەتا لێرە لەگەڵ من دانیشن - مەجید ئەمەی بەو کەسانە گووت کە لەبەر دەرگای ژوورەکانیاندا دانیشتبوون لە ناو ئەو

خانووەدا کە ئەویش ژوورێکی تێدا بەکرێ گرتبوو لە گەڕەکی باب الشیخ. لە کاتی گرتنی ژوورەکەیشدا، ئەوەی ڕاگەیاندبوو لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا خێزانەکەی دەهێنێت.

- ئای بەخێر بێن. یەکێک لە ژنەکان گووتی: ئیتر لەمەودوایش بەدەست جلەکانت ناشۆیت.
- ئەی مێردەکەی لە کوێیە؟ عاجزە لێی؟
- لە کوێت کار دەکات. ماوەیەکی درێژ بێکار بوو، کارێکی دەست نەدەکەوت لێرە، بۆیە چوو بۆ ئەوێ و کارێکیان بۆ مسۆگەر کرد.
- قەیناکە. خوا گەوەیە، ئینشائەڵلا دەگەڕێتەوە.

ئا بەمجۆرە مەجید، دوای گواستنەوەی بۆ بەغدا، یەکەم ماڵی حیزبی پێکەوەنا کە خێزانێکی شیوعی تێدا جێگیر بوو، یەکەمین "بارەگای گوماناوی شیوعیەت" وەک پیاوانی پشکنینی تاوانکاری پێیان دەگووت. ئەم "بارەگا گوماناویە" یەک ژوور بوو لە خانوویەکی شێوە بەغدادیدا کە لە هەشت ژوور پێکهاتبوو. نێوانی ژوورەکان هەر تەنها دیوارێک بوو.

مەجید هەر لە هێنانی ئەم خێزانەدا سەرکەوتوو نەبوو بۆ بەغداو بەس، بەڵکو توانی هاوڕێ ساڵەحیش بەکێش بکات، بەوەیش ئەو "خزمەتە حیزبیەکانی" گواستەوە لە شاری سلێمانیەوە بۆ پایتەخت، ئەمەیش بەهۆی پێویستیەکی زۆرەوە بە کادری حیزبی بۆ هەموو جۆرە چالاکیە ڕێکخراوەیی و هونەریەکان.

ساڵەح خوێندکارێکی گەنجی شیوعی بە کەفوکوڵ بوو، ناچار بووبوو واز لە خوێندن بهێنێت دوای دەرچوونی فەرمانی گرتنی. بەڵام هەر لە پەیوەندیدا مابۆوە لەگەڵ هاوڕێ قوتابیە شیوعیەکانی و ڕێکخەری حیزبیان بوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٩ ەوە هەتا بانگ کردنی بۆ بەغداو پێسپاردنی ئەرکێکی تر. ئەویش وەک برای مەجید لە هەمان خانوو نیشتەجێ بوو. دوای جێگیر بوونی ئەم "برایە" لای مەجید، مامەی خاوەن خانوو هاتە

سەردانیان لە ژوورەکەی حەیدەرخانە، سەیرێکی ڕووخساری برا بچکۆلەی کردو ئینجا وەک ئەوەی نهێنیەکی دۆزیبێتەوە، گووتی:

- مەجید، ساڵەحی برات هەر لە تۆ دەچێت.
- هیچ عەجایەب نیە مامە.
- هیچ عەجایەب نیە. براتەو لە تۆ دەچێت. ئەی کاری چیە؟
- لەگەڵ من لە هەمان کارگە کار دەکات.

ئەوە کام "کەرگەیە" مەجید کاری لێدەکات، مامە نازانێت، وە پرسیاریش ناکات. پرسەکە ئەوەیە کە مەجیدو براکەی شەوانە کار دەکەن، لە شەفتی ئێواراندا.

هاشم دوای هەفتەیەک گەڕایەوە پایتەخت، لە ئەرکەکەیشیدا شکستی نەهێنابوو. لەگەڵ لاوێکدا گەڕایەوە، ئەسمەر، باریک، باڵا بەرز، لەسەرخۆ، چاوێکی زیرەک. ئەوە (زوهێر) بوو، ڕێکخەری لیژنەی ناوخۆیی بەسرە، ئەویش دووبارە بە فەرمانی حیزب "خزمەتە حیزبیەکانی" گواستۆتەوە بۆ بەغدا. یەکتر بینینەکەی نێوان مەجیدو زوهێر زۆر گەرموگوڕ بوو، هەردووکیان وا هەڵسوکەوتیان دەکرد لەگەڵ یەکتر وەک ئەوەی دوو برادەری کۆنی یەکتر بن، گەرچی بەر لەو ڕۆژە یەکتریان نەدیبوو.

بەدڵنیاییەوە ئەم حیزبە عێراقییش و ئینترناسیۆنالیستیشە! ببینە چی تێدایە! دوژمن ناوەندی سەرکردایەتی تێکشکاند، تۆڕی کادرەکانی و ڕێکخراوەکانی تێکشاند لە پایتەختدا، تێرۆرێکی ڕەشی پۆلیسی لە پایتەختدا بڵاوکردەوەو ئەنجوومەنی سەربازیی عورفیی تێدا سەپاند. ڕێکخراوەکانی حیزب لە پارێزگاکانەوە، بەخێرایی "پایتەخت" یان پڕ کردەوە لەو کادرانەی هەیانبوو. هاوڕێیان لەمسەری باکورەوە هەتا ئەوسەری باشوور، بەغدایان قبوڵ کرد هەتا هاوبەشیی سارێژ کردنی برینەکانی حیزب بکەن و ڕێکخراوەکانی دابمەزرێننەوە، کورد، عەرەب، ئەرمەن، ئاشوری، تورکمان، موسڵمان، مەسیحی، جوولەکە، کرێکاران، خوێندکاران، ڕۆشنبیران، کاسبکاران، هتد، ئەمانە هەموویان لە

بەتین ترین تێکۆشانی برایانەدا دەژین، یەکترییان خۆشدەوێت و سۆڵیداریتی یەکتر دەکەن. تاکە کەسێکیان، بیری لە نەتەوەو ئاینەکەی هاوڕێکەی تری نەدەکردەوە. هەموویان یەک زمان کۆی کردبوونەوە: زمانی تێکۆشان لەژێر ئاڵای شیوعیەتدا. بەڕاستی ئەمە دیاردەیەک بوو لە دیاردە ئینترناسیۆنالیستیە سەرنجڕاکێشەکانی حیزب! دەبێت حیزبی چینی کرێکار ئا بەم جۆرە بێت. حیزبیش ئا بەو جۆرە، ئەندام و کادرەکانی پەروەردە کردووە.

هاشم حەزی دەکرد هاتنی زوهێر بۆ بەغدا لە بەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێت لە "جیاوازیەکان" دا لەگەڵ مەجید، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لەوەدا. ئەو لەگەڵ زوهێریش نەدەگونجا. زوهێر لەگەڵ مەجید دەگونجاو پێکەوە هاوڕا بوون لە کاردا.

زوهێر لە کاتە دیاریکراوەکەیدا لەگەڵ مەجید دواکەت، بۆیە مەجید دوودڵی دایگرت.

- داوای لێبووردن دەکەم لە دواکەوتنم. کاتێکی دیاریکراوم هەبوو لە (صحن) – جێنزارگەی کازمیە. چەند کەسێک بەدوامەوە بوون لە "خزمەتیجی جێنزارگەکە" و سووربوون لەسەر ئەوەی سەردانێک بکەم، ناچاریان کردم زیارەتیش بکەم و چەند درهەمێکیشیان بدەمێ – زوهێر ئەمەی بە هۆکاری دواکەوتنەکەی دانا.
- باشە. مسۆدەی بڵاوکراوەیەکمان هەیە، دەبێت دوای بڕیاردان لەسەری، بنێردرێت بۆ برادەرەکەی کاتبمان هەتا لەسەر ستێنسڵ چاپی بکات. وە ئێستا ئیتر دەتوانین ڕۆنیۆکەیش بەکاربهێنین.

## مامە نهێنیەکەی لەلا ئاشکرا دەبێت

مەجیدو ساڵەح دەیانتوانی سەرلەبەیانی هەموو ڕۆژێک بگەڕێنەوە بۆ (حەیدەرخانە)، ئەمەیش گوایە دوای دەوامەو لە کارگە دەگەڕێنەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی ئۆگۆستی ١٩٤٩، ساڵەح لە پێش براکەیەوە چووە ژوورەوە، بەڵام کلیلی پێ نەبوو. لە چاوەڕوانیی گەیشتنەوەی مەجیددا، لەبەر دەرگای ژوورەکەدا دەوەستێت، گوێی لە دەنگەدەنگی خەڵکە لە ژووردەکەدا، لە پشت دەرگا داخراوەکەوە قسە دەکەن. ئەوە چیە؟ ئەمانە کێن لەم ژوورە داخراوەدا؟ ئایا شتێک ڕوویداوە؟ ئایا ساڵەح بەسەر مەترسیەکی چاوەڕوان نەکراودا هاتۆتەوە؟

- ئەوە کێیە لە دەرەوە لەبەردەم دەرگاکەدا؟ مەجیدە؟ ساڵەحە؟ دەرگاکە بکەرەوە —ئەم بانگەوازانە لە ناو ژوورە داخراوەکەوە دەهات، بەدەنگێکی تەواو ناسراو لە لای مەجیدو ساڵەح، دەنگی مامەگەورە.
- مامە، من ساڵەحم – ساڵەح وەڵامی دایەوە.
- ئەو دەرگایە بکەرەوە، خێرا دەرگاکە بکەرەوە.
- مامە گیان کلیلم پێ نیە. دوای کەمێک مەجیدی برام دەگات و دەرگاکە دەکاتەوە.
- ئاخ مەجید! ئاخ لەدەست تۆ! ئەمە ئێوە کێن؟

ساڵەح لەجێی خۆیدا ووشک بوو، ئیتر یان لەبەر ئەوەی تێکچوو بوو یان لەبەر ئەوە بوو کە هەستی هیچ مەترسیەکی نەکرد. چاوەڕێی مەجیدی برای دەکات، ئەمە هەروەک مامەو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە ژوورە داخراوەکەدا. چاوەڕوانیەکە زۆر درێژەی نەکێشا، مەجید گەیشت و وەک ڕۆژانی تر کلیلی لە گیرفانی دەرهێناو دەرگاکەی کردەوەو دیمەنێکی سەرسووڕهێنەری بینی: قەرەباڵەغیەکی کەم لە خەڵکی، لە پیاوو ژن، لەم ژوورەدا. مامە گەورەی چەماوە لە ناوەڕاستیاندا، ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە، توورە، دەلەرزێت، لەرزینێک وەک ئەوەی کەسێک شتێکی بینیبێت کە هەرگیز چاوەڕێی نەکردووە. لە تەنیشتیەوە ژنێکی

پیر، عابایەکی بەسەرەوەیە، بە دوو چاوی تۆقیوو ڕەنگێکی زەردهەڵگەڕاوی زۆر شڵەژاوەوە پیایانا دەڕوانێت. لە لای چەپی مامەگەورەوە دوو لاوی هەژدە ساڵان، جۆرێک لە هێمنی و حەزینیان پێوە دیار بوو وەک بڵێی بە داخەوە ئەم ڕووداوە ڕوویداوە، لە پشت مامەگەورەیشەوە دوو کچی گەنج بە عاباوە وەستاون، بە ترسەوە وەک دوو چۆلەکەی ڕاونراو لە پشیلەیەکەوە لە ژوورێکی خرپدراوی بێ دەرگاو پەنجەرەدا. ئەوە خێزانەکەی مامەگەورە بوو بە هەموو ئەندامەکانیەوە، ئەمانە لە دەرگا تەختەییەکەی نێوان ئەم ژوورەو ژوورەکەی مامە خۆیەوە هاتوونەتە ژوورەوە، ئەو دەرگایەی مەجید هیوای هەڵاتنی لێوە دەخواست لە حاڵێکدا ئەگەر پۆلیس بدات بەسەر ماڵەکەدا. بریاری دابوو لەوێوە بەرەو ماڵی مامەگەورە خۆی بدزێتەوەو لەوێیشەوە بەرەو سەر شەقامەکە، ئەگەر پێویستی کرد. بەڵام ئەوەی ڕوویداوە، بە تەواوی پێچەوانەیە، مامەگەورە هاتۆتە ناو ماڵەکەی مەجیدەوە! ئای مەجید! هەموو حساباتەکەت بەسەر سەرا هەڵگێڕایەوە. چاوەڕێ بووی ئەم دەرگایە سوودت پێبگەیەنێت، بەڵام زیانی پێگەیاندیت. لێرە نەبوویت و هاتوونەتە ژوورەکەتەوە. چی دەڵێیت ئەگەر پۆلیسیان ئاگادار بکردایەو کەمینێکیان بۆ دابنایتایە؟ ئەی ئایا ئێستایش شتێکی لەو چەشنە ڕووی نەداوە بەر لەوەی لەم ژوورە بچیتە دەرەوە؟

باشە چی شتێک پاڵی بە مامەگەورەوە ناوە ئەم دەرگایە بکاتەوە یان بیشکێنێت و بێتە ژوورەکەی مەجیدەوە؟ گومانی لە مەجیدو ساڵەح پاڵی پێوەناوە، ترس لەوان پاڵی پێوەناوە. ترساوە لەوەی ئەمانە "دز" بن و لە دوای هەلێکی لەبار بگەڕێن و لەو دەرگایەوە بچنە سەر ماڵەکەی و پەلاماری بدەن. دەی کەواتە بۆ ئەو دەستپێشخەری ناکات؟ بۆچی لەکاتی غیابیاندا، نەچێتە ژووری ئەم دوو گەنجەوەو سەیرێکی بکات بزانێ چی تێدایە؟ ژوورەکە دەپشکنێت تا دەلیلێک بدۆزێتەوە ئایا ئەمانە "دزن" و نیازێکی خراپیان هەیە یاننا. بەڵام چ چارە ڕەشیەکە ئەم پشکنینە؟ بەم کارە هەڵدەسێت بەبێ ئەوەی ئەم دوو گەنجە پێی بزانن.

ئەو نەیدەویست هیچ زیانێکیان پێبگەیەنێت یان تووشی گێرمەوکێشەیەکیان بکات. ئەو هەر تەنها بۆ دڵنیا بوونێک ئەمەی کردووە، هەر تەنها دڵنیا بوونێک و بەس.

بە نهێنی دەچێتە ژوورەوەو دەیپشکنێت. چی دەپشکنێت؟ هیچی تیا نیە تەنها لێفەیەکی کۆنی دڕاوو شەربەیەکی ئاوو  جانتایەکی چەرمی بچکۆلە. دەبێت لە پێشدا ئەم جانتایە بکرێتەوەو بپشکنرێت، لەوانەیە نهێنی ئەم دوو لاوەی تێدا ئاشکرا ببێت. بێگومان جانتا دانەخراوە. مامەگەورە جانتا دەکاتەوە، شتێک دەبینێت کە هەرگیز بەبیریدا نەهاتووە. ئەمە نە دەمانچەیەکی تێدایە نە چەقۆیەک نە شتێک کە "دزەکە" بیوەشێنێت! ئەمانە "شتومەکی شیوعیانەیە"! ئا، کەواتە ئێوە شیوعین و لێرەدا نیشتەجێ بوون، لە ماڵەکەی مندا، منیش پێم نەزانیون هەتا ئەم چرکەساتە! من چیم بکردایە ئەگەر پۆلیس بهاتایەتە سەر ماڵەکەم و ئێوەی بگرتایە؟ ئایا ئەوکاتە منیشیان بە یاریدەدەری ئێوە دانەدەنا؟

- ئەم کاغەزانە چین لەم جانتایەدا مەجید؟ شیوعی نیت؟ -مامەگەورە پرسی.
- ئەوانە کاغەزی منن مامە – مەجید وەڵامی دایەوە.
- دەتەوێت بمخەیتە گێرمەوکێشەوە؟
- نا. نامانەوێت بتخەینە هیچ نارەحەتیەکەوە.- وا خراپ تێمان مەگە کە ویستبێتمان تووشی کێشەیەکت بکەین.
- کەواتە ئەم کاغەزانە چین؟ مەگەر تۆ شیوعی نیت؟
- ئەوانە کاغەزی منن. مامە، پێم بڵێ بۆچی بەم ئاستە تووڕەیت و تێکچوویت؟ لەسەرخۆبە، با لە یەکتر تێبگەین. پێمان بڵێ چیت دەوێت بیکەین؟  دەتەوێت ژوورەکەت بۆ جێبهێڵین؟ هەر ئێستا جێیدەهێڵین. هەرچی کرێیەکیشمان لەلایە دەتدەینێ.
- ئێوە ویستووتانە من تووشی کێشە بکەن. چیمداوە لە شیوعیەت؟ من دژی شیوعیەت نیم و ڕقیشم لێتان نیە، بەڵام دەترسم، دەترسم، دەترسم.

تێگەیشتن؟ بارودۆخەکە خراپەو منیش دەترسم. لەخوا بەزیاد بێت تا ئێستا هیچ ڕووی نەداوە. بڕۆن بۆ شوێنێکی تر.

کوڕەکەم! مامەت دەترسێت، لەسەر ئەوەیش لۆمەی مەکەن –ئەمە ژنەکەی مامەگەورە گووتی.

مامەگەورە کەمێک هاتەوە سەرخۆی. بەڵام بە دەنگی بەرز قسەی دەکردو "هەڵمەتی هێرشبەرانەی" هەر بەردەوام بوو دژی ئەو دوو لاوەی کە گوایە دەیخەنە کێشەوە. لاوەکانی تریش وەستاون و سەیر دەکەن، بەبێ ئەوەی تاکە ووشەیەک بڵێن. مەجید لە دوو برا گەورەکە نزیک بۆوەو گووتی:

- یارمەتیمان بدەن لە هێمن کردنەوەی باوکتاناو لە چارەسەری ئەم گرفتەدا.
- ئێمەیش لە جەماعەتین (مەبەستی جەماعەتی حیزبی شیوعی بوو). بەڵام کەسوکارمان قبوڵ ناکەن. ئەگەر بەدەست ئێمە بوایە جۆرێکی تر ڕەفتارمان دەکرد.

کەواتە ئەم دوو گەنجەیش لە خۆمانن، یان لای کەم دۆستی حیزبمانن –مەجید بیری کردەوە، مستەفای کوبەفرۆشی بیرهاتەوە کە ئاگاداری کردن دەربارەی مفەوەزە نهێنیە لەعنەتیەکەی ئەو ڕۆژە مەجیدو ئەوانی تر لە ژوورەکەی حمام المالح –دۆستانی حیزبمان زۆرن، ئەوانەی بەسۆزن لەگەڵیداو ڕقیان لە حوکمی پادشایەتی بەکرێگیراوە.

- هەرچیتان لەلایە دەیدەن و هەر ئەمڕۆیش ژوورەکە جێدەهێڵن –مامەگەورە بە توونێکی قورس ئەمەی گووت.
- بەسەرچاو. هەر ئێستا دەڕۆین، چیمان لەلایە؟
- ڕوبعە دینارێک کرێی ئەم ڕۆژانەی دوایی، وانیە؟
- فەرموو مامە گیان، مەبلەغەکەمان لێوەربگرەو با بڕۆین.

ژنە پیرە فارسەکە، ژنی کارگوزارە پاککەرەوەکەی شارەوانی کە بە تەنیشت ژوورەکەی ئێمەوە دەژیان، تەنها کەس بوو گوێی لەم مشتومڕەی مەجیدو مامە بوو. ئەو هیچ لە بابەتەکە تێناگات، وە هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم هێرشەی مامەیش نازانێت. بەڵام دڵنیا بوو کە کێشەیەک ڕوویداوەو مامەگەورە دەیەوێت ئەم دوو لاوە لە ژوورەکە دەربکات. حەزی دەکرد بیتوانیایە یارمەتیان بدات و مامە ڕازی بکات واز لە دەرکردنیان بهێنێت لە ژوورەکە: ئەمانە دوو دراوسێی زۆر باشن. کەوتە قسە لەگەڵ ژنەکەو مێردەکەی بە توونێکی گەرم و بەردەوامیش، پێشتر یارمەتی هەمەجۆرەیشی پێشکەش کردوون. بەداخەوە، ئێستا ناتوانێت دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکات. بۆیە خواحافیزیەکی لێکردن وەک منداڵی خۆی بن.

مەجید لێفە کۆنەکەی لوول کردو هەڵیگرت، ساڵەحیش جانتاکەی هەڵگرت و شەربەی ئاوەکەیشیان جێهێشت بۆ ژنی کارگوزارەکەی شارەوانی.

- ئەوە هەڵگرە بۆ خۆت پورە گیان.
- خوا تەمەنتان درێژ بکات. چەند ئینسانی باشن. خۆزگە ئەم ژوورەتان جێنەهێشتایە.

لە ماڵ دەرپەڕین، هەموو شتەکانیان پێبوو تا هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆی. وە هێشتا هەر تەنها ٢٠٠ مەترێکیان بڕی بوو لە کۆڵانەکەدا بەرەو شەقامی غازی (ئێستا شەقامی کفاح) کاتێک گوێیان لە دەنگێکی ژنانە بوو لە پشتەوە بانگی دەکردن:

- مەجید! مەجید! بوەستن! بوەستن!

هەردووکیان وەستان، کچەکە بە عابایەکەوە، بە ڕاکردن بەرەوڕوویان دەهات، گەیشت و شتێکی لەژێر عاباکەی دەرهێناو سەیرێکی ئەملاولای کردو دایە دەست مەجید:

- ها، بیگرە! لە گیرفانتا بیشارەوە. بۆ بیرتانچوو؟ بۆ ئاگاتان لە شتەکانی خۆتان نیە؟

- زۆر سوپاس خوشکەکەم –مەجید وەڵامی دایەوە، سەیری "شتەکە"ی کرد کە کچی مامەگەورە بە ڕاکردن هێنای بۆیان هەتا بیریان نەچێت. ئەمە کڵێشەی ئەو "مۆر"ەیە کە کاتی خۆی هاوڕێیەکی کرێکار بۆ "الصراع" ی ئامادە کردووە بۆ ژمارە یەکی بڵاوکراوەکە. نە مەجیدو نە ساڵەح ئاگایان لێ نەبوو لە کاتی جێهێشتنی ژوورەکەی مامەدا. ئەو هەر کڵێشەکەی بۆ نەهێنانەوە، بەڵکو ڕەخنەو لۆمەیەکیشی کردن لەسەر "بیرچوون" و کەمی بایەخیان بە کاروباریان! لەوانەیە ئەو کڵێشەیەیان پێویست نەبێت لەمەودوا، چونکە بیر لە دەرکردنی بڵاوکراوەی "الصراع" ناکەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەوەی ئەو کچە کردی، وانەیەکی نوێ بوو بۆیان.

مەجید بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، هەر بیریشی لای ئەوە بوو کە چەند خوولەکێک لەمەوبەر بەسەریان هات. ڕووداوەکە کوتوپڕو چاوەڕوان نەکراو بوو. ئەو هەرگیز بیری لەوە نەکردبۆوە مامەگەورە بدات بەسەر ژوورەکەیداو پێناسەکەی ئاشکرا بکات بە پشکنینی جانتاکەی. بەڵام ژیان پڕە لە ڕووداوی ناکاوو چاووەڕوان نەکراو.

## یەکەمین بڵاوکراوەی لەچاپدراو

مەجید گەڕایەوە ماڵ و ئەو زەرفەی لە گیرفانی دەرهێنا کە لە یەکێک لە نامەبەرەکانی حیزبی وەرگرتبوو. لەنێو ناوەڕۆکی زەرفەکەدا شتێکی جیاوازی تێدا بوو. نامیلکەیەک یان شێوە نامیلکەیەکی تێدا بوو بە دەسخەت کۆپی کرابوو. بە خەتێکی گەورە لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو "الصواب"، لە ژێریشیدا ڕستەی "زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق". بەر لەوەی چاوی پێدا بخشێنێت و ئاگادارییەک لە ناوەڕۆکەکەی پەیدا بکات، بیری لەوە کردەوە سەرچاوەی دەرکردنی ئەم بڵاوکراوەیە کوێیە. ئایا بلۆکێکی تری ئینشقاق هاتۆتە

مەیدان؟ بەر لە ماوەیەک، بڵاوکراوەیەک بە ناوی "النجمة" لە بلۆکێکی ئینشقاق بچووکەوە دەرکرا، لە کەسانێکەوە لە حیزبی شیوعی جیابووبوونەوەو دەیانەویست ڕێکخراوەکەیان "حیزبی شیوعی" بێت. مەجید ئەوەیانی باش دەزانی، بەڵام هیچ لەبارەی ئەم بڵاوکراوە تازەیەوە -"الصواب" وە ئەوانەیشی دەریان کردووە، نازانێت.

"الصواب" ی هەڵدایەوە، سەر ووتارەکەی واژۆی "فەهد / سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی عێراق" پێوەیە! لە شوێنێکی تریشدا، چاوی کەوتە سەر ڕستەیەکی زۆر سەیر: "هیچ ترسێکتان لە حیزبەکەتان نەبێت، حیزبی شیوعی عێراق، مادام فەهد لەسەرووبەوە وەستاوە". کەواتە ئێستا شتەکە ڕوونە: ئەم بڵاوکراوە نوێیە لە کەسانێکی ئینشقاق مناڵەوورتکەوە دەرکراوە. سەرهەڵدانیشی لە بارودۆخێکی تایبەتیدا، لە بلۆک و تەوژمی هەلپەرستی ئینشقاقیەوە، هیچ سەیر نیە. بلۆکێکی ئینشقاق و مناڵانە لە یەک کاتدا، ئەمە جێی سەرسووڕمان نیە. بەڵام ئەم کارە مناڵانەیە چیە گەنجێکی ساویلکەی گەمژە ناوو نازناوی فەهد دەهێنێت؟ ڕەنگە ئەوانەی ئەم کارەیان کردووە کەسانی باش بن، لەوانەیە مناڵیش نەبن لە تەمەندا، بەڵام عەقڵیان مناڵانەیە. بۆیە سروشتیە بلۆکێکی لەم جۆرە بەهاری تەمەن نەبینێت و گەشە نەکات، فراوان نەبێت و زۆر نەژی.

دوای ڕۆژێک لە ئاگاداری مەجید لە "الصواب"، ڕوونکردنەوەی زیاتر دەرکەوت:

- زانیاری هەیە لەبارەی ئەوانەوە کە دەری دەکەن؟
- یەکێک لە هاوڕێیانمان لە ڕێکخراوی کازمیە دەیانناسێت. وەک ئەو هاوڕێیە دەڵێت فلان و فلان ... هتد.
- هیچ پەیوەندیەک هەیە لە نێوان ئەمانەو "النجمة"؟
- هیچمان لەو بارەیەوە نەبیستووە.
- کەواتە با واز لەوە بهێنین. لە بارودۆخی سەختتدا شتی سەیرو غەریب دەردەکەوێت، با بچینە سەر کارە گرنگەکەمان. ئێمە خەریکی تەقاندنەوەی

بۆمبایەکی نوێی وێرانکارێن بەڕووی دوژمندا، بۆمبایەک کە نە بارووتی تێدایەو نە ماتریالی تەقینەوەیش، بەڵام ئەمڕۆ لە بارووت بەهێز ترە. ئەویش بڵاوکراوە چاپکراوەکانە!

بەڵێ، کاتی دەرکردنی بەیانات و بڵاوکراوەی چاپکراو هاتووە. ئەی بۆچی "دەستمان گرتووە" بەسەر ڕۆنیۆیەکدا ئەگەر بۆ لە چاپدانی بڵاوکراوە نەبێت؟ دەبێت چ بابەتێک لە بڵاوکراوەی یەکەمدا بێت؟ ئەوە هەر گرنگ نیە. گرنگ دابەش کردنی بڵاوکراوەیەکی لە چاپدراوە، ئەمە دوای دابڕانی چەند مانگێک لە دەرچوونی چاپەمەنیەکان هەتا حیزب بۆ دۆست و دوژمنی ڕابگەیەنێت زیندووەو تێرۆریش ئەوەندە بەهێز نیە حیزب تێکبشکێنێت. بڵاوکراوە چاپکراوەکە، بۆکسێک دەبێت بە سەروچاوی باڵوێزی بریتانی و بەهجەت عەتیەو نائل عیسادا، بەڵکو بەڕووی هەموو هەلپەرست و ئینشقاقیەکیشدا. چەند خۆشە لە بارودۆخێکدا کە دوژمن پاگەندەی ئەوە دەکات، هەتا ساڵانێکی زۆر سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە بەسەر حیزبدا، بڵاوکراوەیەکی چاپکراو لە حیزبەوە دەربچێت! هەر تەنها بیرکردنەوەیش لە بڵاوکراوەیەکی لەو چەشنە، ڕووناکی و دڵخۆشی دەخاتە دڵی هەموو هاوڕێیانەوە.

ڕەنگە باشترین بابەت لە بڵاوکراوەی یەکەمدا، ئیشارەت بێت بە هەڵوێستی خۆگرانەی هاوڕێیان، خۆگریی ئەو پاڵەوانە مەزنانەی ڕووی گەشاوەی بزووتنەوەی شیوعیین لە عێراقدا. ئەم بابەتە بایەخێکی تایبەتی هەیە لەکاتێکدا کە ڕووخانی کەسانی هیچ و پووچ دەبێتە مایەی بێبڕوایی. زۆرن ئەو هاوڕێیانەی لەبەردەم توندوتیژیی جەللادەکاندا خۆگر دەمێننەوە، بەڵام میدیای دژ، هەوڵی شاردنەوەی ئەم ڕاستیانەو دەرخستنی تەنها ئەو کەسە هیچ و پووچانە دەدات کە ڕووخاون. هاوڕێیانی نێو زیندانەکان چەند دڵخۆش دەبن کاتێک بڵاوکراوەیەکی حیزبی لەپاچدراو دەگاتە دەستیان، بڵاوکراوەیەک کە ئامادەکراوە بۆ باسکردن لە خۆگری ئەوان لە بردنەسەری ئەو گفتەی بە حیزبیان داوە لە پاراستنی

نهێنیەکانیدا! تەرخان کردنی بڵاوکراوەی یەکەم بۆ ئەم بابەتە، هەڵبژاردەیەکی سەرکەوتوو دەبێت، هەڵبژاردەیەک لە پێویستیەکی گرنگەوە دێت.

بڵاوکراوەکەو ناونیشانەکەی بریار درا: (سڵاو لە هاورێ خۆگرەکانی نێو زیندانەکان و ژوورە تاریکەکانی ئەشکەنجە بەربەریەکان)، ئەمە لەسەر ستێنسڵ چاپکرا. بێگومان دوای چارەسەری گرفتە هونەریە سادەکان، کێشەی کاتێکی گونجاویش بۆ خستنەکاری رۆنیۆکە چارەسەر دەکرێت، ئیتر بەبێ ئەوەی سەرنجی دراوسێکان رابکێشێت، حەوت خێزان لە حەوت ژووری تری نێو هەمان خانوودا.

- ام نضال، رات چیە بەرامبەر خستنەکاری رۆنیۆکە لە ناو ژوورەکەماندا بەبێ ئەوەی دراوسێکان پێی بزانن؟
- ئایا دەبێت؟ ئێوە کاری خۆتان بکەن، ئێوە خۆتان باشتر دەزانن.
- ژوورێکی بچکۆلەی جیاواز لەناو ژوورەکەدا دروست دەکەین، پرێمزەکەیش لەبەر دەرگاکەیدا دادەگیرسێنین، رۆنیۆکە دەخەینە کار، کەس پێمان نازانێت.

لە سووچی سەرەوەی ناو ژوورەکەدا، بە دووری مەترێک لە دیوارەکەوە، سندوقێکی تەختە دانراو پێخەفەکانی لەسەر هەڵچنرا. بەمەیش دیوارێکی دروستکراوی یەک مەترو نیوی بەرز کرایەوە. رۆنیۆکە لە پشت ئەو دیوارەوە دانراو مەجیدو زوهێریش بە شارراوەیی لە تەنیشتیەوە دانیشتن، هیچ شتێکیان نابینرێت گەر تەنانەت کەسێکیش بێتە ژوورەکەوە. بۆ داپۆشینی دەنگی رۆنیۆکەو ئاگاداربوونەوەی دراوسێکان لە تەقەتەقە بەهێزەکەی، هاورێیان پرێمزێکی گەورە کە بۆ ئەو مەبەستە کرِدرا بوو، لەبەردەم ژوورەکەدا دادەگیرسێنن و ئاوێکی زۆر دەخەنە سەری. پرێمز پەمپ دەکرێت و دەنگێک دەردەکات هەروەک دەنگی دینەمۆی هێلیکۆپتەر. ئەو دەنگە تەقەتەقی رۆنیۆکەی دادەپۆشی. ام نضال خۆیشی لە تەنیشت پرێمزەکەوە بوو لە بەردەم ژووەکەدا هەتا کەس بیانووی چوونە ژوورەوەی نەبێت.

لەو ژوورەدا، لەودیو دیوارە "دەستکردەکەوە" کە لە سووچێکدا دروستکرابوو، یەکەم بڵاوکراوەی چاپکراو بە ئامێرە "دەست بەسەراگیراوەکەدا" لە دایک بوو. مەجیدو زوهێر پێکەوە بەشداری پرۆسەی لە چاپدان بوون. هیچیشیان ئەزموونێکی پێشتریان نەبوو لەم کارەدا. بۆیە چاوەڕێی سەرکەوتنی تەواویان لێنەدەکرا. یەکەم کۆپی چاپکرا –ئای کە چاکە، زۆر چاکە! دووهەم و سێهەم و دەهەمیش .. بیست .. پەنجا .. سەد .. بڵێ دووسەد! تا ئێرە بەرهەمێکی چاک بوو، لەگەڵ هەر کۆپیەکی نوێدا کە دەچووە سەر کۆپیە چاپکراوەکان، حەماسی لە چاپدەران هەر زیادی دەکردو هەر دڵخۆشتر دەبوون.

لەپڕ ڕووداوێکی ناخۆش ڕوویدا: دوای نزیکەی دووسەد کۆپی، ستێنسڵەکە دڕا، چاپەکە شێواو ئیتر زەحمەت بوو ناونیشانی کۆپیە چاپکراوەکان بخوێنرێتەوە. دەبێ چی بکەین؟ خۆ ستێنسڵێکی نوێ بەو پەلەیە لە چاپ نادرێت، ئەوان خۆیان ئامێری چاپ کردنیان بەدەستەوە نیە هەتا خێرا بەکاری بهێنن. بۆیە دەبێت هەر بەردەوام بن لە چاپ بەبێ وەستان. ناونیشانەکە لەسەر کۆپیە تازەکان بە قەڵەمی مەرەکەب دەنووسرێنەوە. ئەوە چاکترین چارەسەرە، گرنگ دەرچوونی بڵاوکراوەکەیە بەبێ دواکەوتن و دابەش کردنی لە ناوخۆدا بەسەر هاوڕێیاندا.

ڕۆژی دوایی کۆپیە لە چاپدراوەکان لە نێوان هاوڕێیانی حیزب و دۆستانیدا لە بەغدا دەساودەسی دەکرد، چەندان گورزەیشی بە ڕێگاوە بوون بەرەو پارێزگاکانی تر. بڵاوکراوەکە هەروەک هاوڕێکان خۆیان و هەروەک حەقیقەت خۆی سادە بوو، بەڵام نیشانی پێکا.

* * *

مەجیدو زوهێر لەسەر هەنگاوی داهاتوو پێکهاتن لەسەر مەیدانی بڵاوکراوەو لەچاپدان: دەرکردنی بەیانێکی سیاسی لە حیزبی شیوعیەوە بۆ گەل.

- "بەیانی حیزبی شیوعی عێراق دەربارەی بارودۆخی سیاسی ئەم کاتە". ئەوە پێشنیازی ناونیشانی بڵاوکراوە نوێکە دەبێت.
- کۆکین لەسەر ئەوە.
- وە لەسەر تەگبیری پێویست بۆ پاراستنی کادرەکانمان و ڕێکخراوەکانمان. دابەشکردنی ئەو بەیانە، ئامرازە سەرکوتکارەکان دەگەیەنێتە ئاستی هیستریا، دەستدەکەن بە هەڵمەتێکی فراوانی گرتن و تێرۆر، فراوانتر لە هەرکات.
- کۆکین لەسەر ئەمەیش. پێویستە زانیاری وورد لەبارەی خۆپاراستنەوە دەربکرێت، بەڵام نابێت هەر ئەو ئاگادارییە گشتیانە بە بەس بزانرێت کە بۆ هەموو زەمان و شوێنێک دەگونجێت.
- با ئەو شتانە بنووسین کە دەمانەوێت بگاتە هاوڕێیان، یەکەم: چۆڵ کردنی گیرفان و ماڵ و دوکانەکان لە شتومەکی حیزبی، دووەهەم: هەموو هاوڕێیەک، شارراوەو ئاشکرا، خۆی بەدوور بگرێت لە شەقامەکان و چایخانەکان و دوکانە گشتیەکان، سێهەم: کادرە حیزبیەکان نابێت بەشداریی ڕاستەوخۆی پرۆسەی هەڵواسینی بەیانەکان بکەن.

ئەمجارەیش پرێمز دەخرێتەوەکارو ناوێکی ٬زۆر٬ دەخرێتە سەری، دووبارە "دیواری" دەستکرد لە ژوورەکەدا دروستکرایەوەو سەرلەنوێ ڕۆنیۆ خرایەوە کار. ئەمجارە بەرهەمەکە لەوەی ڕابووردوو باشتر بوو. هەردوو لەچاپدەرەکە ئەزموونێکی کەمیان پەیدا کردبوو. بەڵام ئەمجارە هەر (ام نضال) لە تەنیشت پەرێمزەکەوە نەوەستابوو، بەڵکو پیاوێکیشی لە تەنیشتەوە بوو کە کەمتر لە هەفتەیەک بوو هاتبووە بەغدا. ئەویش (ابو نضال) بوو. لە کوێت گەڕابۆوە! لە سەفەرە درۆینەکەی! قسەی لەگەڵ ژنە دووگیانەکەی دەکرد کە نزیکی مناڵ بوون بوو. هەر لە چەند ڕۆژێکی تردا دەبێتە دایکی سێهەم مناڵ. ئێستا دوو کچی هەیە، چەند بەهیوایە سێهەمیان کوڕ بێت! مێردەکەیشی ئەو ئاواتەی هەبوو. ئەوان باسی کاروباری خێزانی خۆیان و بیرەوەرییەکانی ڕابووردوویان و کێشەکانی

ئێستایان دەکرد. ئەمە لەکاتێکا مەجیدو زوهێر لە پشت دیوارە دروستکراوەکەوە لە ژوورەکەدا، بەردەوام بوون لەسەر لە چاپدانی بڵاوکراوەکە.

## زیانێکی گەورە

بەیانەکە، بە هەمان خێرایی پرۆسەی لە چاپدانی، ڕێگای خۆی گرتەبەر بەرەو ڕێکخراوەکانی حیزب و جەماوەری میللی، دەستەکانیش بە حەماسەوە پریان پێدا دەکرد. کرێکارێکی شیوعی کۆپیەکی بەیانەکە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و دەیبات بۆ برادەرە کرێکارەکانی لە کارگەو بە ئاشکرا، بەبێ ترس و دوودڵی، مژدەیان پێ ڕادەگەیەنێت. پاشان کۆپیەکی بەیانەکە بەرز دەکاتەوەو دەستدەکات بە دانس، دانسی خۆشی و تەحەدا.

دابەشکردنی ئەو بەیانە، سیخوڕەکانی پشکنینی تاوانکاریی شێت دەکات، بە هەموو پایتەختدا بڵاو دەبنەوە، لە شەقامدا، لە بازاڕدا، لە چایخانەدا، لە هەموو شوێنێک دەکەونە گەڕان بەدوای "ئاژاوەگێڕان" دا ئەوان بەر شەقازلەیەکی توند کەوتبوون، بۆیە دەیانەویست تۆڵە بکەنەوە. وە ئایا ٢٤ ی ئۆگۆستی بە سەلامەتی تێدەپەڕێت بەبێ ئەوەی دوژمنان سەرکەوتووبن لە لێدانێکی ئازاربەخشدا بە حیزبی شیوعی؟

دەتوانرا ئەو ڕۆژە بە سەلامەتی تێبپەڕێنرێت، ئەگەر هەموان بەتەواوی، خۆیان ببەستایەتەوە بەو بڕیارە حیزبیانەوە کە بۆیان نێردرا بوو. بەڵام هاشم ئەوەی بە پێویست نەدەزانی، هەستی بە مەترسی نەدەکرد، یان ئارەزووی خۆلادانی نەبوو لە مەترسی. لە ژوورەکەی دەردەچێتە دەرەوەو بەرەو شەقامەکان دەڕوات، بەرەو بازاڕ. بەبێ ئامانج بە بازاڕدا سووڕاوەتەوە، لە چایخانەی (سوق حنون) دادەنیشێت. بۆچی لێرە دادەنیشێت ئا لەم چرکەساتە سەختانەدا؟ بۆ خۆی ناشارێتەوە؟ ئایا کەس لە خیانەتکاران و

سیخوڕەکان نایناسن؟ ڕەنگە بەم جۆرە بیری نەکردبێتەوە، وە یان ڕەنگە بیریشی کردبێتەوە، بەڵام بێتاقەت بووبێت و چووبێتە چایخانەیەک.

مەفرەزەیەکی پشکنینی تاوانکاری دەدات بەسەر ئەو چایخانەیەدا، یەکێکیش لە خیانەتکاران لە ناویاندا دەبێت، هاشم باش دەناسێت و ماوەیەکیشە بۆی دەگەڕێت. پەلاماری دەدەن و نێچیرە "چەورەکەیان" دەگرن و دەگەڕێنەوە بۆ فەرمانگەکەیان. هەر لە یەکەم چرکەساتیشەوە، فەسڵی یەکەم لە هەڕەشەو سووکایەتی پێکردن و لێدان دەستپێدەکات. هەر لەگەڵ گرتنیشیدا، بە تەلەفۆن ئۆفیسی نائل عیسا "پشکنینی تاوانکاری" ئاگادار دەکرێت:

- گەورەم! یەکێکمان لێگرتن، لەوانەی بەیانەکانیان دابەش دەکرد، ڕاوێکی چەورمان کرد.
- هەر ئێستا بیهێنن، چاوەڕێتانین!

بەڵێ یەکێکیان لێ ڕاو کردن. ئەمە جێگای داخە. بەڵام لەوە مەترسیدارتر ئەوەیە ئەو کەسە خۆگر نەبێت. گەلێ شت لەسەر خۆگری ئەو وەستاوە، وە ئەگەر خۆگر بێت، ئەوا هەر خۆی دەبێتە قوربانی، ئەوکاتەیش شانازی پێوە دەکەین، چەپڵە بۆ ئەو خۆگریەی لێدەدەین، ناوی دەخەینە سەر لیستی پاڵەوانە خۆگرەکان. بەڵام ئەگەر خۆگر نەبێت، ئەوا زیانێکی جدییمان پێدەگەیەنێت، دوژمن دەتوانێت ڕاوی هاوڕێیانی تریش بکات. جا ئایا خۆی دەگرێت؟ کەس ناتوانێت ئەوە هەڵبێنێت کە هەڵوێستی خەباتگێڕێک چۆن دەبێت کاتێک دەکەوێتە دەست دوژمن. زەحمەتە گردو لەسەر خۆگری و خۆنەگری کەسێک بکرێت کە دەگیرێت و لە ژوورە تاریکەکاندا لێی دەدرێت و لەم جیهانە هەمووی دادەبڕێت، بەڵام مرۆڤ هەمیشە پێشبینیەکی هەیە لەسەر هەڵوێست و ڕەفتاری ئەو کەسانەی لە ڕێڕەوی کار کردندا دەیانناسێت.

هاوڕێیان لە ناخەوە هیوای ئەوەیان دەخواست هاوڕێ گیراوەکەیان خۆگر بوایەو پارێزگاری نهێنیەکانی حیزبی بکردایە. بەڵام باوەڕیان زۆر بەهێز نەبوو پێی، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لەم چەند هەفتەیەی دواییدا، جۆرە هەڵسوکەوتێکی هەبوو کە باوەڕی تەواوی نەدەدا لەسەر خۆگری لە کاتە سەختەکاندا. هەرچۆنیش بێت دەبێت مەجیدو زوهێر ئاگایەکیان لەخۆیان بێت و ئەوەندەی توانایش، بە خێرایی هاوڕێیانی تریش ئاگادار بکەنەوە تا ئاگایان لە خۆیان بێت هەتا هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە. هەموو شتێک لە چەند کاژێرێک یان ڕۆژێکدا ڕوون دەبێتەوە. مەجیدو زوهێر دەتوانن هەر لە ژوورەکەی باب الشیخ چەند ڕۆژێک خۆیان حەشار بدەن، ڕێ بە هاشم نەدرا ئەو شوێنە بزانێت. لەوانەیشە هاشم فزولیەت و حەزی زانین هانی دابێت لەو ژوورەیش بە ئاگا بێت و بزانێت ئەوان لە کوێ نیشتەجێ بوون، لەوانەیە وایدانابێت ئەو ژوورە لە گەڕەکی باب الشێخە، بەڵام نەزانێت لە کوێدایەو ناشتوانێت بیگاتێ. ئەمە ئەگەر هاتوو لەبەردەم دوژمندا خۆی نەگرت. بەڵام لەوانەیشە پاڵەوانانە خۆی بگرێت. ئایا مەحاڵە خۆی بگرێت؟

ڕۆژی دوایی هەواڵی تەواو هات: هاشم خۆی نەگرتووە. دەگووترێت تەنانەت بەر لە گەیشتنی بە بینای پشکنینی تاوانکاری، ڕووخاوە. ملکەچی بەردەم ئەو سیخوڕانە بووە کە گرتوویانە، ئامادەیی دەربڕیوە بۆ یارمەتیدانیان و ڕێ نیشاندانیان بۆ هەرچی کە دەیزانێت. بڕیاریشی داوە "تەنها ڕاوی" هەر ئەوان نەبێت، بەڵکو یارمەتیان بدات لە ڕاوی کەسانی تریشدا. ئای لەم موسیبەتە! ئای لەم سووکیە! ئامەو هەواڵی داخاوی دەهات، یەک بە دوای یەکدا، لێدانەکەیش فراوان بوو، ژمارەیەکی زیاتری گرتەوە لە هاوڕێیان و ڕێکخراوەکان:

- ئەنوەرو عوسمان بەهۆی هاشمەوە دەگیرێن. جەلال لە دەست دوژمن هەڵدێت. هاشم ژوورەکەیانی دەزانی و ڕێی نیشان داون.
- هەڵمەتی گرتن هەولێریش دەگرێتەوە. ئەو ڕێکخراوە حیزبیەی لە خۆدروستکردنەوەدا بوو، تێکی دەشکێننەوە. هاشم زانیاری تەواوی لە بارەی ئەو

ڕێکخراوەوە هەبوو. یەکێکی تریش خۆگر دەرنەچووە. ئەو کەسە زیانی بە ڕێکخراوەکە گەیاندووە.

- هاوڕێی تریش لە بەغدا دەگیرێن، لە خوێندکارو کرێکارو ڕۆشنبیران، هەندێکیان دەرباز دەبن و ناکەونە دەست پۆلیس.
- ڕێکخراوی حلەیش تێکدەشکێنرێت. لەوێ فێڵێکی پیس و چەپەڵیان بەکارهێناوە بۆ گرتنی سکرتێری ڕێکخراوەکە: نامەیەکی حیزبی دەبرێت بۆ لیژنەی ناوخۆیی لەوێ –لەوانەیە هاشم خۆی نووسیبێتی، نامەکە ئەوە یاد دەخاتەوە کە هەڵگرەکەی نوێنەری سەرکردایەتی حیزبە لە بەغدا، هاتووە کۆبوونەوە بە لیژنەی ناوخۆیی حلە بکات. داوایشی کردووە بینینێکی بە پەلە ڕێکبخرێت لەگەڵ سکرتێری ڕێکخراوەکە. نوێنەرەکەی ناوەند، سکرتێری دەوێت. بینینەکە دەبێت و هەڵمەتی گرتن دەستپێدەکات. ئەم "نوێنەرەی بەغدایش" کەس نیە مەفرەزەیەکی پشکنینی تاوانکاریی نەبێت!
- هاوڕێیەکیش لە سلێمانی گیراوە. هاشم هەر فزولیانە، ڕۆژێک بە ناونیشانی ئەم هاوڕێیەی زانیوە. ناونیشانەکەی هەڵگرتووە تا ئەو ڕۆژەو ڕادەستی پۆلیسی کردووە.

ئەمە لێدانێکی نوێی ئازاربەخشی تر بوو بەر حیزب کەوت، هێشتایش برینەکەی ئەستوورە. بەڵام ئەم لێدانەیان وەک لێدانە توندەکانی ڕابووردوو نەبوو، وەک ئەویش کاریگەر نەبوو، لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی حیزبی نەگرتەوە، لە سەرکردایەتی شەشەمی حیزب نزیک نەبۆوە. بارەگای سەرکردایەتی سەلامەتە، لە ژوورێکی بچکۆلەدایە دەستی دوژمن نایگاتێ، ئاگاداریی ڕووداوەکان دەکات، زانیاری دەردەکات، ئامۆژگاریی دەنێرێت بۆ دانانی چەند ڕێوشوێنێک بۆ چواردەورگرتنی مەترسیەکە، بۆ دەورگرتنی ناوچەی ئاگرەکە هەتا ئاگر دزە نەکات بەرەو ناوچەی نوێ.

دوای ڕووخانی هاشم، مەجیدو زوهێرو ابو نضال لە کاژێرەکانی ڕۆژدا لە ژوورەکە نەدەچوونە دەرەوە. تەنها شەوانە، لەژێر باڵی تاریکیەوە، دەردەچوون بۆ بینینە حیزبیەکانیان. ئەوان دەیانزانی هاشم هەر لە سنووری خۆنەگریدا ناوەستێتەوە، بەڵکو خۆی بۆ خزمەتی دوژمن تەرخان کردووە، وەک چەند خیانەتکارێکی تر، لەگەڵ مەفرەزە نهێنیەکانی پۆلیسدا دەسووڕێتەوە بە شەقامەکاندا بە مەبەستی ڕاو کردنی ئەوانەی هەتا دوێنێ یەکێک بوو لەوان. بێگومان هەر بە خەملاندن، شکی بۆ ژوورەکەی مەجیدو زوهێر چووە لە باب الشیخ، دوژمنیشی لێ ئاگادار کردووە. بۆیە بەتایبەتی ئەو ناوە دەپشکنن. بەدوای ناوەندی سەرکردایەتی نوێدا دەگەڕێن کە زیاتر لە دوو مانگ تێنەپەڕیوە بەسەر پێکهێنانیدا. بۆیە دەبوایە مەجیدو زوهێر زۆر بەئاگا بوونایەو لە کاژێرەکانی ڕۆژدا دەرنەکەوتنایە، ئەوەندە بەس بوو بە شەو یان بەر لە خۆرهەڵاتن دەرچوونایە، ئەوە ڕەنگ بوو مەترسیان لێ دوور بخاتەوە. ابو نضالیش دەبوایە زۆر بە ئاگا بوایە، هاشم ئەویشی دەناسی، لەو چەند ڕۆژەی پێشوودا چەند جارێک بینی بووی. پێویستە لە گەڕەکی باب الشیخەوە بگوێزنەوە بۆ گەڕەکێکی تر. بەڵام گواستنەوەیش مەترسیدارە، دەرئەنجامەکانی نازانرێت ئەگەر ئەم هەڵمەتە کەم نەبێتەوەو بارودۆخەکە هێمن نەبێتەوە.

زیاتر لە هەفتەیەک تێپەڕی بەسەر گرتنی هاشمدا. مەجیدو زوهێر وایاندانا ئیتر بارودۆخەکە هێمن بووبێتەوەو کاتی دەرچوونیانە لە پەناگاکەیان و گەڕان بەدوای ژوورێکی تردا لە گەڕەکێکی تر هەتا لە مەترسی دوورکەونەوە.

- ئەمڕۆ دووهەم ڕۆژی سپتامبرە. پێدەچێت توانای دەرچوون هەبێت بۆ گەڕان بەدوای ژوورێکداو گواستنەوەی ماڵ بۆ گەڕەکێکی ئەمین تر.
- زۆر باشە، عەسر پێکەوە دەڕۆین، ڕەنگە شوێنێکی گونجاومان دەست بکەوێت.

چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا ئەم هاوڕێیانە بیریان لە دەرچوون و گەڕان کردبۆوە بۆ بەکرێ گرتنی ژوورێکی نوێ، بەڵام ڕووداوێکی ناوخۆیی نوێ ڕێگریان بوو. (ام نضال) بە دوو سێ

ڕۆژ بەر لەوە، منالّی بووبوو. هیوای ژن و مێردەیش نەهاتەدی و کوڕیان نەبوو. ئەمە کچی سێهەم بوو. منالّ بوونەکەیش لە مالّەوە بوو بە ئامادەبوونی مامانێک. کەس لە مالّەوە نەبوو ئەو ژنە ببات بۆ خەستەخانە بۆ منالّ بوون.

مەجیدو زوهێر دەرچوون و ابو نضالیش لەگەڵیانە. پێکەوە دەرچوون. بۆچی هەرسێکیان پێکەوە دەرچوون؟ دەرچوون بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک. بە هۆکاری گەمژەیەتی پێکەوە دەرچوون، کورە بڵێ گێلۆکەیەتی. هەر یەکێکیان بەس بوو دەرچوایە بۆ گەڕان بەدوای خانوو گرتندا. ئەمە هیچی لە بابەتەکە نەدەگۆڕی. ئەگەر خوانەکردە تووشی بەڵایەک هاتن، هەموویان دەگرتنەوە. لەگەڵ ئەوەی دواکەوت، بەڵام کاتێک بە کۆڵانەکەدا دەڕۆیشتن، مەجید هەستی مەترسیەکی کرد، ابو نضالی بانگ کرد:

- پەنجا مەتر لە دوامانەوە بڕۆو هەر بەو چەشنەیش دوامان بکەوە. ئەگەر شتێک ڕوویدا لێمان خۆت دەرباز بکەو بە شوێن پێکانی خۆتا بگەڕێردەوەو هاوڕێیان لە ڕووداوەکە ئاگادار بکە.
- زۆر باشە، وا دەکەم وەک ئەوەی دەتەوێت.

هاوڕێکان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن. مەجیدو زوهێر پێکەوە دەڕۆن، بە ماوەیەکیش ابو نضال لە دوایانەوەیە. خۆشیان بە مەبەست خۆیان لە شەقامە گشتیەکان لادەدەن. بەڵام پێویستیشە لە شەقامەکە بپەڕنەوە بەرەو ئەوبەر، بەری خۆرهەڵاتی شەقامی (الشیخ عمر). پەڕینەوەکە ئاسانە، هەر تەنها پەڕینەوەیەکە. مەجیدو زوهێر لە کۆڵانێکەوە ڕوویان کردە شەقامی الشیخ عمر، گەیشتنە سەر شۆستەکە. خەریک بوون یەکەم هەنگاو بنێنە سەر شەقامەکە. هەر چەند چرکەیەکیان مابوو بۆ ئەوبەر شەقامەکە، لەوێش دەچوونە کۆڵانێکەوەو دووردەکەوتنەوە. نەیاندەزانی قەدەر شتێکی کوتوپڕی تری لێ شاردوونەتەوە هەتا ئەو چرکەساتەی خۆیان لە نێو دەستی پیاوانی پشکنینی تاوانکاریدا بینیەوە.

بەر لەوەی شۆستەکە جێبهێڵن و بچنە سەر شەقامەکە، دەستێکی نامۆ لە دواوە دەستیانی گرت، ئاوڕیان دایەوە، دەستیان بە دەستیانەوەیە. هەموو شتێک ڕوون بۆوە، مەفرەزەیەکی پۆلیسی نهێنی، لە شەش کەس پێکهاتوون، ئەمە بە هاشمیشەوە کە لەبەردەم چایخانەیەکدا وەستاوە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، تێکچووە، تەنها چەند مەترێک لە نێچیرەکانەوە دوورە. لەناو مەفرەزەکەدا، خیانەتکارێکی تریش وەستابوو کە پێشتر ڕووخابوو، لە خزمەتی ئامرازە سەرکوتکارەکاندا بوو، پێیان دەگووت جوکل.

هەردووکیان کەوتنە ئەو تەڵەیەوە بۆیان دانرابوو. پیاوانی مەفرەزەکەو هاشم، لە چایخانەیەکی بچووکدا دانیشتبوون لەسەر شەقامێکی گشتی کە دەکەوتە سەری ئەو کۆڵانەوە مەجیدو زوهێری پێدا دەڕۆیشتن، ئەرکی هاشمیش دەستنیشان کردنی ئەو دوانە بوو کاتێک بەوێدا تێدەپەڕن. ئەو ئەرکەکەی خۆی هێنایەدی، ئەگەرچی بە دەستەکانی خۆی بەشداری نەکرد لە "لێدان و ڕاکردن" دا، بە پێچەوانەی برادەرەکەیەوە، جوکل، ئەو یەکێک بوو لەو دوانەی لە دواوە هەردوو دەستی مەجیدیان گرتبوو ، دوانەکەی تریش دەستەکانی زوهێریان گرتبوو. مەجیدو زوهێر دەیانتوانی چی بکەن، دوای ئەوەی کەوتنە ئەم تەڵەیەوە؟ ئەوان خۆیان هاتن بۆ ناو تەڵەکە، ڕەنگە بەهۆی کەمی وورایی و کەمی ئەزموونەکانیانەوە بێت. کەمینە دانراوەکەی دوژمنی سەرکەوتوو بوو، بە یارمەتی چەند خیانەتکارێک. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، بیری خۆبەدەستەوەدان هەر لە بنەڕەتەوە ڕەتدەکرێتەوە. نابێت وا بزانن هەموو شتێک کۆتایی هات. نا، نابێت هیوا بڕاوبن بە یەکجاری.

کاتێک مەجید ئاوڕی دایەوە بینی هەر ئەوانن، هەر لە یەکەم چرکەساتیشدا، بە هاوبەشی هاشم و جوکلی زانی لەم کردارەدا. کەواتە با بەختی خۆی تاقی بکاتەوەو هەوڵی دەرباز بوون بدات لە دەستی ئەمانە:

- چیتان دەوێت لێمان؟ بۆ دەستتان گرتووین؟ -مەجید پرسیاری کرد.

- بێدەنگبە، بێدەنگ –یەکێک لە سیخوڕەکان وەڵامی دایەوە. کەلەپچە بکەنە دەستی.
- دەستی ببەستن، بیکوژن –جوکل گووتی.

مەجید هەموو هێزی خۆی کۆکردەوەو دەستەکانی لە دەستی سیخوڕەکان ڕاپسکاند، بەر لەوەی کەلەپچەی بکەن. بەمەیش خۆی داماڵی لەدەستیان. وە ئیتر شەڕێکی ترسناکی بێهاوتا دەستی پێکرد. شەش پیاوی چەکدار بە دەمانچەوە بەرامبەر دوو کەسی بێ چەک. بەڵام هێشتا دەمانچە نەهاتبووە نێو مەیدانی شەڕکەوە. هێشتا هەر دەست و قاچ "چەکی" سەرەکی بوون. سیخوڕەکان بێهودە هەوڵی زاڵ بوون دەدەن کە دەبینن دوو دوژمنی عینادی بەهێز لەبەردەمیاندان. مەجید لەگەڵ بەرامبەرەکەی وەستابۆوە، ڕووبەڕوو پێکا هەڵپڕژابوون، زیاتر لە جارێکیش دای بە زەویدا. بەڵام ئەوانی تر لە پشتەوەو لەملاولاوە دەیانگرت و نەیاندەهێشت ڕابکات. دووبارە بوونەوەی بۆکسە توندەکانیش ترس و شڵەژانی تێخستن. شەقام پڕ بوو لە تەماشاکاری ئەوەی لەوێدا دەگوزەرا. کەس لەم دوولایەنە پێکاهەڵپڕژاوە، پەنای بۆ تەماشاکار نەدەبرد کە دەهاتنە دەوریان و بەردەوامیش ژمارەیان زیادی دەکرد. چاوەڕێی ئەوەیش نەدەکرا ئەم خەڵکە خۆیان لەم ناکۆکیە هەڵقورتێنن، ئەوان بە باشی سروشتی ناکۆکیەکەیان دەزانی، بۆیە بێدەنگی و تەماشاکردنیان بەلاوە باشتر بوو، ئەوان پاڵپشتی سیخوڕەکانیان نەدەکرد، نەشیاندەوێرا پاڵپشتی شیوعیەکان بکەن، بۆیە هەر سەیریان دەکرد. ئەم شەڕەیش نابێت زۆر درێژە بکێشێت.

مەجید خۆی بەرداو لە هەمان ئەو کۆڵانەوە کە لێوەی هاتبوو، کەوتە ڕاکردن. ئینجا ئەوان، دوای شکستیان لە بەکارهێنانی دەست، پەلاماری دەمانچەیاندا. بەچڕی دەستیان کرد بە تەقە. ڕادەکەن بەدوایداو تەقە دەکەن. لەو کاتەدا مەجید نەیدەزانی ئایا هاوڕێکەی تری دەرباز بووە لە دەستیان یاننا، ئەوەی دەکرێت هەر ڕزگار کردنی خۆیەتی. ئەوەیش ئاسان نیە. ئەوەتا ڕادەکات و فیشەک بەدوایەوەیەتی و لە بەردەمیەوەو لە پشتیەوەو لەملاولایەوە دەدات بە زەویدا. هاکازانیت فیشەکێکی پیا چزا. لەگەڵ ئەوەیشدا

گەڕانەوەو بیر کردنەوە لە خۆبەدەستەوەدان نیە. ئەو زۆر خێراتر لەوانە ڕایدەکرد کە بە دوایەوە بوون. بە هەنگاوی خێراترو فراوانتر ڕایدەکرد. تا ئەوان مەترێکیان دەبڕی، ئەو دوو مەتری دەبڕی. مەحاڵە بیگرن، ئەگەر فیشەکێک نەیپێکێت. ژنانی گەڕەک لە ماڵ هاتنەدەرو لەبەر دەرگاکانیاندا، بە ترس و گریانەوە "یا ئەڵلا، یا پێغەمبەر"، لە کۆتایی ئەو کۆڵانەدا کە مەجید پێیدا ڕایدەکرد، گەنجێک وەستابوو، جزداشەیەکی لەبەردابوو، نەعلێکی لە پێدا بوو، سەیری ڕووداوەکە دەکات. سیخوڕەکان بانگیان دەکرد ڕێگاکە دابخات لە مەجید:

- بیگرن شیوعیە! بیگرن شیوعیە، سەهیۆنیە!

لەو کاتەدا مەجید بە ڕاکردنەوە گەیشتە نزیکی ئەو گەنجە، گوێم لێ بوو لەبەر خۆیەوە وەڵامی دانەوە بەجۆرێک نەگاتە گوێی ئەوان:

- " " –لە هەمانکاتدا مەجیدی هاندەداو دەیگووت –"خێراتر ڕاکە، ڕاکە".

ئەو ووشە جوانانە کارێکی باشی لە مەجید کرد، هەر بەکردەوە هاندەری بوو، ئەو لاوە سادەیە کە هیچ شتێک لەبارەی مەجیدەوە نازانێت تەنها ئەوە نەبێت کە شیوعیەو پۆلیس بەدوایەوەیەتی، نارەزایەتی خۆی دژی هەڵسوکەوتی پۆلیسێی نهێنی و سۆزی خۆی بۆ پیاوێکی ڕاکردوو بەو جۆرە دەربڕی. ئەو لاوە بەغداییە، ڕای جەماوەری بەو ووشە سادانە دەربڕی، دەربارەی خۆشەویستی جەماوەر بۆ شیوعیەکان و ڕقی لە ڕژێمی بەکرێگیراو. ڕژێمی پادشایەتی لە میللەت دابڕابوو، حیزبی شیوعی پەیوەندیەکی پتەوی بە گەلەوە بوو. ئەمە مانای ووشەکانی ئەو لاوە بوو.

مەجید هەر بەردەوام بوو لە ڕاکردن. هەموو چرکەیەکیش دووریی نێوانی لەگەڵ ئەوانەی بەدوایەوە بوون، زیادی دەکرد. دەرباز بوو لە دەستیان. بە بەردەم ئەو دەرگایەشدا ڕایکرد کە جێگای نیشتەجی بوونی بوو لەگەڵ هاوڕیکانیدا، بەڵام نەچووە ژوورەوە. بێگومان

نەدەکرا بچێتە ژوورەوە کەمێکی تریش ڕایکرد، ئاوڕێکی دایەوە کەسی نەبینی بەدوایەوە. وون بوو لێیان و توانای ڕاونانیان نەما. کەمێکی تریش ڕۆیشت، دوای ئەوەی هەستی کرد مەترسی نەماوە، ئینجا هەستی هیلاکیەکی زۆر دایگرت. هەناسەبڕکێیەکی زۆری پێکەوت. بۆچی نەچێتە ناو ماڵێک لەم ماڵانەوە، هەر ماڵێک بێت لەم ماڵانە؟ ڕەنگە ئەم بیرەیشی لەژێر زەبری هیلاکیدا بۆ هاتبێت، ئەمە جگە لە هەستی نەمانی مەترسی. لە کۆڵانێکدا نزیک بە گۆڕەپانی (سباع) دەرگایەکی کراوەی بینی، بەشێوەیەکی ئاسایی چووە ژوورەوە. لە هەیوانەکەیدا کۆمەڵێک ژن، لەسەر زەویەکە، لە دەوری پیاوێک دانیشتبوون، ئەویش دانیشتبوو، بە تەمەن، نیوە کاڵ، قژێکی سوور، ڕیشەکەی ڕێکوپێک، کەواو چاکەتی لە بەردا بوو، عەگاڵ بە سەریەوە. لە چرکەساتی چوونە ژوورەوەی مەجیددا بۆ ناو ماڵەکە، ژنەکان قاقایان لێدەدا، بەڵام پیاوەکە هەر زەردەخەنەیەکی کرد. بۆچی؟ مەجید هۆکاری ئەم پێکەنینە تێنەگەیشت، لەو کاتەیشدا هیچ شتێک گرنگ نەبوو بەلایەوە خۆی و هاوڕێکانی نەبێت کە ئەو چارەنووسیان نازانێت. سڵاوی لێکردن و ووتی:

- ڕێگەم دەدەن کاژێرێک ئا لێرەدا بمێنمەوە؟

پیاوەکە بەبێ دوودڵی و بەبێ پرسیار ڕازی بوو، بە سەر ئیشارەتی ڕەزامەندی دەربڕی و گووتی:

- سەرکەوە سەربان و لەوێ دانیشە.

مەجید سەرکەوتە سەربان و بە تەنها دانیشت، هەرچیەکیان بەسەر هاتبوو لەگەڵ زوهێرو ابو نضالدا، هاتەوە بیری، لە خۆی پرسی "دەبێت ئەوان چیان لێ بەسەرهاتبێت! خۆزگە دەمزانی". باوەڕێکیشی بەوە هەبوو کە ابو نضال لە دواوە بوو کاتێک ئەوان لووتیان تەقی بە لووتی مەفرەزەکەدا، بۆیە لەوانەیە سەلامەت بوو بێت لەو مەترسیە، ئەوەیشی دەزانی کە بگەڕێتەوەو خۆی ڕزگار بکات، ئەگەر ئەوان شتێکیان لێ بەسەرهات. هەلێکی گونجاوی هەبوو بۆ خۆدەرباز کردن، بۆیە بێگومان خۆی لە مەترسیەکە لاداوە.

ئەی زوهێر چی بەسەرهاتبێت؟ زەحمەتە پێشبینی چارەنووسی بکرێت. یان دەرباز بووە لەدەستیان وەک مەجید. یان فیشەکێک پێکاویەتی و کەوتووە، یان .. یان .. هتد. ئەی ماڵەوە؟

ئێستا لە ماڵەوە چی ڕوودەدات؟ تۆ بڵێی ابو نضال توانیبێتی هەر یەکسەر بگەڕێتەوە ماڵەوە؟ ڕەنگە توانیبێتی. بەڵام مەجید ناتوانێت بگەڕێتەوە ماڵ دوای داهاتنی تاریکی نەبێت.

پیرەژنێک بە پەرداخێک ئاوەوە سەرکەوتە سەربان و زنجیرەی بیرکردنەوەکانی مەجیدی پچڕاند:

- کوڕەکەم ئاوێک بخۆرەوە.

ئەمە گرنگی پێدانێکی باش بوو لەو پیرەوە، بەتایبەت مەجید هەر بەڕاستی تینووی بوو، ئاوەکەی خواردەوەو سوپاسی کرد. پەرداخەکەی لێ وەرگرتەوەو پرسی:

- کوڕەکەم ئەوە چی ڕوویداوە لێت؟
- پۆلیس ڕاوی ناوم.
- بۆچی؟
- چونکە لە خزمەتی عەسکەری هەڵاتووم –مەجید ئەم درۆیەی دۆزیەوە هەتا ئەو هۆکارە ڕاستەقینەیەی پێدابپۆشێت کە بەم حاڵەی گەیاندووە.
- ئەی بۆ لە سوپا ڕاتکردووە؟

چونکە کەس نیە بژێوی دایکم و خوشکەکەم دابین بکات من نەبێت. ڕامکردووە بۆ ئەوەی کار بکەم و ژیانێکیان بۆ دابین بکەم.

- چاوەکەمی! کوڕەکەی منیش ڕاکردوو بوو، گرتیان .. خوا گەورەیە.

بەو ووشانە ئەو پیرە، فەسڵی یەکەمی قسەکانی لەگەڵ مەجید کۆتایی هێنا. ڕۆیشت و گووتی شووتیت بۆ دەهێنم. مەجید سەرلەنوێ تەنها کەوتەوەو سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد: دوای کاژێرێکی تر خۆر دەنیشێت. هەر کە تاریک داهات دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. دەبێت یەکسەر ماڵەکە بگوێزنەوە، ئەگەر ابو نضال فریا نەکەوتبێت، دەبێت هەر ئەمشەو خێزانەکە بگوێزرێتەوە، هەر بە گەیشتنی بۆ ماڵەوە. ئەی ئەم ماڵەی مەجید لە سەربانەکەیان دانیشتووە؟ ئایا مەترسی ڕووی تێناکات؟

مەجید بیری دەکردەوە، لەم بیرکردنەوەیەوە دەچووە سەر ئەویان، بیری لەو دوو سەرەیش دەکردەوە کە لە سیاجەکەی نێوان ئەم سەربانەو سەربانی ماڵە دراوسێکەیانەوە سەرەتاتکێیان بوو. دوو لاو بوون لە سەربانەکەی تەنیشتیانەوە هەڵقوڵان! ئەمانە کێن؟ دەبێ کێ بن؟ بڵێی مەجید لێرەدا کەوتبێتە تەڵەوە دوای ئەوەی لە تەڵەکەی ڕابووردوو ڕزگاری بوو؟ شەپۆلێکی گەورە لە هەستی دڵەڕاوکێ و سەرسووڕمان دایگرت و ئەگەری کەوتنە ناو سووڕێکی نوێی خستە بەردەم خۆی، بەڵام لە چەند چرکەیەکدا یەکێک لە لاوەکان کێشەکەی یەکلا کردەوە، ئیتر بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە دڵەڕاوکێکەی مەجیدەوە هەبێت:

- لە هیچ مەترسە. ئێمە چاودێری هەموو گەڕەکەکەو کۆڵانەکە دەکەین. ئەگەر هاتن ئێمە چەواشەیان دەکەین و ڕێگایش بە تۆ پیشان دەدەین چۆن سەربانەو سەربان دوورکەویتەوە تا ڕزگارت دەبێت.
- ئەی چی لە بارەی منەوە دەزانن؟ کێ پێی ووتن من لێرەم؟
- دایکم پێی گووتین. ئەو لەو ماڵە بوو کاتێک تۆ هاتبوویتە ژوورەوە. گەڕایەوەو ئاگاداری کردین. ئێمە دراوسێین.
- ئەی هەر ئێوە لە ماڵەکەتاندا ئەمە دەزانن؟
- نا، هەموو کووچەکە دەزانن. ژنان هەواڵەکەیان گواستەوە. بەڵام مەترسە، هەموویان وەک ئێمە خۆشیان دەوێیت.

"هەموو کووچەکە زانیویەتی"! کەواتە پرسەکەی مەجید نهێنی نەماوەتەوە! ئەمە شتێکی دڵخۆشکەرو خەفەتباریشە پێکەوە. جێی خەفەتە، چونکە بە هەموو "کووچە" کەدا بڵاوبۆتەوە، لەوانەیە ئەمە بگاتە گوێی کەسێکی خراپ و مەترسیەک بەکێش بکات بۆ مەجید. دڵخۆشکەریشە، چاکەی ئەم جەماوەرەو سۆزیان بەرامبەر هەرکەس بەرەنگاری دەسەڵاتی کۆنەپەرست دەبێتەوەو لێی یاخی دەبێت، دابڕانی حوکمی پادشایەتی دەردەخات لە جەماوەر. گەنجێک پەنای بۆ ئەم کووچەیە هێناوە نە کەسی تێدا دەناسێت و نە کەسیش دەیناسێت، خۆی ڕایدەگەیەنێت لە دەست دەسەڵات هەڵاتووە، یاخیە لە ڕژێم، خزمەتی عەسکەری لە سوپای ئەم دەسەڵاتەدا ڕەتدەکاتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا جەماوەری "کووچە" باوەشی بۆ دەگرنەوە، ئەم لاوەیش پاسەوانی دەکات و زامنی سەلامەتی دەکات!

پیرە هاتەوە بۆ سەربان، قاپێک شووتی بەدەستەوە بوو:

- بخۆ کوڕەکەم. دوای نیو کاژێریش چاییت بۆ دەهێنین.
- پورە گیان، پێت نەگووتم چارەنووسی کوڕەکەت چی بوو کە لە سوپا ڕایکرد. ئێستا لە کوێیە.
- لە خوا بەزیاد بێت خزمەتی خۆی کردو کۆتایی-هات. دوای تۆزێکی تر لە بازاڕ دەگەڕێتەوە.

خۆر لە ئاوابوون نزیک دەبووەوە، خێزانەکانی نێو ژووری ماڵەکان، وورده وورده سەردەکەوتنە سەربان تا لەوێ نان بخۆن، لەبەر ئەوەی فێنک تر بوو، هەوایەکی کراوەی هەبوو. ئەمانە چوار خێزانی زەحمەتکێش بوون. هەموویان پێشبڕکێی میواندارێی مەجیدیان دەکردو قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردو هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخواست. مەجید باوەڕی بەوە هێنا کە دەیتوانی سۆزو ڕێزی زیاتریان دەستبخات ئەگەر بیانزانیایە لەسەر شیوعیەت ڕاو نراوە.

تاریک داهات، مەجید حەزی لە جێهێشتنی ماڵەکە بوو. داوای لە گەنجێکی ماڵەکە کرد چەند پارچە جلێکی بە قەرز بداتێ بەر لە ڕۆیشتنی هەتا بتوانێت شێوەی خۆیی پێبگۆڕێت. داواکەی ڕەتکرایەوە. لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵەوە، هەر بە ئارەزوو ڕێگایەکی درێژی گرتە بەر. ئەو شەقام و ڕێگایانەی دەپشکنی کە بەرەو ماڵ دەڕۆیشت، چاودێریی دەرگای ماڵەکەی کرد بۆ دڵنیابوون لەوەی چواردەوری نەگیراوە. ئینجا لە شووشەی پەنجەرەکەوە ڕوانیە ناو ژوورەکە. هەر (ام نضال) و منداڵەکانی لەوێ بوون. کەواتە لێرە هیچ ڕووینەداوە. خۆی کرد بو ژووردا و پرسی:

- (ابو نضال) و زوهێر هیچیان نەگەڕاونەتەوە؟
- نا، نەگەڕاونەتەوە. هیچ ڕوویداوە؟
- لەوانەیە گیرابێتن. بەڵام سەرم سووڕدەمێنێت لە نەگەڕانەوەی (ابو نضال). تووشمان بوو بە تووشی مەفرەزەیەک لە پۆلیسی نهێنی و خیانەتکارانەوە. بەڵام (ابو نضال) لە دوامانەوە بوو، دوور لە ئێمە، بۆیە باوەڕم نەدەکرد ئەو تووشی شتێک هاتبێت.

ژنە تێکچوو، ڕووخساری زەرد هەڵگەڕا، وە ئیتر لێوێ هەڵنەهێنایەوە. ئەمە لەکاتێکا مەجید دەستی کرد بە ئامادەکاری بۆ جێهێشتنی ماڵەکە. بەر لە هەرچی هەموو نووسراوە حیزبیەکانی سووتاند، بۆ ئەوەی لە خراپترین حاڵدا، نەکەونە دەست دوژمن.

* * *

- هاوڕێ (ام نضال)، دەبێت ماڵەکە جێبهێڵین –مەجید دوای چەند خوولەکێک لە گەیشتنەوەی بۆ ماڵ و سووتاندنی کاغەزەکان ئەوەی ایگەیاند.
- بۆ کوێ بڕۆین؟
- نازانم. دەبێت دەرچین هەرچۆن هەیە. جێگایەک دەدۆزینەوە بۆ خۆمان.

ژنەکە بێدەنگ بوو، پاشان بە خێرایی کەوتە خۆ ئامادە کردن. ئەو واقیعیانە دەیڕوانیە ئەم هەڵوێستە. "کەژاوەکە" لە ماڵ دەرچوو –مەجیدو (ام نضال) و هەر سێ منداڵەکە، لە ناویشیاندا ئەو منداڵەی کە هەر سێ ڕۆژ تەمەنی بووا مەجید دوو بەتانی هەڵگرت، (ام نضال) منداڵە تازە بووەکەو چەند قاپ و قاچاخێکی هەڵگرت و کەوتە پێش دوو منداڵەکەی ترەوە. بەرەو کوێ؟ ماڵی هاوڕێیەک یان دۆستێک نازانن ڕووی لێبنێن. مەجید لە بارودۆخێکی ئاوادا، مانەوە لە ئوتێلیش بە باش نازانێت. بە کۆڵانەکەدا دەڕۆیشتن بەبێ هیچ ئامانجێک. مەجید بیری دەکردەوە پەنا بۆ چی ببەن. لەکوێ؟ ڕەنگە بتوانن شەوەکەیان وەک میوانی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) بەسەر ببەن، مەزارگەکەی بینایەکی گەورەیە، جێگای سەدانی تێدا دەبێتەوە، گەلێ جار بێ جێگاوڕێگاکان هانای بۆ دەبەن. با ئەمە تاقیبکەنەوە.

لە سووچێکی ئەم بینا فراوانەدا دانیشتن، بەتانیەکیان بۆ منداڵەکان ڕاخست. زۆری نەبرد خزمەتچیەک هات و داوای لێکردن مەزارگەکە جێبهێڵن "بوونی ژن لە شەودا لێرە قەدەغەیە". دیارە دەبێت شێخی مەرحوم دانی بە مافی ژندا نەنابێت لە یەکسانیدا لەگەڵ پیاو، بەڵکو بەلای پیاودا دایشکاندۆتەوە! سەرلەنوێ "کەژاوەکە" دەرچووەوە سەر شەقام، خەویش تینی بۆ منداڵەکان هێناوە. کوێ؟

- مەجید لە یەکێک لە هاتووچۆکارانی پرسی: ئەرێ کاکە گیان، لە کوێ شوێنێک، ئوتێلێکی هەرزانمان دەستدەکەوێت تیایا بمێنینەوە؟
- (خان الصدرية) –هەرزانترین شوێنە.
- ئەو خانە لە کوێیە؟
- لەو شەقامە بپەڕنەوەو بچنە ئەو کۆڵانەوە، لەوێ بپرسن ڕێتان نیشان دەدەن.

وا دیارە ئەمە چاکترین چارەسەر بێت. چارەکێک تێنەپەڕی مەجیدو (ام نضال) و منداڵەکان، لە ژوورێکی نهۆمی دووهەمی خاندا[6] بوون. ژوورەکانی نهۆمی یەکەم جێگای ئاژەڵی ئەو جووتیارانە بوو میوەو سەوزەیان دەهێنا لە پایتەخت بیفرۆشن. ژوورەکانی نهۆمی دووهەمیش بۆ ئەو جۆرە بوو لەو مرۆڤە جووتیارانەو کەسانی وەک ئەوان. مانەوەیش لەوێ بە بیست فلس بوو، ئیتر بۆ مرۆڤێک یان بۆ ئەسپێک. بە ویژدانیشەوە ئەوە یاد بخەینەوە، ژوورەکانی نهۆمی دووهەم ڕاخەری تێدا بوو. جگە لەوە، خاوەن "ئوتێل" هیچ پێخەفێکی تری نەدەدا بە میوانەکان. مەجید هەر لە پێشەوە کرێی ژوورەکەیدا. ئەو شەوە ئێجگار خاوو هیلاککار بوو، منداڵە تازەبووکە کە سێ ڕۆژ تەمەنی بوو، زۆربەی کاژێرەکان دەیزریکاند.

لەگەڵ خۆرکەوتندا "کەژاوەکە" خانی جێهێشت. مەجید تاکسیەکی ڕاگرت و داوای لێکرد بیانباتە (هویدی) لە (الكرادة الشرقية)، لەوێ ماڵی هاوڕێ هورمزی دەزانی و هاوڕێکەیشی باش دەناسی، ناسینێکی حیزبی. وا چاکە پەنا بۆ ئەم ماڵە ببەین هەتا تەگبیرێکی باشترو گونجاوتر دەدۆزینەوە.

مەجید خێزانە ماندووەکەی لە بن دیوارێکدا لەناو لقێکی شەقامەکەدا دانیشان، زەنگی دەرگای لێدا، هورمز خۆی هاتە دەرەوەو بەخێرهاتنی کرد.

- هاوڕێ، هاتووین میوانێکی وەختیتان بین. ناچار بووین بێین.
- ئای بەخێربێن. بەڵام باوکم هێشتا لە ماڵە. کاژێری نۆ دەڕوات بۆ کار. تا ئەوکاتە ئەو سەرۆکی ماڵە، وە ناهێڵێت پێشوازیی میوان بکەم.
- ئەی چارە؟

[6]. جاران شاری بەغداو شارەکانی تری عێراقیش، بینای تێدا بووە بۆ مانەوەی خەڵکی، ئەمە ئەو براوە بە خان. ووشەی خان لە فارسیەوە دێت، بەو شوێنە دەگووترێت خەڵکی تێدا دەمێننەوە وەک ئوتێل، مۆتێل، هتد. کاروانی و بازرگانەکانیش لە خاندا دەمانەوە کە بەشێکی بۆ ئەسپ و هێسترو گوێدرێژەکانیان بووەو ژووری نووستنی خۆشیانی تێدا بووە. زۆرجار خانەکان، هەژارانیشی گرتۆتەخۆ.

- تەنها چارە ئەوەیە لە دەرەوە چاوەڕێ بن تا باوکم دەڕوات، ئینجا وەرنە ژووردوە.

مەجید حەزی لەم چارەسەرە نیە، بەڵام دەبێت قبوڵی بکات بیەوێت یاننا. دەبێت چاوەڕێ بن هەتا باوکی هورمز ڕیشی دەتاشێت و جلەکانی ڕێکدەخات و ماڵ جێدەهێڵێت بەرەو ئەو دوکانەی ئەلکهولی تێدا دەفرۆشێت، ئەمە خووی هەموو ڕۆژێکی بووە. هورمز لاوێکی سادە، شیوعیەکی بە حەماس، پراکتیزەی چالاکیەکی دیارو دەرکەوتوو دەکات لەو کۆلیژەی لێی دەخوێنێت، بەڵام ئازادیی هەڵسوکەوتی نیە لە ماڵەوەو ناتوانێت لە ئیرادەی باوکی دەرچێت.

مەجید لە نزیک هاوڕێکەی و مناڵەکانیەوە پیاسەی دەکرد، لەپڕ لاوێکی ئەسمەری بینی بەسەر پاسکیلێکەوە پارچە سەهۆڵی دابەش دەکرد بەسەر"کڕیارەکانیدا". ئەو لاوە دەناسێت، لەوەوپێش زیاتر لە جارێک لە بینینە حیزبیەکاندا یەکتریان بینیوە. لە کوێ و بۆچی بینیویەتی؟ بیری کەوتەوە لە کاتێکدا بینیویەتی کە شتی پێدا ناردووە بۆ هاوڕێیانی یەکێک لە زیندانەکان. هاوڕێی سەهۆڵ دابەشکەریش بە دەوری خۆی، سەیرێکی مەجیدی کردو ناسیەوە:

- سڵاو هاوڕێ سەبار. ئای کە ڕێکەوتێکی باشە لێرەدا دەتبینین.
- هەزار سڵاو. دڵخۆشم دەتبینم.
- ئێستا کاری چی دەکەیت؟ دەبێت هەتا کۆتایی وەختی بڕیاردراو هەر بمێنیتەوە؟
- کرێکارم لەلای خاوەن دووکانێک، وەک دەبینیت سەهۆڵ دابەش دەکەم بەسەر کڕیارەکانی ئەودا. بەشی سەرلەبەیانی دابەش دەکەم بەسەر ماڵەکان و دوکانەکانداو ئیتر کار جێدەهێڵم.
- کەواتە دوای نیوکاژێر دەگەڕێیتەوە بۆ لامان. میوانت دەبین.
- بەخێرایی دەگەڕێمەوە بۆ لاتان هاوڕی، بەخێرایی. هەر دوای تۆزێک دەچینە ماڵی ئێمە.

سەبار دوای چارەکێک گەڕایەوەو مەجیدو ئەم خێزانەی بردە ماڵی خۆی لە گەڕەکی (الزوية). ماڵەکە خانوویەکی قوڕینەی بچووک بوو، چەند ماڵێکی لێک نزیک بەدەم گۆڕەپانێکی بچکۆلەوە کە دیوارێکی قوڕینە بە دەوریدا کراوە. خەڵکی ناو ماڵەکە بریتی بوو لە سەبار، ڕۆژانە بە ٢٠٠ فلس کار دەکات، ئەوەیش هەموو داهاتی خێزانەکەیە، برایەکی (سباهی) قوتابی ناوەندی، باڵا بەرزێک، باریکەلە، چاو گەورە، هێشتا مووی لێنەهاتبوو، لەگەڵ دایکە پیرە باشەکەیاندا کە شانازی بە کوڕە گیراوەکەیەوە دەکرد لەسەر شیوعیەت، چوارهەم کوڕی بچکۆلەیش فەلاح.

ئەم خێزانە کرێکاریە شیوعیە زۆر بە گەرمەوە پێشوازیی میوانەکانیان کردو خواردنێکی باشیان بۆ ئامادە کردن: باینجان و تەماتەی سوورەوە کراو.

هەر لەگەڵ گەیشتنیاندا بەماڵی سەبار، یەکەمین گرفتێک کە قورساییەکی لەسەر مەجید دروست کردبوو گرفتی ژوورەکەی باب الشیخ بوو، گرفتی دەرباز کردنی ڕۆنیۆکەی لەو ژوورەدایە. لەوانەیە بدەن بەسەر ماڵەکەداو ئامێرەکەمان لە کیس دەچێت کە بە نرخترین شتی حیزبە. چۆن چارەی ئەمە بکەین بەر لەوەی کات بەسەر بچێت؟ بیرێک لەلای مەجید گەڵاڵە بوو لەو ڕووەوە: یەکەم، دڵنیابوون لەوەی کە نەچوونەتە سەر ماڵەکە، دووهەم، گواستنەوەی ماڵەکە بە خێرایی و بە نهێنی. ئێستا فاکتەری کات گرنگە، نابێت یەک خوولەک لەدەست بدرێت. دەکرێت جێبەجێ کردنی ئەرکەکە بخرێتە ئەستۆی سەبارو (ام نضال)، دەبێت پێشیان بگوترێت چۆن هەڵسوکەوت دەکەن.

- (ام نضال)، ڕات چیە لەگەڵ سەبار بڕۆن و یەکسەر شتومەکی ماڵەکە بگوێزنەوە؟
- ئامادەی جێبەجێ کردنی هەر شتێکم کە دەتەوێت.
- لە پێشدا بچۆ بۆ ئەو بازاڕەی ژنانی دراوسێ بۆی دەچن، ڕەنگە لەوێ هەندێکیان ببینیت و هەواڵێکی ماڵەوە بزانیت، ئایا پۆلیس چۆتە سەر ماڵەکە یاننا. ژنان

ئەوەت لێناشارنەوە. هەرچی ڕوویدابێت پێت دەڵێین. ئەگەر چووبوونە سەرمان، ئەوا ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە. دەنا یەکسەر بڕۆن بۆ گواستنەوەی شتەکان.

- زۆر باشە، هەروا دەکەین.
- لە سووچێکی گۆڕەپانەکەی ئەم خانۆچکەیەدا، گفتوگۆ لەگەڵ کرێکارە شیوعیەکەیش، سەبار کرا.
- من زۆر ئامادەم. با هەر ئێستا بڕۆین، بەبێ دواکەوتن.
- هاوڕێ سەبار بیرت نەچێت چیم گووت: دڵنیابوون لە سەلامەتی ماڵەکە تا ئەم کاتە، گواستنەوەیەکی زۆر خێرا. یەک چرکە کات لە دەست نەدەن.

سەبارو (ام نضال) بە خێراییەکی خەیاڵی ئەرکەکەیان جێبەجێ کرد. نای لەم کارە چاکە! هەموو شتەکان بە باشی گەیشتن و ئامێرە بە نرخەکەیش ڕزگار کرا! بەردەوام دەبین لە لەچاپدانی بڵاوکراوە حیزبیەکان، با دوژمن هەر بڵێت. مایەوە ئەوەی چارەنووسی هاوڕێیان زوهێرو (ابو نضال) بزانرێت. هەموو دەلیلەکان ئیشارەتن بۆ ئەوەی کە کەوتوونەتە دەستی دوژمن. بەڵام دەبێت هەر چاوەڕێی هەواڵێکی دڵنیا بین. (ابو نضال) تۆ چۆن کەوتیتە دەست دوژمن؟ دەبێت هەڵەیەکت کردبێت و ووریایش نەبووبێتیت. ئەی ئێستا چیتان لێدەکرێت لە ژوورە تاریکەکانی شکەنجەداندا؟ بێگومان ئێستا پۆلیسەکان بەربەریانە، خەریکی ئەشکەنجەدانتانن. دەیانەوێت بتاهێننە زمان و خیانەت بکەن و هاوڕێکانی ترتان بدەن بەدەستەوە. ئەو تاوانکارانە، دەیانەوێت شەرەف و کەرامەتتان لێ بسەننەوە. لە هیچ کردارێکیشیان سوود وەرناگرن. ئەو ڕژێمەی ئەوان بەرگریی لێدەکەن دەڕووخێت، ئایندە بۆ ئێمەیە، بۆ خەباتگێڕە شۆڕشگێڕەکان، بۆ جەماوەریی میللی.

خانۆچکە بچکۆلەکەی کە خێزانی کرێکارە شیوعیەکەی تێدا دەژی، سەبار، لە گەڕەکی (الزاوية)، بوو بە "بارەگای" نوێی سەرکردایەتی. بارودۆخی کارکردن لێرە باشتر بوو لە "بارەگا" کانی پێشتر. لەوێ "بیناکە سەربەخۆیە"، لە خانوەکەدا ژوورێک نیە ژووری زۆری

هەبێت. بۆیە ئیتر مەجید، لە ماڵە تازەکەیدا، بە پرس و ڕا بە هاوڕێ سەبار، بەڵکو بە لاوە منداڵکارەکەیش کە تەمەنی ١٦ساڵان بوو (سباهی) و خۆیشی بە شیوعی دەزانێت، ئامادەی جێبەجێ کردنی هەر ئەرکێکە پێی بسپێردرێت، گەرچی تا ئێستایش نە پاڵێوراوە بۆ حیزب.

مەجید دەستی کردەوە بە پەیوەندی بەو ڕێکخراوانەوە کە مابوونەوە، بەو هاوڕێیانەیشەوە کە دەرباز بووبوون. چەند هێڵێکی ڕێکخراوەیی کە دامەزرێنرابوونەوە، پارێزراو مابوونەوە، چونکە هاشم هیچی لە بارەوە نەدەزانین. چەند هاوڕێکەیش لەوانەی دەرباز بووبوون و خۆیان شاردبۆوە، سەلامەت مابوونەوە، لە نێوانیاندا جەلال کە پێشتر لە ژوورێکدا دەژیا لەگەڵ هاشم.

هەواڵی دروست لە بارەی چارەنووسی هەریەکە لە زوهێرو (ابو نضال) دوە گەیشت. یەکەمیان هەوڵی ڕزگار بوونی داوە لە دەست پۆلیسی نهێنی، بەکردەوەیش ڕزگاری بووەو ڕای کردووە، بەڵام فیشەکی دەمانچەی یەکێکیان داویەتی لە ڕانی و کەوتووەو بردوویانە بۆ پشکنینی تاوانکاری و بە بەندکراوییش براوە بۆ خەستەخانە. دووەمیان بەهۆی کەمی ووریایی و هەڵەی خۆیەوە کەوتۆتە دەستیان. هەر لە سەرەتاوە ئامۆژگاری کرا بوو پەنجا مەتر لە دوای هاوڕێکانیەوە بڕوات هەتا ئاسان خۆی ڕزگار بکات ئەگەر شتێکی ناکاو ڕوویدا لێیان. ئەو بەکردەوە لە دوایانەوە بوو. وە توانیبوویشی لە هەمان کووچەوە بگەڕێتەوە لە چرکەساتەکانی یەکەمی ڕووداوەکەدا، بەڵام لەجێی خۆی ووشک بووە، ڕەنگە بەهۆی تێکچوونەوە بووبێت کە لەکتوپڕدا تووشی هاتووە هەتا کەوتۆتە بەر چاوی ئەو ڕووخاوەی لەگەڵ مەفرەزەی پۆلیسی نهێنیدا بووە، ئەویش پەنجەی بۆ درێژ کردووە بیگرن. هەر لە یەکەم چرکەیشەوە، خستوویانەتە ژێر ئەشکەنجەیەکی جەستەیی و سایکۆلۆژی دڕندانە، داوایان لێکردووە بیانباتە ئەو ماڵەی لێی دەژی. تا ڕۆژی چوارهەم خۆی گرتووە. دەڵێن دوای ئەوە بردوونی بۆ سەر ماڵەکە، بەڵام بینیویانە چۆڵەو جێهێڵراوە. خاوەن خانوویان گرتووە کە خۆیشی لە یەکێک لە ژوورەکانیدا دەژیا، سووکایەتیەکی زۆریان پێکردووەو زۆریشیان لێداوە:

- بۆ کوێ چوون ئەوانەی لە یەکێک لە ژووری خانوەکەی تۆدا نیشتەجێ بوون؟ وەڵام بدەرەوە، وەڵام .. !
- جا من چۆن ئەوە بزانم؟ ئەوەی دەیزانم هەر ئەوەیە پیاوێک لەگەڵ ئەو ژنەدا هاتن کە لێرە دەژیا، شتەکانیان گواستەوە. ئێ خۆ من بۆم نیە ڕێیان لێبگرم کە دەڕۆن، هەموو کرێکەشیان داپێم بە تەواوی.

مەجید بێتاقەت بوو ئەو دوو هاوڕێیەی لەدەست بچێت کە لە ڕۆژە سەختەکاندا، لەژێر سەقفێکدا دەژیان و پێکەوە کاریان دەکرد، ئەوەی کۆی دەکردنەوە هەروەک ئەو ڕووناکیە وابوو کە لە شەوی تاریکدا پەپوولەکان کۆدەکاتەوە. مەجید دان بەوەدا دەنێت کە باوەڕێکی گەورەی پێیان بوو، تووشی شۆک بووبوو کاتێک ژیان ئەو باوەڕەی نەسەلماند.

## لە خانوە نوێکەدا

ئێستا ئیتر کاتی ئەوەیە مەجید شوێنێکی نوێ بۆ نیشتەجێ بوون بگرێت بەکرێ. بێگومان ئەگەر تەنها بوایە وازی لەو بیرکردنەوەیە دەهێنا. بەڵام ژنێکی لەگەڵدایە بە سێ منداڵەوە، ئەوەیش شتێکە کە میوانداریی ئەوانی تر دەکاتە زەحمەت بۆ ماوەیەکی درێژ. ئەمجارە ژوورێک ناگرێت لە ژوورەکانی خانوویەکدا. نەخێر، ئەوە ناکات، بەڵکو خانوویەکی سەربەخۆ دەگرێت بەکرێ!

- هاوڕێ سەبار، خانوویەکی بچکۆلەمان دەستدەکەوێت بۆ کرێ لەم گەڕەکە؟ دەمانەوێت سەربەخۆو هەرزان بێت. گرنگ نیە ئەگەر بچووکیش بێت، بۆ نموونە دوو ژوور بێت.
- دەگەڕێین، باوەڕیشم وایە خانوویەکی بچکۆلە دەدۆزینەوە.

شیوعیە بچکۆلەکەمان (سباهی)، گوێی لەم قسانە بوو، وەک دوایی دەرکەوت، خۆی بریاری لەگەڵ خۆیداوە دەرچێت و بگەڕێت بەدوای خانوویەکدا، داپیرە هێمنەکەی ڕازی نەبوو ئەو بچکۆلەیە ئەو کارە بکات، چونکە ئەو ناتوانێت بەباشی ئەو کارە ئەنجام بدات، وەک دایکی دەیگووت.

ڕۆژی دوایی سەبار گەڕایەوە ماڵ و هەواڵی خانوویەکی چۆڵی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە دانراوە بۆ کرێ، لەشوێنێکیش نزیک لە ماڵی خۆیان. خانوویەکی بچکۆلەی گونجاو، بەپێی قسەی ئەو.

- کەواتە هاوڕێ سەبار، با ئێستا بڕۆین سەیرێکی بکەین!
- با بڕۆین هاوڕێ مەجید!

هەردووکیان کەمێک ڕۆیشتن، ماوەی چەند خوولەکێک، گەیشتنە خانووە چۆڵەکە. خانوویەک لە قوڕ، "سەربەخۆ"، دوو ژوورو تارمەیەکە، درواسێی باخێکی خورمایە. لە خانوویەکی دێهاتی دەچوو لە کەناری پایتەختدا.

- کرێکەی چەندە؟ ئەوە یەکەم پرسیاری مەجید بوو.
- بە دوو دینار —سەبار وەڵامی دایەوە. کەمێک گرانە، بەڵام خانوویەکی چاکە.
- کێ خاوەنەکەیەتی؟
- پیاوێکی بە تەمەنە، حاجی تەیب، خزمێکمان دەیناسێت.
- ئەم خانووە باشە بۆ ئێمە. هیوادارم مامەڵەی کرێکەی تەواو بکرێت و سبەینێ بگوێزینەوە ناوی.

ڕۆژی دوایی "نێوەندگیرەکە" کلیلی خانوەکەی وەرگرت و مەجید بە یارمەتی سەبارو سباهی و برا بچکۆلەکەیان گواستیەوە بۆ خانوە تازەکە. لە ڕاستیدا لە خانۆچکەیەک دەچوو، بەڵام بۆ ئەوانەی هاتبوونە ناوی، هەر لە کۆشکێکی گەورە دەچوو. (ام نضال) زۆر باش

پاکی کردەوە، منداڵەکان بە خۆشیەوە کەوتنە یاری کردن لە گۆڕەپانە بچووکەکەدا. وە هەر لە ماوەی کەمتر لە یەک کاژێردا، وەک ئەوەی دەنواند کە چەند هەفتەیەک بێت خەڵکی تێدا بژی.

ئایا بۆ مەجید نووسراوەتەوە ماوەیەکی درێژ لەم خانوەدا بمێنێتەوە؟ مرۆڤ ناتوانێت ئەمە هەڵبهێنێت، لەکاتێکا لە بارودۆخی خۆشاردنەوەو ڕاوودوونادا دەژی. لەوانەیشە هەموو شتێک بە هێمنی تێببەڕێت و ماوەیەکی درێژ تیایا بمێننەوە، لەوانەیشە ڕووداێکی کتوپڕ بەخێرایی هەموو شتێک بگۆڕێت. هەر دوای یەک شەو لە دانیشتنیان لەو خانوە تازەیەدا، ڕووداوێکی کتوپڕی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا. بەڵام ئەمجارەیان شتێکی ناکاوی سەیری پێکەنیناوی بوو. لە عەسردا، کاتێک مەجید بە سۆندەیەکەوە، ئاوڕشێنی ئەو تۆزە چۆڵاییەی بەردەم ماڵەکەیانی دەکرد، ژنێکی شێوە دێهاتی لە جلوبەرگدا، ڕووی کردە ماڵەکە.

- ماڵەکە جێبهێڵن! خۆت بە ئاوڕشێنەوە هیلاک مەکە. دەمەوێت هەر ئێستا ماڵەکە جێبهێڵن –ئەم ژنە غەریبە ئەمەی بەم لاوە گووت.
- ئەی تۆ کێیت وا داوامان لێدەکەیت ئەم خانووە جێبهێڵین؟
- من خاوەنی خانودەکەم، دەمەوێت هەر ئێستا چۆڵی بکەن!
- ئێمە خانوومان لە حاجی گرتووە نەک لە ژن!
- حاجی مێردی منە، دەمەوێت خانوەکە چۆڵ بکەن .. ئاوڕشێنی زەویەکە مەکە، ئاوی پیا مەکە .. نامەوێت ببینم ئاوڕشێنی دەکەیت، دەمەوێت خانوەکە چۆڵ بکەن.
- باشە بۆچی جێبهێڵین؟ دوێنێ گرتوومانە، شەوێک زیاتر تیایا نەبووین، لە پێشیشەوە کرێی مانگێکمان داوە!
- واز لە ئاوڕشێنی زەویەکە بهێنەو خانوەکە چۆڵ بکەن.
- تکا دەکەم بچۆ حاجی مێردتم بۆ بنێرە لەگەڵ ئەو لە یەکتر تێبگەین.

ژنە ڕۆیشت و لە چاو وون بوو. بەڵام ووشەکانی و دەنگ هەڵبڕینەکەی لە گوێچکەکانی مەجیددا دەنگی دەدایەوە. هەوڵیشی دەدا ئەم ڕووداوە شیبکاتەوە. زیاتر لە چەند خوولەکێک تێنەپەڕی بوو حاجی خاوەن خانوو هات.

- کوڕەکەم ئەم خانوەمان بۆ جێبهێڵن!
- بۆچی مامە حاجی؟ دوێنێ لێمان گرتووتیت، کرێی مانگێکیشمان داوەپێت!
- کرێکەتان بۆ دەگێڕمەوە. دەمەوێت بەبێ ڕاوێژ، خانوەکە جێبهێڵن.
- مامە، تەنها هۆکارەکەیم بۆ ڕوون بکەرەوە!
- کوڕم خانوەکە جێبهێڵن! قبوڵ ناکەم تیایا بمێننەوە.
- زۆر باشە، بەیانی یان دوو بەیانی جێیدەهێڵین، هەر ئەوەندەی شوێنێکمان دەستکەوت دەگوێزینەوە.

حاجی کراس و کەوایەکی لەبەردا بوو، کەشیەکی بەسەرەوە بوو کە شاهیدی ئەوە بوو چۆتە کەعبە. دەستی برد بۆ گیرفانی چاکەتەکەی و کیسێکی قوماشی دەرهێنا، ئەوە "جزدانی پارەکەی" بوو. دوو دیناری لە کیسەکەی دەرهێناو دایە دەست مەجید، گووتیشی: "ئەمەت داوە پێم بۆ کرێکە"، گێڕایەوە بۆم.

مەجید بیری کردەوە دەبێت چی بکەن: بچێتەوە ماڵی سەبار یان بگەڕێ بەدوای خانوویەکی تردا؟ لەسەر ئەم چارەسەرەی دوایی گیرسایەوە. نابێت وەخت لە دەست بدات. دەبێت زۆر بە خێرایی خانوویەکی تر بدۆزێتەوە.

دوای دوو کاژێر لە جێهێشتنی ماڵ، لە هەمان ڕۆژدا، بەرامبەر کەرخ، نزیک بە مەزاری (الست زبیدة) ژنی هارونە ڕەشیدی ناودار، لە پشت خەستەخانەی (العزل – ئێستا خەستەخانەی الکرامة) وەستابوو. لەگەڵ ئەفەندیەکی مۆدێل کۆن مامەڵەی دەکرد، مامۆستای قوتابخانە بوو، خاوەنی خانوویەکی بچووک بوو بۆ کرێ دانرابوو کە مەجید هەر لە یەکەمین خوولەکەکانی گەڕانەوە دۆزیەوە.

- سوور بووم لەسەر ئەوەی کە مانگانە بە کەمتر لە چوار دینار نەیدەم بە کرێ، بەڵام مادام تۆ کوڕێکی باشی دایدەبەزێنم بۆ سێ دینارو نیو، حەز دەکەم کەسانی چاک لە خانوەکەدا بن و دراوسێکان لێیان ڕازی بن.
- مامە باشەکەم، وا چاوەڕوانم دەکرد هەر دوو دینارم لێبسێنیت بۆ مانگێک – مەجید وەڵامی دایەوە.

هەردووکیان ڕێکەوتن لەسەر سێ دینار بۆ مانگێک. بەکرێگر کلیلی خستە گیرفانی چاکەتەکەی و خواحافیزیی لە مامەی مامۆستا کرد. سەرلە بەیانیی ڕۆژی دوایی، ئۆتۆمۆبێلێکی پاسی تەختە لەبەردەم دەرگای ئەو ماڵەدا وەستابوو کە مەجید هەر تەنها دوو شەوی تێدا بردە سەر، شتومەکە کەمەکەی ماڵەکەی هەڵگرتووە کە حەماڵێکی بەهێز لە حەماڵەکانی بازاڕی شۆرجە دەتوانێت بینێتە سەرشانی. ئۆتۆمۆبێلەکە لەوەدابوو بجووڵێت، پیاوێک بە پەلە بەرەو ڕووی هات، بەدەستیشی ئیشارەتی وەستانی دەکرد! ئەوە حاجیی خاوەن خانوو بوو! بەڵام ئەم هاتنەی لەچی؟

- کوڕم مەجید! لە خانوەکەدا بمێننەوە، بمێننەوە، نامانەوێت جێیبهێڵن.
- بەڵام مامە تۆ خۆت سوور بوویت لەسەر ئەوەی جێیبهێڵین.
- ڕاستە، خەتاکە خەتای من بوو، استغفر الله العظیم، بمێننەوە کوڕەکەم!
- تازە تەواو مامە! ماڵێکی ترمان بەکرێ گرتووەو شتەکانمان بار کردووە، وەک دەبینیت.
- ئەی خوا تەمەنی فیتنەبازو درۆزن کورت کات. دوێنێ ژنێک لە دراوسێکانمان هات و بە ژنەکەمی گووت ئەوانەی هاتوونەتە ماڵەکەتانەوە جوولەکەن. بۆیە داوامان لێکردن ماڵەکە چۆڵ بکەن. بەڵام ئەمڕۆ دڵنیابووم لەوەی ئێوە موسڵمانن و جەعفەریشن. استغفر الله! استغفر الله! ئەم ژنە بۆچی ئەم درۆیەی دروست کرد! لەمەودوا باوەڕ بە ژن ناکەم تاهەتایە. ئەگەر ووتیان ماست سپیە وەڵام ئەدەمەوە ڕەشە.

هەڵوێستی مەجید چی بێت لەم چرکەیەدا؟ واز لە گواستنەوە بهێنێت و شتەکان دابگرێتەوە لە ئۆتۆمۆبێلەکە؟ چەند چرکەیەک بیری کردەوە، ئینجا داوای لە سایەقەکە کرد ئۆتۆمۆبێلەکە بخاتەگەڕو لێخورێت بەرەو (مستشفی العزل) بەرامبەر کەرخ. خانوە نوێکە باشتر بوو لە خانوە چۆڵکراوەکەی "الزویة"، ئەم خێزانە کەوتنە هێمنی و جێگیربوون، مەجیدیش هەلێکی زێڕینی دەستکەوت بۆ فێربوونی پاسکیل هەتا بتوانێت وەک ئامرازی گەیاندن بەکاری بهێنێت بۆ کارە حیزبیەکانی.

مەجید منداڵیەکەی لەبارودۆخێکدا بردۆتەسەر کە هەلی ئەوەی دەستنەکەوتووە فێری لێخووڕینی پاسکیل ببێت. لە تەمەنی باڵغ بووندا دووجار هەوڵیداوە ئەم "پیشە" قورسە فێر ببێت، هەر لە خوولەکی یەکەمەوە دووجار کەوت و پانتۆڵەکەی دڕاو ئیتر وازی لێهێنا. بەڵام ئێستا سوورە لەسەر فێربوون، چونکە ئەمە بۆتە پێویستیەکی تەواو. پاسکیلێکی کۆنی کڕی و دەستی کرد بە خۆفێرکردن. لە کاتی ڕاهێنانەکانیدا دەیان جار دەکەوت و جارجارەیش ئازاری پێدەگەیشت، بەڵام هەر سوور بوو لەسەری. دەستیشی کرد بە بەکارهێنانی پاسکیلەکەی بۆ کاری حیزبی، بەر لەوەی بەهێز بێت لە لێخوڕیندا، بۆیە زیاتر لە جارێک تووشی گرفت بووبوو، لەوانە ئەو ڕووداوە کۆمیدیەی لەگەڵ ماست فرۆشێکدا تووشی هات لە کازمیە. بە پاسکیل لێخوڕینەوە لە کاری حیزبی دەگەڕایەوە، ئۆتۆمۆبێلێک لە ئاراستەی پێچەوانەوە دەهات، سێ ژنی دێهاتییش بە جامی تەختەی ماستەوە بەسەر هەمان شەقامدا دەڕۆن بەردو بازاڕی شار. مەجید بەهۆی لاوازیی سیاقەتەکەیەوە، کەوتە بارێکی ناهەموارەوە: یان ئۆتۆمۆبێلەکە پیایا دەکێشێت، ئەمەیش مەترسیەکی گەورەیە، وە یان ئەو بە پاسکیلەکەیەوە دەکێشێت بە ژنە ماست فرۆشەکاندا. بێگومان ئەمەی دووهەمیان ئاسانترە. ماست فرۆشەکان بە هێواشی دەڕۆیشتن، بە پێچەوانەی ئاراستەی پاسکیلەکەوە، خەریکی قسەوباسیش بوون لەسەر شتێک. ئەتوانرێت بگووترێت بیریان لە هەموو شتێک کردبۆوە ئەوە نەبێت کە لەناکاو لەگەڵ پاسکیلەکەدا دەکێشن بە یەکدا، قەدەر ئەمەی لێشاردبوونەوە.

مەجیدە بە پاسکیلەوە خۆی دەکێشێت بە ناوەڕاستینەکەیاندا، ژنێکی ئەمسەر، گەنجێکی چاو گەورە، کەڵەگەت و باریکەلە، خاولیەک و عەبایەکی پێوەیەو بەپێی پەتی، سێ جامە تەختەی گەورەی پڕ لە ماستی ناوەتە سەر سەری. پاسکیل خۆی کرد بە نێوانی هەردوو ڕانیداو دەموچاوی پاسکیل سواریش لە دەموچاوی نزیک بۆوە، جامە ماستەکەی سەرەوە ڕژا بەسەر سەری مەجیدداو شۆڕبووەوە بۆ دەموچاوی و جەستەی لە پێشەوەو لە پشتەوە! لە پاسکیل دابەزی، ئا بەم وەزعەیەوە داوای لێبووردنی لە کچە ماست فرۆش کرد کە لە بەردەمیدا وەستابوو، بە هەردوو دەستی دوو جامە ماستەکەی تری گرتبوو بە سەر سەریەوە. یەکەمجار سەری لەمە سووڕمابوو، کەمێکیش وەک دوو هاوڕێکەی تری پێکەنی کە لە تەنیشتیەوە وەستابوون. ووشەی یەکەمیش کە فڕێی دایە دەرەوە ئەوە بوو کە ڕووی کردە سایەقپاسکیل:

- دەبێت ڕوبعە دینارێکم بدەیتێ.

مەجید هیچ ڕاوێژی ئەو داوایەی نەکرد، مەبلەغە داواکراوەکەی لە گیرفانی دەرهێناو دووبارە بە داوای لێبووردنەوە دایە دەستی. ئەم ژنە دیهاتیە چاوەکانی بڕیە چاوی ئەم لاوە کە پارەکەی بۆ گرتووە، دەستی درێژ کرد وەری بگرێت. لەوانەیە چاوەڕێی جێبەجێ کردنی داواکەی نەبووبێت ئا بەو خێراییە! ئەی بۆ داوای مەبلەغێکی گەورەتری نەکرد کە ئەم پیاوەی بەردەمی ئا بەم ئاسانیە پارەکەی داپێی! دەبا تاقیکردنەوەیەک بکات و شتێکی تریش داوا بکات، ئەمە سەرباری ئەوەی وەریگرتووە!

- پەنجا فلسی تریشم بدەرێ!
- ئەوە پەنجا فلسی تریش، بە سوپاس و داوای لێبووردنەوە، خوات لەگەڵ خوشکم! بەدەم دوا ووشەوە، لاوەکە سواری پاسکیلەکەی بۆوەو کەوتە ڕێ بەرەو ماڵەوە لە پشت (مستشفی العزل). هەوڵی خۆپاککردنەوەی نەدا لە ماستەکە. شێوەی جێگای پێکەنینی هەرکەس بوو لەو ڕێبوارانەی بەلایدا

تێدەپەڕین. تەنانەت لە ماڵیشەوە کەوتنە پێکەنین پێی! خۆشی بەشداری پێکەنینەکە بوو بەم سیماو شێوەیەی. بەدرێژایی ساڵەکانی دواییش، دوای ئەوەیشی سیاقەتی پاسکیل چاک فێر بووبوو، کە لەو ڕێگایەوە دەڕۆیشت، ئەو ڕووداوەی بیردەکەوتەوە.

فێر بوونی ئەم سایەقیە بە سوودێکی باش گەڕایەوە بۆ ئەو لاوە لە چالاکیە حیزبیەکانیدا. پاسکیلەکە بووە ئامرازی سەرەکیی هاتووچۆ، لەمپەڕی پایتەختەوە پێی دەچوو بۆ ئەوپەڕی پایتەخت، سووریش بوو لەسەر ئەوەی لە ئۆتۆمۆبێل و لە چاوی پۆلیسی نهێنی دوور بێت و بە شەقامە لاوەکیەکان و کۆڵانەکاندا گوزەر بکات. دواتریش تا ئەم " ئۆتۆمۆبێل" ەی بەکار دەهێنا کە هەر بە قاچی سواربووەکەی، ووزەی وەردەگرت و لەکاتی پێویستیشدا دوو هەتا سێ کەسیشی پێهەڵدەگرت!

ئەو خانووە بچکۆلەیەی لەسەر تەرزی خۆرهەلاتی دروستکرابوو، لە دوو ژوورو تارمەیەک پێکهاتبوو، بووە "بارەگای نوێی سەرکردایەتی". ئیتر لەوێوە بریار دەردەکرا بۆ دروستکردنەوەی ڕێکخراوی حیزب بە برینە ئەستوورەکانیەوە، لەوێیشەوە وەڵامی نامەو هەرچی هەواڵێکیش دەدرایەوە کە بەلای شیوعیەکانەوە بایەخی هەبوو. ئەمە نامەیەکە لە هاوڕێیەکەوە باسی تاوانێکی نوێ دەکات لە زۆڵەکانی پشکنینی تاوانکاریەوە، ئەوەش نامەیەکی تر نووسەرەکەی دەڵێت: هاوڕێیەکی حیزبی بووە، پەیوەندیی بە زیاد سەعدونەوە بووە، بەڵام لەو کاتەوە ئەو گیراوە، پەیوەندیی بە حیزبەوە پچڕاوە. لە نامەی سێهەمیشدا، نووسەرەکەی دەڵێت: دایکم مۆڵەتی وەرگرتووە لە پشکنینی تاوانکاریی و دەتوانێت سەردانم بکات لە زیندان (لە نوگرە سەلمان) یان (کوت)، دەتوانرێت نامەیەکی بچووکی پێدا بنێردریت بۆ بەندیخانە بۆ هاوڕێیانی زیندان. نامەی چوارەم، نووسەرەکەی ئەوە یاد دەخاتەوە: لە دەست پۆلیس هەڵاتووە دوای فەرمانی دەستگیر کردنی و چوار دەورگرتنی ماڵەکەی، ئێستا خۆی شاردۆتەوەو ئامادەی جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکانە. نامەی پێنجەم هەندێ هەواڵە دەربارەی چالاکی گروپە ئینشیقاقیەکەو هەوڵدانی بۆ

دروستکردنی کۆسپی نوێ که له هەڵمەتی نۆگۆستی – سپتامبرو چەند کەسانێکی لاوازەوە سەریهەڵدا. نامەکان بەردەوام وەڵام دەدرێنەوە، بەبێ وەستان و هەروەک دیاردەیەک له دیاردەکانی تێکۆشان خۆی. ئەوانەیشی ئەو نامانە دەنووسن، له هەر کونیەکی وڵات بن، بەوە واقیعی خۆیان دەردەبرِن، واقیعی خۆبەستنەوە به بیروباوەرِو پرنسیپ و کار کردنەوە له پێناویدا. ئەوانەیشن رِووخساری گەشاوەی ئەم بزووتنەوەیە، ئەوانن زامنی سەرەکی بەردەوام بوونی و سارِێژ کردنی برینەکانی.

له شوێنێکی پایتەخت، خانووەیەکی تر هەبوو، یان ژوورێک له ژوورەکانی خانوەکە که لەو خانوە دەچوو دەکەوتە پشت خەستەخانەی (العزل)، ئەوانەی کاریان تێدا دەکردو به دەوریدا ئاڵابوون، وەک "بارەگای سەرکردایەتی" سەیریان دەکرد. شتومەکەکانیش هەر له شتومەکی ئەو خانوەی تر دەچوو. بەڵام رِووخسار هەرچۆن بێت، لەو واقیعە ناگۆرِێت که ئەوانەی کاری تێدا دەکەن به "بارەگای راستەقینە" ی سەرکردایەتیەکی ئەسڵی دەزانن. بەناوی حیزبی شیوعی عێراقیەوە قسە دەکەن و بارەگای بەرامبەرەکەیان به درۆو ساختەو بلۆکێکی هەلپەرست دەزانن له ملکەچی حیزب دەرچووە، بڵاوکراوەکانیان به دەستنووس دەردەکەن. له راستیدا مەسعود ژمارەیەکی کەمی له شیوعیەکانی پایتەخت راکێشا بوو، بەڵام هیوای به وەرچەرخانێکی حیزبی بوو له بەرژەوەندی خۆی. ئەم هیوایەیشی دوای ئەوە بەهێز بوو که رِێکخراوی حیزبی پارێزگای ناسریە هەمووی، چووە رِیزی کۆمەڵەکەی ئەو.

سەعد نەیدەتوانی دڵەراوکێکەی بشارێتەوە کاتێک لەو ئێوارەیەدا رِێکخەرەکەی بینی دەربارەی ئەوەی له رِۆژی پێشووتردا بیستبووی له یەکێک له ناسیارەکانی که سەر به گروپی ئینشقاق بوو:

- ئەو هەلپەرستە پاگەندەی ئەوە دەکات که کۆمەڵەکەی ئەوان سەرکەوتوو بوو، وە ئینشقاقیەکان -مەبەست حیزبە- لەم رِۆژانەی دواییدا، وەک دەرئەنجامی

هەڵمەتێکی تری تێرۆریستانە، پاک کراونەتەوە. هاوڕێ مەجید من ناتوانم ئەم دوودڵیەم بشارمەوە لێت!

- ئەوان بەدڵنیاییەوە دەیانەوێت کێشەمان بۆ دروست بکەن، بەڵام ئەوان تەنها خۆیان دۆڕاون. مەحاڵە دوژمن سەرکەوێت بەسەر حیزبماندا هەرچی بکەن، چونکە ئەوەیە حیزبی شیوعی. بەڵام ڕێکخراوی ئەو ئینشقاقیانە بەرەو مایەپووچ بوون و لەناوچوونی حەتمی دەچێت، هەروەک چارەنووسی ڕێکخراوە هەلپەرستەکانی ڕابووردوو لە هەموو شوێنێک.
- ئەو هەلپەرستە پاگەندەی ئەوەیش دەکات هاوڕێیانی زیندانیش لەگەڵ ئەوانن.
- بەپێچەوانەوە، هەموو ڕێکخراوە شیوعیەکانی زیندان و گرتووخانەکان لە دەوری حیزب کۆبوونەتەوە دژی ئەم بلۆکە دابەشکاریە –ئەمە وەڵامی مەجید بوو، لەوەیشدا لەسەر حەق بوو. لایەنگیریی ڕێکخراوەکانی زیندان و گرتوخانەکان دژی ئەوان، کاریگەریەکی زۆری هەبوو، ئەمەیش لەبەر ئەوەی زۆرینەی کادرەکانی حیزب لەوکاتەدا، لەنێو دیوارەکانی زینداندا بوون.
- سەعد گووتی: دەڵێن بزووتنەوە شۆڕشگێریەکەمان لە داکشاندایە
- ئەوە هەر هەراوهوریایە هاوڕێ سەعد! بزووتنەوە شۆڕشگێریەکەمان تا ئێستایش باشەو لە هەڵکشاندایە.

لە ڕاستیدا وەڵامەکەی مەجیدیش هەر هەمان هەراوهوریا بوو، ڕای سەعد دروست بوو لەو ڕووەوە. بەڵام نەخشەی بەکردەوەی هەریەکە لەو دوولایەنە، جگە لەم ناکۆکیە "تیۆریە" ی نێوانیان، نەخشەی پاشەکشەیەکی ڕێکخراوانە بوو، نەخشەی کاری سارێژ کردنی برینەکان و دامەزراندنەوەی بونیانی ڕێکخراوەکە.

مەجید لە دوای بینیی سەعد گەڕایەوە، بیری لە دەرکردنی بڵاوکراوەیەک دەکردەوە -یان نامەیەک- ی ناوخۆیی، تەرخانکراو بۆ بەهێزکردنی باوەڕو مەعنەویەتی هاوڕێیان لە وەڵامیاندا بۆ پاگەندەکانی گروپە ئینشقاقیەکە. ئەو بیرکردنەوەیە هەڵهات و لە ڕۆژی

دواییدا جێبەجێ کرا. دەیەویست وێنەیەکیشی بنێرێ بۆ هاوڕێیانی بەندیخانەکان، چوو بۆ ماڵی کرێکارە شیوعیەکە، سەبار، کەسی لێنەبوو داپیرە نەبێت کە زۆر گەرم پێشوازی کرد، ئەمە دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەک لە غیاب کە پڕ بوو لە ڕووداوی بچکۆلە.

- دایە، مناڵەکان بەوزوانە ناگەڕێنەوە؟
- نازانم کەی دەگەڕێنەوە، کوڕەکەم.

مەجید سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، گەرچی زۆریش بەکاری ناهێنێت، گووتی: نیو کاژێرێک چاوەڕێ دەکەم، ئەگەر نەهاتنەوە دەڕۆم.

- کوڕەکەم، چاوەڕێی هاتنت بووم هەتا پرسیارێکت لێبکەم! چاوەڕێی هەلێکی ئاوا بووم بۆ ئەو پرسیارە.
- فەرموو دایە گیان!
- کەی کوڕەکەم (مسعود) لە زیندان دەردەچێت؟
- هیوادارین کوڕەکەت و هەموو هاوڕێیانیش بەربدرێن دایە گیان.
- ئەی کەی؟
- ئەوکاتەی میللەت سەرکەوت بەسەر کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستیدا.
- ئەی میللەت کەی سەردەکەوێت؟
- جا ئەمە چۆم بزانم؟ ئێمە تێدەکۆشین و قوربانی دەدەین لە پێناوی سەرکەوتنی گەلدا.
- بەڵام سباهی دەڵێت تۆ هەموو شتێک دەزانیت.
- نا دایە گیان، هیچ کەسێک هەموو شتیک نازانێت. بەڵام بۆچی چاوەڕێ ئەم هەلەت دەکرد بۆ ئەم پرسیارە؟
- نامەویت مناڵەکان گوێیان لێبێت، ئەوان حەزیان بەم پرسیارانە نیە، ئەو پرسیارەم لە سەباری کوڕم کرد، تووڕە بوو گووتی "هەزاران خەباتگێڕ لە

زیندانن، براکەی منیش یەکێکە لەوان و چارەنووسیشی وەک چارەنووسی ئەوانە".

مەجید لەوێوە ڕۆیشت بۆ بینینی هاوڕێیەکی. لەوێیشەوە گەڕایەوە ماڵەوە، دوو دەموچاوی نامۆی بینی، پیرەژنێک و کچیکی گەنجی بیست ساڵان.

- ئەمانە دراوسێکانمانن لەم ماڵەی تەنیشتمانەوە، سەلماو دایکی، میوانن لە لامان. (ام نضال) ئەمەی گووت کاتێک مەجید چووە ناو ژوورەکەوە. هەر لەو ڕۆژەیشەوە پەیوەندیی دراوسێیەتی و ناسیاریی نێوان (ام نضال) و ئەو خێزانە بەهێز بوو، لەگەڵ دایکەکەو دوو کچەکەی.

پیاوی ماڵەکە بەشێک نەبوو لەم پەیوەندیە. نە لەملاوەو نە لەولاوە. یەکێک لە پیاوەکان دەچوو بەلای چالاکیی حیزبی-سیاسیەوە، دووهەمیشیان دەچوو بەلای ئەو کارە تایبەتیەی خۆیەوە کە خێزانەکەی لەسەری دەژیا. پیاوێکی کوێر، مێزەرێکی سپی دەبەست وەک دەلیلی (حافظ القرآن) و ئامادەگی بۆ خوێندنی قورئان لە هەر ماڵ و مزگەوت و گۆڕستانێک، بەو مەرجەی بەرامبەر بەو کارە کرێیەکی بداتێ، ئەوە پیشەکەی بوو، نابینایی سەپاندبووی بەسەریدا. هەر بە تەنهایش دەڕۆیشت، بە یارمەتی گۆچانەکەی، دەشیزانی چۆن و لە کوێ بگەڕێت بۆ مردوان و خوێندنی قورئان لە فاتیحاو سەر قەبراندا. ئەو بە تەواوی لە جیهانی تایبەتی و جیاوازی خۆیدا دەژیا، جیاواز لەو جیهانەی دراوسێکەیی تێدا دەژیا.

ئەم دراوسێیەتیە کەمێک ناڕەحەتی بۆ مەجید دروست کردبوو. لەبەر ئەوەی ژنەی دراوسێ بە دوای پیاوێکدا دەگەڕا بۆ سەلما، لەوەیش دەچوو گەنجێکی وەک مەجید بە باش بزانێت. ڕۆژێکیش بە (ام نضال) ی گووتبوو:

- (ام نضال)! بۆچی مەجیدی برات ژن ناهێنێت؟

- دایکی سەلما، ئەو بیر لە ژن هێنان ناکاتەوە.
- بۆچی بیری لێناکاتەوە؟ ئەو لە تەمەنی ژن هێناندایە.
- نە بیر لە ژن هێنان دەکاتەوەو بە پارەی ژن هێنانیشی هەیە.
- بەڵام خۆ ژن هێنان زۆری تێناچێت. ئەو گەنجێکی بە ئەدەب و چاکە، من ئامادەم سەلمای کچمی بدەمێ.
- دایکی سەلما، گووتم بیر لە ژن هێنان ناکاتەوە!
- بۆچی بیری لێناکاتەوە؟ بۆچی لە کچەکەی من باشترو جوانتری دەستدەکەوێت؟

دایکی سەلما چەند جارێک لە دەرگای ئەم بابەتەی دابوو لەگەڵ (ام نضال) ی دراوسێدا، ئیتر بەبێ ئەوەی مەجید لە ڕۆژانی یەکەمدا هیچی لەو بارەیەوە بیستبێت. ئینجا دایکی سەلما دڵگرانی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بە بێبایەخ سەیر کردنی داواکەی و دەڵێت: "بۆچی کچەکەمتان ناوێت؟ جوان نیە؟ جوانە. عاقڵ نیە؟ عاقڵە. گورج و گۆڵ نیە؟ گورج و گۆڵە .. هتد". خۆی پرسیارەکەی کردووەو خۆیشی وەڵامەکەی داوەتەوە. تەنها دوای ئەم نارەزایی دەبڕینە مەجید شتێکی لە چیرۆکەکە بیست، ئامۆژگاریی (ام نضال) ی کرد پێی بڵێت: "براکەم دوو ساڵە کچێکی خزمی خۆمانی دیاریی کردووە، خۆشیشی دەوێت و بیر لە کەسیش ناکاتەوە ئەو نەبێت".

ئینجا ئیتر دایکی سەلما، دوای بیستنی ئەو چیرۆکە جیاوازە، وازی لە هەوڵەکانی هێنا بۆ بەشوودانی کچەکەی بە مەجید، پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دوو خێزانەیش بە تەواوی ساردبۆوە، لە نێوان ژنەکانی ئەو دوو ماڵەدا، ئیتر ئەمە بەبێ ئەوەی پیاوە کوێرەکە هیچ شتێک لە هەموو ئەو ڕووداوانە ببیستێت دەربارەی هەوڵی ژنەکەی بۆ بەشوودانی سەلماو شکستیشی لە هەوڵەکانیدا.

کاتێک ئەو ئێوارەیە مەجید لە بینینە حیزبیەکانی گەڕایەوە، نامەیەکی داخراوی لە گیرفانی دەرهێنا، زۆر هونەرمەندانەو بە بایەخەوە پێچرابۆوە، وای خەمڵاند کە ئەمە لە پشت

شیشە ئاسنینەکانەوە هاتبێت. کردیەوەو دووجار خوێندیەوە: ووشەی ئاگرینی پڕ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و باوەڕ کە لە هاوڕێیانی بەندیخانەوە دەربڕدراوە دەربارەی هەستونەستیان و ئەو ئازادیەی دوژمن لێی داگیر کردوون، بەڵام نەیتوانیوە ئایدیاکانیان بگۆڕێت و پەیوەندییان بە حیزبەوە کەم بکاتەوە. لەگەڵ نامەکەیش دیاریەکی سادە بۆ حیزب، مەبلەغێک پارە کە لە دەمی خۆیانیان گرتۆتەوە بۆ هاوڕێیانی دەرەوەی زیندان.

## بەشی سێهەم

# گەشتێک بۆ دەرەوەی پایتەخت

ناوەندێکی سەرکردایەتی بۆ حیزب لەدەرەوەی ووڵات، دوور لە ڕێکخراوەکانی حیزب و ئەو جەماوەرە میللیەی حیزب هێزی خۆیی لێوەردەگرێت، ئەمە شتێکە شیوعیە عێراقیەکان بیری لێناکەنەوە. چۆن و بۆچی بیر لەوە بکەنەوە ناوەندی سەرکردایەتی حیزب لە ووڵاتانی تردا بێت، لە میوانداریی میللەتانی تردا، بە هەزاران کیلۆمەتر دوور لە شانۆی ڕووداوەکان! نا، بیرێکی ئاوا هەڵە بە زیهی ئەو شیوعیانەدا تێنەپەڕیوە. لەلای ئەوان جۆرە نەرێتێکی تر پتەو بووبوو: ناوەندی سەرکردایەتی لەناو ووڵات خۆیدا بێت، نووسابێت بە ڕێکخراوە حیزبیەکانی خوارەوەو جەماوەری میللی خۆیەوە. سووربوونیش لەسەر ئەمە، شیوعیەکان ڕووبەڕووی مەترسی گەورە دەکاتەوە سەبارەت بەم کەس و ئەو بەرپرسی حیزب و کادرەکانی. بەڵام ئەم مەترسیە زۆر پێویستەو زۆریش بە کەڵکە، چونکە ئەمە حیزب لە هەزاران مەترسی گەورەترو زیانی زیاتر دەپارێزێت.

ناوەندی سەرکردایەتی حیزب، یان دەبێت لە پایتەختدا بێت یان لە شارێکی تر لە شارەکانی ووڵاتدا، ئەوە شتێکی ترەو دەتوانرێت ڕاوێژ بکرێت لەسەری و بریار بدرێت لە بارەیەوە بە

پەیوەندیی بەو بارودۆخە دیاریکراوەوە کە حیزبی پێدا تێدەپەڕێت. ئەگەر ژمارەیەک لە کادرەکانی حیزب لەو بارودۆخەدا کۆببوونایەتەوە کە لە کۆتایی ١٩٤٩ دا تێپەڕی بەسەر حیزبدا، دەربارەی ئەوەی ئایا ڕاستە ناوەندی سەرکردایەتی حیزب بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی تر لە دەرەوەی پایتەخت، ئەوکاتە ڕاوێژێکی درێژو توند بە بۆچوونی جیاوازەوە، لە نێوانیاندا دەگوزەرا. هەندێ کەس وا دەبینن، تاکە شوێنێک کە سەرکردایەتی حیزبی لێوە بکرێت هەر پایتەختە. ناوەندی حکومەت و ناوەندی ڕۆشنبیری و پیشەسازی وولاتی تێدایە، بۆیە دەبێت سەنتەری سەرکردایەتی حیزبی شیوعییش هەر لەوێ بێت. هەندێکی تر ڕایەکی جیاوازیان هەیە: بەهۆی ئەم بارودۆخەوە، دەکرێت سەنتەری سەرکردایەتی لە شوێنێکی تری وولاتدا بێت. مەجید لەگەڵ ئەم ڕایەی دووایدا بوو. هەر بە تەنهایش، وە بەبێ ئەوەی کەسی لێ بووروووژێنێت، بڕیاریدا بگوێزێتەوە بۆ شارێکی تر -کەرکوک- و جێبەجێ کردنی ئەرکە حیزبیەکانی لەوێوە. با ئەمەیش بڕیارێکی وەختی بێت، لە چاوەڕوانیی چەند گۆڕانکاریەکدا لە بارودۆخ و تواناکاندا. لە کاتێکی تریشدا، بە ئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ پایتەخت، زۆر ئاسانتر لە جێهێشتنی.

ئایا ڕێکخراوە حیزبیەکان لە هەموو پارێزگاکانەوە پەیوەندییان بۆ دەکرێت بە سەرکردایەتی حیزبەوە لەو شوێنە تازەیەی؟ نەخێر، ناتوانن. دەتوانرێت ڕاستەوخۆ چەند ڕێکخراوێکیان پەیوەندی پێوە بێت بەبێ هەندێکی تریان. کەواتە دەبێت ناوەندێکی هونەریی دروست بکرێت بۆ پەیوەندیی حیزبی، دەبێت ئامرازێکی گەیاندن هەبێت لەنێوان ڕێکخراوەکانی حیزب لە چەند پارێزگایەکدا لەگەڵ ناوەندی سەرکردایەتی. ئەم ڕێ و شوێنە تازەیە بەدوور نابێت لە خاڵی لاوازو لە نارەحەتی، بەڵام سوودی تری تێدایە، بەتایبەت زامنی پاراستنی کادری حیزبیە. پۆلیسی نهێنی بەخێرایی و بەئاسانی ئاگاداریی لەم گواستنەوەیە پەیدا ناکات، وە هەر لە پایتەختدا دەگەڕێت بۆ سەنتەری سەرکردایەتی. دەبێت ئامادەکاریی خێرا بکرێت بۆ ئەم گەشتە، بەر لە هەرچییش دەبێت تەگبیریی پەیوەندیی ڕێکوپێکی داهاتوو لە نێوان شارەکاندا تەگبیر بکرێت.

لەنێو شتومەکەکاندا شتێکی بە نرخ و خۆشەویست هەیە لەلای هاوڕێیان، شتێک کە گەورە نیە، بەڵام لە گیرفانیشدا ناشاردرێتەوەو بە ئاسانی و بە شێوەیەکی ئاسایش ناگوێزرێتەوە بۆ "بارەگای نوێ". ئەو شتە "ئامێری ڕۆنیۆکەیە" کە دەبێت بە هەر شێوەیەک هەیە بگوێزرێتەوە. پێدەچێت تاکە چارەسەر هەڵوەشاندنی ئامێرەکەو گواستنەوەی پارچەکانی بێت بە زیاتر لە سەفەرێک. بەم شێوەیە دەتوانرێت ئەو پۆلیسانە چەواشە بکرێن کە دانراون بۆ پشکنینی جانتای هاتووچۆکەران. تیایانا نیە ئەوە بزانێت کە ئەم ئامێرە بچووکە پارچەکراوانە، ئامێرێکی چاپی نهێنی بچکۆلەی حیزبی شیوعیە. ئامێرەکە بە سەلامەتی دەگاتە کەرکوک و لەوێ دەبەسترێتەوە.

چوار هاوڕێ لە پایتەختەوە دەگوێزنەوە بۆ شاری ئاڵتوونی ڕەش. بێگومان ناشبێت گواستنەوەیان لە هەمان کاتداو لە هەمان ڕێگاوە بێت. گرنگ ئەوەیە هەنگاوی یەکەم هەریەکە لە مەجیدو جەلال بە سەلامەتی بگەن. دوای ئەوە گوێزانەوەی هەریەکە لە راضی و ساڵەح ئاسان دەبێت.

- وا دەبینم ڕۆژێک بەر لە جەژن باشترین کاتە بۆ سەفەر –مەجید بە هاوڕێ جەلالی گووت، چونکە جووڵەی هاتووچۆ بە هۆی جەژن و سەفەری خەڵکێکی زۆرەوە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بۆسەردانی کەسوکاریان چڕ دەبێت. لەو ڕۆژەدا پیاوانی پۆلیس زۆر پرسیار لە پێناسەی هاتووچۆکەران ناکەن.
- ئەمە ڕاستە.
- چاک وایە لە ڕێگای موسڵ-هەولێرەوە سەفەر بکەین.
- ڕاستە.

ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیەو جووڵەی هاوتووچۆو گواستنەوە گەرمە. خەڵکی بە نارێکوپێکی وەستاون و قەرەباڵەغیەکی زۆریان لەسەر ئامرازەکانی هاتووچۆ دروستکردووە بە شەمەندەفەرو ئۆتۆمۆبێلەوە. ئەوەی بەهێزە پاڵ بە بێهێزەکانەوە دەنێت بۆ دواوە بۆ

دەستخستنی جێگایەک بۆ سەفەر. عارەبانەی شەمەندەفەرەکان پڕن لە خەڵکی، لەسەر کورسیە تەختەییەکانی دانیشتوون یان لە نێوان کورسیەکاندا بەپێوە وەستاون یان لەسەر ڕەفەکانی ڕاکشاون. لە ماڵەکانیشدا هەزاران خێزانی شارو لادێ، لە قەرەباڵەغیەکی زۆردا لە دەوری ئۆتۆمۆبێل و عارەبانەی شەمەندەفەردا، چاوەڕێی بینینی خۆشەویستانیان دەکەن. باوکان چاوەڕێی کوڕە سەربازەکانیان دەکەن کە لەوانەیە لەم بۆنەیەدا مۆڵەتیان پێدرا بێت، ژن لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی مێردە خۆشەویستەکانیاندا، مناڵ لە چاوەڕێی باوکیاندا .. بەرە جەژنانە!

لەنێو ئەو تەوژمەی گەشتیاراندا کە شەپۆلی دەدا، مەجیدو جەلال جێگایان بۆ خۆیان دابین کرد، لە بەغداوە بۆ موسڵ و لەوێیشەوە بۆ کەرکوک. هەموو شتێک بە شێوەیەکی ئاسایی تێپەڕی، تەنانەت هەستی هیلاکییان نەکرد، ئەمە سەرباری خراپی و درێژیی ڕێگاو خراپی ئامرازەکانی هاتووچۆ. بەڵام بارودۆخی ژیانێکی نوێی نادیار مەشغوڵی کردبوو.

لە ڕێگا لەگەڵ جەلال ڕێکەوتن کە جیاببنەوەو دوایی یەکبگرنەوە. لە هەڵسوکەوتی مەجیددا ڕوون بوو کە باوەڕی بە هاوڕێکەی، جەلال، نیە. چەند هەفتەیەک بوو باوەڕێ کەم بووبۆوە پێی، کاتێک بینی بەبێ هۆکار، لەو کارە حیزبیانەدا تەمەڵی دەکرد کە پێی سپێردراو بوون. جارێک حیزب داوای لێکرد کە بچێت بۆ شوێنێکی دیاریکراو بە مەبەستی وەرگرتنی بەرپرسیارێتی و سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی حیزبی لەوێ، ئەوکاتە هەڵوێستێکی نێگەتیفی هەبوو، جێبەجێکردنی کارەکەی ڕەتکردەوە. لە واقیعدا ئەمەی بە خاڵێکی لاواز دانابوو تیایا، هەستی ئەمەی دەکرد، وە هەستی ئەوەی دەکرد هاوڕێکانی ڕازی نین لێی. لەگەڵ ئەوەشدا هەر گوێی پێدەدراو لە هاوڕێکانیەوە باوەشی بۆ دەگێرایەوە، لەوانەیە خزمەتێکی گرنگ بە حیزب بگەیەنێت. ئەو ئێستا ئەو بڕیارە دەیگرێتەوە کە بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی ترو لەوێیش ئەرکێکی نوێی پێدەسپێردرێت.

بێگومان نابێت جەلال لە سەرەتاوە ببرێتە ئەو خانوە حیزبیەوە مەجید رووی تێکرد. ئەمەیش هەر لە سەرەتاوە بە بێباوەڕی دادەنرێت. کەواتە دەبێت ئەو وەختێک لە شوێنێکی تری شاردا بباتە سەر لە چاوەڕوانی بینینی مەجیددا لە کاتی دیاریکراو. مەجید هاوڕێکەی لەمە ئاگادار کردبوو، لەبارەی داهاتووی ماڵ و کارەوە.

کاتی یەکتر بینین هات، مەجید نزیکەی چل دەقیقە چاوەڕێ بوو جەلال نەهات. لە کوێیە، ئەم ئامادە نەبوونەی بەچی لێکدەداتەوە؟ بێگومان دەبێت هۆکارێک هەبێت، بەڵام ئەو هۆکارە چیە؟ ئایا گیراوە؟ بەڵام بۆچی و چۆن بەم خێراییە دەگیرێت، ئەمە دوای گەیشتنی بەم شارە بە سەلامەتی؟ ئەی تۆ بڵێی شتێکی خراپ لێی ڕوودابێت؟ بڵێی نەیەوێت ئامادە بێت بە بیانوویەک؟ گرانە هیچ کەسێک ئەمە هەڵبهێنێت. کاتێکی تریش دیاریکراوە. ئەگەر نەهات بۆ ئەمەیان ئەوا بەهیوای بینینی لەوی تریاندا. ئەگەر هەر لەو کاتەوە گیرابێت کە پێی ناوەتە ئەم شارەوە، ئەوا مەبەستی مەجید لە گواستنەوە بۆ ئەم شارە بایەخی نەما، چونکە مانەوەی تیایا نهێنی نابێت لە لای دژمنانی چینایەتی.

جەلال شوێنەواری نەبوو، نە ئەو ڕۆژەو نە ڕۆژی دواییش. جانتاکەی مەجیدیش بەو جلانەی ئەوەوە ڕۆیشت کە کەوتبووە لای. ئەو جانتا کۆنەو هەرچی جلێکی کۆنیشی تێدایە، ئەوە هەموو سامانی "گوازراوە" ی مەجیدە. بەڵام وون بوونی ئەو شتانە جێی داخ نین، ئەو شتانە هیچ نین بە بەراوورد لەگەڵ وون بوونی کادرێکی حیزبیدا. ئەگەر مرۆڤ بە نرخترین سەرمایە بێت، ئەوا کادرێک بە نرخترین مرۆڤە.

## لە شاری ئاڵتوونی ڕەش

لە ڕابووردوودا مەجید زیاتر لە جارێک بەم شارەدا تێپەڕیوە، زیاتر لە شەوێکیش تیایا ماوەتەوە. ئازادانە بە شەقامەکانیدا سووڕاوەتەوە، ئەوکاتە لە پۆلیسی نهێنیەوە ڕاونەدەنرا.

بەڵام ئێستا، لە گواستنەوەیدا لە پایتەختەوە بۆ ئێرە، وەک ئەوە وایە ئەمە یەکەم جاری بێت سەردانی ئەم شارە بکات. ئێستا بە پێچەوانەی جارانەوە، گەلێ شت سەرنجی ڕادەکێشێت. ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێک سەرنجی ڕادەکێشێت، ئەو ژمارە زۆرەی کرێکارانی نەوتە. ئەو گردبوونەوەیە لە دەرگای کۆمپانیاکەدا، لەو کاتەدا دروست دەبێت و گەورە دەبێت کە کرێکاران دەڕۆن بۆ کار یان لەکار دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە. سەدان پاسکیل لەژێر سەقفێکی چینکۆدا ڕیز کراون لە لا تەنیشتی ئەو وێستگەی شەمەندەفەرەوە کە سەر بە کۆمپانیاکەیە. ئەوانە ئامرازی هاتووچۆی کرێکاران بوون تا وێستگەی شەمەندەفەرەکە لە ماڵە جیاجیاکانیانەوە کە بە شاردا بڵاو بووبوونەوە، لە گەڕانەوەیشەوە لە کارەکەیانەوە. ئەم دینەمۆ هەڵمیە بەهێواشی دەڕوات و کۆمپانیاکە جێدەهێڵێت لەو شوێنەدا کە لە خاڵێکدا لەگەڵ شار یەکدەگرێتەوە، لەو شوێنەی عارەبانە کۆنە چڵکنەکانی لێدەوەستێت، کە هەڵگری چەندان مرۆڤی هیلاکن. هەر دەرگاکە دەکرێتەوە، ژمارەیەک لە کرێکاران بە جلوبەرگی جیاواز جیاوازەوە، شەپۆل دەدەن، بە زوبانی جیاوازیش دەدوێن: کوردی، عەرەبی، تورکی، ئاشووری، ئەرمەنی، بەڕاکردن دەڕۆن هەروەک ئەوەی لە پێشبڕکێدا بن، هەندێکیان بەرەو پاسکیلەکانیان و هەندێکیشیان ڕووەو پاسە ئەهلیە تەختەییە کۆنە بچووکەکان کە چاوەڕێی گواستنەوەیانن بەرامبەر بە کەمێک پارە کە لە فرۆشتنی هێزی کاریان بە کۆمپانیا مۆنۆپۆلیە بێیانیەکان دەستیان دەکەوێت. ئەمانە بارودۆخی کارەکەیان کەمێک باشتر بووە دوای مانگرتنی گاورباغی. ئەم چاککردنە کەمەیشیان بە خوێن دەستکەوت، بەڵام کێشەی هاتووچۆیان لە ماڵەوە بۆ کارو بەپێچەوانەیشەوە، چارەسەر نەبووە.

دوا وەجبەی کرێکاران بە عارەبانەیەکی شەمەندەفەرەکە دەڕۆیشتن کە هیلاکی وەک نەخۆش و پیری لێکردبوو. کرێکارەکانیش دەیانەویست بە زووترین کات بگەنەوە ماڵەوە، بەڵام "پەلەکردن لە شەیتانەوەیەو لەسەرخۆییش لە ڕەحمانەوە"! -وەک کرێکارە بە تەمەنەکە، مامە عەبدولکەریم، دەیگووت.

لە تەنیشت دەرگای کۆمپانیاکەوە بینایەک هەبوو بۆ جۆرێکی تر لە مرۆڤ، گەڕەکێک جیاواز لە هەموو گەڕەکەکانی تر، بە شێوەیەک جیاکرابۆوە کە ئاسان نەبوو بۆ دانیشتوانی شار بچنە نەودیوەوە. لەم گەڕەکەدا "ڤیلا" لە تەرزی نوێ، شەقامێکی قیرتاو کراو بە دەوریدا، دارو باخچەی پڕ گوڵ و ڕێکخراو، ئامرازی فێنککەرەوەو گەرمی و پاککەرەوەی هەوای تەندروستی ماڵ، نزیک بە گۆڕەپانی یاری تۆپ و نادیی شەوانە بۆ خواردنەوەو "خۆشی"، پڕ لە خزمەتچی و چێشتلێنەر لە هەردوو ڕەگەزەکە، ئیتر یان بە ڕەگەزنامەی عێراقیەوە یان هیندستانی. لەم خانوانەدا کەسانێک هەن هەزاران کیلۆمەتر ڕێگای ووشکانی و ئاوییان بڕیوە تا بگەنە ئێرەو لە کۆمپانیای نەوت وەک ئەندازیارو تەکنیکی و کارگێڕ کار بکەن، ئەوان لێرەدا وەک میرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەژین. بەڵام ئەگەر کرێکارانیش لە خانۆچکەداو بە نەخۆشی و لەنێو پاشەڕۆدا بژین زۆر سروشتیە، چونکە یەکەم، کرێکارە، دووهەم، لە ووڵاتێکی دواکەوتوودایە، مووچەکانیشیان کەم بێت بەرامبەر بە کارێکی قورس، ئەویش ئاساییە، ئەوان کرێکارن، بوونەوەرێکی ئاسایین لە خەڵکی ئەم ووڵاتە، بە پێچەوانەی ئەو سەروەرە ڕۆشنبیرانەوە کە دەبێت هەر تەنها هاتنیان بۆ ئێرە فەزڵێکی گەورە بێت بەسەرمانەوە، ئەوان حەقی ئەم هەموو ئیمتیازاتەو زیاتریشیان هەیە، هەر بە ڕای خۆیان نا، بەڵکو بە ڕای "برادەرە" عێراقیەکانیشیان.

ئەمە لایەنێک بوو لەوەی مەجید هەر لە ڕۆژانی یەکەمی هاتنیەوە بۆ شاری ئاڵتوونی ڕەش، تێبینی کردبوو: تابلۆیەکی زیندوو لە نیشاندانی جیاوازیی چینایەتی و چەوساندنەوەی چینایەتی و نیشتمانی لە ناشیرینترین شێوەیدا. ئەم "ئاڵتوونە ڕەشە" لە زەوی عێراق و بە هێزی عێراق دەردەهێنرێت هەتا ببێتە "ئاڵتوونی زەرد" لە گیرفانی کۆلۆنیالیستەکانی ووڵاتانی تردا. مەجید هەوڵی دەدا بە ئاگاهیە سنووردارەکانی لە ئابووریی سیاسیدا، وە بە سوودوەرگرتن لە قسەکردنەکانی لەگەڵ هاوڕێیانی کرێکارانی نەوت، لە کاری پێویست و کاری زیادەی کرێکاری نەوت تێبگات، واتە لە بەرهەمهێنانی بەهاو زێدەی بەها. هەرچەندە ئەژمارکردنەکانی وورد نەبوو، بەڵام دەرئەنجامێکی وەردەگرت کە کاتی کاری پێویست

نزیکەی ٣% پێکدەهێنێت لە ڕۆژی کار -ئەمە ئەگەر ٨ کاژێر بێت-، بەشەکەی تری نزیکەی ٩٧% دەبێت، ئەمە کاری زیادەیەو کرێکار لە ڕێگایەوە بۆ حیسابی خاوەنکاری مۆنۆپۆلی بەرهەمدەهێنێت.

مەجید لەو ڕۆژە سەختانەدا، هەر لە سەرەتای گواستنەوەیەوە بۆ کەرکوک، لەنێو کرێکارانی نەوتدا، پاڵپشتی و شوێنی نیشتەجێ بوونی باشی لە هاوڕێ شیوعیەکانیەوە دەستکەوت کە پۆلیسی نهێنی هیچی دەستنەدەکەوت لێیان. هاوڕێ مەحمود هەروەک هاوڕێ ناصر، بەردەوام بوو لە کار لە کۆمپانیا. مەحمودو ژنەکەی و منداڵەکانی لە خانۆچکەیەکدا دەژیان کە پێکهاتبوو لە دوو ژوورو بەرهەیوانێکی بچکۆلە لە تەنیشت گۆڕەپانی گاورباغیەوە. وە ئیتر ئەم خانۆچکەیە لەوە دەرچوو هەر تەنها شوێنی ئەم خێزانە کرێکارە بێت، بەڵکو ماوەیەک بوو، تەنانەت بەر لە هاتنی مەجیدیش بۆ کەرکوک، ماڵێکی حیزبیش بوو، بارەگای گومانلێکراوی شیوعیەکان بوو —وەک ڕۆژنامە زەردەکان پێیان دەگووت.

لەم خانۆچکەیەدا خێزانێکی تریش دەژیا کە پێکهاتبوو لە ژنێکی گەنج بەناوی دایکی غەریب و دوو منداڵەکەی و خوشکە بچکۆلەکەی کە تەمەنی هەر دوانزە ساڵانێک دەبوو. ئەم خێزانە ڕەنجکێشە وەک سەدان خێزانی تر بەبێ بەخێوکارێک دەژیان. ئەمانیش بەخێوکاریان هەبووە، بەڵام مێردو برا، باوکی غەریب و بەکر، نزیکەی ساڵێکە لە زیندانن.

لە خانۆچکەکەدا هاوڕێیەکی تریش دەژیا، شیوعیەکی ڕاکردوو کە هیچ کاری نەبوو چالاکی حیزبی نەبێت، جگە لەمە، خانۆچکەکە شوێنی بینینی هاوڕێیان و کۆبوونەوەکانیان بوو. ڕاستە ئەمە تەنها شوێنێک نەبوو لە چەشنی خۆی، بەڵام ماڵێک بوو شەوو ڕۆژ دەرگای لەسەرپشت بۆ ئەو خەباتگێڕە شۆڕشگێرانە، دەهاتن هەرکات بیانویستایە، نانیان دەخوارد لەوێ، شتیان دەنووسی، دەیانخوێندەوە، ڕاوێژیان دەکرد، دەخەوتن هەروەک ئەوەی ماڵی باوک و دایکی خۆیان بێت!

مەحمود، ئەو کرێکارە شیوعیە، هەموو مووچەی مانگانەی خۆی بۆ دانیشتوانی ئەو ماڵە خەرج دەکرد، ئیتر ئەمە بە ئەندامانی خێزانەکەی خۆی و خێزانی دووهەم و هاوڕێکانیشیەوە. بەڵام ئەو مووچەیە بەشی لانی کەمی خەرجی و بژێوی ئەو خەڵکەی نەدەکرد. ئەی لە کوێوە داهاتێکی زیادەیان دەستبکەوێت؟ مەبلەغەکەی تر لە کرێکارە شیوعیەکەی ترەوە دەهات، ناصر، ئەو لاوە بێ ژن و منداڵەی دووبارە هەر خۆی، بەبێ ئەوەی کەس داوای لێبکات، هەموو مووچەکەی لەوێدا خەرج دەکرد بۆ ئەو خێزانە هاوبەشە گەورەیە لەو خانۆچکەیەدا. ناصر مرۆڤێکی سادە، سادەیی چینی کرێکار خۆی، دڵێکی باش، دەموچاوێکی پڕ پێکەنین، سەلیقەیەکی پرۆلێتاریانە. خاڵی لاوازی تەنهایی و دوورەپەرێزی بوو. پێدەچێت ئەم خەسڵەتەی لە ڕێڕەوی ژیانێکی درێژەوە بۆ مابێتەوە. ئەمەیش بە ڕەفتاری ڕۆژانەیەوە دەبینرا لەنێو کرێکارەکانی برادەریدا، بەڵکو تەنانەت لەنێو هاوڕێ شیوعیەکانیدا لە ماڵەوە. مەحمود لەمەدا لەگەڵیدا جیاواز بوو گەرچی ئەویش سادە بوو، ئاستێکی لاوازی ڕۆشنبیریشی هەبوو.

لێرە، لەم شارە کرێکاریەدا، وەک مەجید تێبینی دەکرد، کارە حیزبیەکان خواستی پڕ نەدەکردەوە، لەسەرخۆ گەشەی دەکرد. دەبێت هۆکاری ئەم دیاردەیە چی بێت؟ بۆچی ئەم شارە کە ناوەندی گردبوونەوەی پرۆلێتاریای پیشەسازیی مۆدێرنە، جیاوازە لەو شارانەی گردبوونەوەی پرۆلێتاریی تێدا نیە؟ بۆچی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی لێرە دواکەوتوو ترە بە بەراوورد لەگەڵ ئەو شارانەی گردبوونەوەی پرۆلێتاریی تێدا نیە؟

لە سەرەتادا ئاسان نەبوو بۆ مەجید وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزێتەوە. بەڵام ژیان خۆی، ووردە ووردەو لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژەکاندا، ئەوەی ڕوون کردەوە کە هۆکاری ئەم دیاردەیە چیە.

* * *

بە خێرایی ئەندامەکان پڕ بوونەوە: ئەو چوار هاوڕێیەی بڕیار بوو بگوێزنەوە بۆ شاری ئاڵتوونی ڕەش، لەوێ جێگیر بوون، مەجیدو ڕاضی و ساڵەح و قادر. هەندێکیان لە ماڵی هاوڕێیان و لەگەڵ خێزانە حیزبیەکاندا نیشتەجێ بوون، هەندێکیشیان هەریەکەیان لە ژوورێکی کرێدا لەگەڵ خەڵکی نەناسراو. لەڕاستیدا خێزان هەبوو بۆ ئەوەی هاوڕێیان لە ماڵی جیاجیادا بمێننەوە، بەڵام دارایی "گشتی" ڕێی ئەمەی نەدەدا. ژوورێکمان بە کەمتر لە دینارێک، بەڵکو بە کەمتر لە نیو دیناریش بەکرێ دەگرت. خەرجیی هەر هاوڕێیەکی زگورتییش بۆ خۆراک و شتی تر، لە سێ دینار کەمتر بوو. ئەمە سادە بوو، تەگبیر کردنی گران نەبوو. بەڵام ئەگەر هەر هاوڕێیەک سەربەخۆ لەگەڵ خێزانێکدا نیشتەجێ بوایە، خەرجیەکان سێ ئەوەندەو زیاتریش زیادیان دەکرد! بەڵام هەموویان لە ماڵێک یان دوو ماڵدا دابنیشتنایە، ئەمەیان لەگەڵ ئەو داراییەدا دەگونجا کە دەبوایە خەرج بکرایە، بەڵام لەگەڵ پێویستیەکانی وریایی و خۆپاراستندا نەدەهاتەوە.

نامەگۆڕینەوە لەگەڵ پایتەخت و ڕێکخراوەکان ڕێکوپێک کرا. کرێکارە شیوعیە بەغداییەکە، سەبار، دانرا بوو بۆ هاتووچۆی کەرکوک بە ڕێکوپێکی، هاوڕێیەک بوو جێی باوەڕ، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشەوە نەناسراو بوو لە لایەن دوژمنەوە. ئەرکەکەی لە نامەبردن زیاتر نەبوو، بەڵام نامەبەرێکی ئاسایی نەبوو، کادرێکی حیزبی بوو کە بۆ نامە گوستنەوەیەکی "تایبەتی" بەکاردەهێنرا. لە هەموو سەردانێکیدا بۆ کەرکوک، ڕاپۆرتێکیشی بە دەم پێشکەش دەکردین دەربارەی ڕووداوەکانی پایتەخت، ئەمە سەرباری ئەو نامەیەی دەیهێنا بەبێ ئەوەی بزانێت چی تێدایە.

نامەی سەمیر کە لەگەڵ گواستنەوەی هاوڕێیاندا، سەرکردایەتی ڕێکخراوی پایتەختی پێسپێردرا بوو، پڕ بوو لە کەفوکوڵی شۆڕشگێڕانە، هەوڵیدەدا وێنەیەکی واقیعی لەو ڕووداوە حیزبی و سیاسیانە بنێرێت کە لەوێ دەگوزەرا. لەگەڵ نامەکانیشدا پارەیەکی کەمیش دەهات –لە کۆمەکی چەند دۆستێکی حیزب. ئەمانە هەموو دەلیلی ئەوە بوو سەمیر تەواوی هەوڵی خۆی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی بوو بە سەرکەوتوویی، شەش

کاژێر، فەرمانبەرێکی بچووک بۆ بژێوی، دوای ئەوە، شۆڕشگێڕێکی خۆبەخش، هەموو کاتەکەی دەدا بە ڕاپەڕاندنی ئەرکە حیزبیەکان. ڕێکخراوی پایتەخت هەنگاوی بەردەوامی دەبڕی لە سازێژ کردنی برینەکان و دروستکردنەوەیدا، هەرچەندە وەک ڕێکخراوە حیزبیەکانی تر لە شارو ناوچەکانی تردا، لەسەرخۆ بوو.

بەڵام لە شاری ئاڵتوون خۆی، کار هێواش تر دەڕۆیشت، ئەمە سەربارى گواستنەوەی ناوەندی سەرکردایەتی بۆ ئەوێ. لێرە زەویەکی بە پیت، ساڵانە ملیۆنان تەن ئاڵتوونی ڕەش دەدات، بەڵام ئەم "بە پیتیە" شەیتانی لە پشت دەریا دوورەکانەوە ڕاکێشاوە بۆ ئێرە. ئەو شەیتانە بە هەناسە ژەهراویەکەی، میکرۆبی نەخۆشی و گەندەڵی لە نێو خەڵکیدا بڵاودەکاتەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی خۆی سوود لە بەپیتیی ئەو زەویە وەربگرێت و بیکاتە "ئاڵتوون".

شەیتانی تریش هەبوون هەر بە عەقڵی سەدەی نۆزدەهەم و هەژدەهەمەوە دەژیان، عەقڵی ئەو ڕۆژانەی وا ڕێکەوتبوو بۆ هەندێک لە سوڵتانەکان حوکمی ئەم وڵاتە لە ڕێگایەکی ووشکانی دوورەوە بکات کە بە سەربازگە داچێنراوەکانی دەپارێزراو وەک قامچیەک وابوون بەسەر جەماوەری گەلەوە. ئەوە شەیتانە کۆنەکانی ئەم شارە بوون بەر لەوەی ببێتە شاری ئاڵتوونە ڕەشەکە کە بە تەواوی لەگەڵ شەیتانە نوێکاندا دەگونجان، ئەوانەی لەودیو دەریاکانەوە هاتبوون و سەرکەوتنێکی گەورەشیان بەدەستهێنابوو لە گەندەڵ کردنی عەقڵی خەڵکیدا، لە ژەهراوی کردنی ئایدیادا لەنێو جەماوەرێکی فراوانی چەواشەکراوی شاردا کە بە چاوێکی ترەوە، بە چاوی "کینە" و بە مەبەستەوە دەیانڕوانیە زۆر شتی ئەم دونیایە.

کۆمەڵەکەی مەجید هیوایان دەخواست ڕکابەری "بەگەکانیان" بۆ بکرایەو سەرکردایەتی جەماوەرە زۆرەکەی ئەو شارەیان بکردایە. بەڵام ئەو پێداویستیانە بەرجەستە نەبوون ئەو

هیوا باشەی پێهێنرێتە دی. جەماوەری تورکمانی لەو شارەدا، گیرۆدەی نەرێت و تێگەیشتنێک بووبوو کە لەگەڵ بەرژەوەندیی خۆیشی نەدەگونجا.

کەرکوک – شارێکی پڕ لە ناکۆکی هەمەجۆرە، نیشتمانی و نەتەوەیی و چینایەتی، شاری ئەو مانگرتنە مەزنانەی کرێکاران کە بە ڕووی ئەو "شەیتانانەدا" دەتەقیەوە لەودیو دەریاوە هاتبوون، بەڕووی نوێنەرانی ئەو شەیتانە خوێنڕێژانەی سەڵاواتیان لە دیداری ئەو سەرەوەرە داگیرکارانە دەدا. لەم شارەدا تەوژمە سیاسیە جیاوازەکانیش ململانێیان بوو، کۆنەپەرست و پێشکەوتنخواز، ڕاستڕەوو چەپڕەو. شیوعیەکانیش لە کرێکارانی نەوت و لە هەموو توێژەکانی بازاڕی (قۆری) و چایخانەکانی (قلعە) و ماڵەکانی (تەپە) و (شۆرجە)، هیچ نەبوون تەوژمێک نەبێت لەو تەوژمانە.

* * *

ئێستا ئیتر کاتی ڕێکخستنی شوێنی نیشتەجێ بوونی هاوڕێیانە بە شێوەیەکی باشتر لەو شارە نوێیەدا کە گواستویانەتەوە ناوی. هەردوو هاوڕێ، مەجیدو راضی، کەوتنە گەڕان بە دوای ژوورێکدا بۆ کرێ لە ماڵێکدا. ئەوان لە گەڕەکە میللییەکاندا دەگەڕان، لەوێ لەلایەک کرێ هەرزانە، لە لایەکی تریشەوە، شتومەکی ناوماڵت پێویست نیە پێخەفێک نەبێت بۆ نووستن. لە گەڕەکی تەپە ژوورێکیان دۆزیەوە کە هەر لە خانۆچکەیەکی قوڕینە دەچوو، لە ماڵی پیاوێکدا کە لە دەست زوڵم و زۆری دەرەبەگ ڕایکردبوو، لەگەڵ خێزانەکەی هاتبووە شار هەتا کارێک پەیدا بکات و لەسەری بژی.

- مامە گیان،کرێی ژوورەکە چەندە؟
- مانگانە نیو دینارە، دەمانەوێت ئەوەی دێتە ئێرە، کوڕێکی باش بێت.
- دڵنیابە باش دەبێت و لێیشی ڕازی دەبن.

راضی، ئەو هەرزەکارە شیوعیە، بەڕاستی باش بوو، لەسەرخۆو ڕازی بوو، لە سەروو ئەمانەیشەوە، ئامادەی جێبەجێ کردنی هەر کارێکی حیزبی بوو پێی بسپێردرایە. لەو ژوورە قوڕینەیەدا نیشتەجێ بوو کە بەلایەوە وەک ئەوە وابوو لە کۆشکێکی گەورەدا بێت! هەموو ماڵەکەیشی تەنها ئەو پێخەفە بوو کە خستبوویە ژێر باڵی و هێنابووی بۆ ئەم خانووە تازەیەی.

ساڵەحیش لەگەڵ خێزانێکی شیوعیدا لە شێوە خانۆچکەیەکدا جێگیر بوو، مەجیدیش خانوویەکی بچکۆلەی بەکرێ گرت لە دوو ژوورو بەرهەیوانێک پێکهاتبوو، مانگانە بە دوو دینار! لەگەڵ دایکی غەریب و خوشکە بچکۆلەکەیدا تیایا نیشتەجێ بوون. قادریش، لە چاوەڕوانیی ژوورێکدا، لە نێوان ماڵی هاوڕێیان و برادەراندا دەهات و دەچوو.

دوو هەفتە بەسەر مەجیددا تێپەڕی لە جێگیربوونی لەم خانووە نوێیەدا! دوای ئەوە شتێک ڕوویدا کە ئەم "جێگیر بوونە" ی سڕیەوە. کات بەیانیە، ڕۆژێکی هەتاو، کەشوهەوایەکی خۆش. ئەم شیوعیە گەنجە لە سووچێکی ژوورەکەدا لەسەر بەڕەیەک دانیشتووە، خەریکە بە خوێندنەوەی چەند نامەیەکی حیزبی و وەڵامی هەندێکیانەوە. ئەو بە تەواوی بیروهۆشیەوە لە جیهانی ئەو نامانەدا دەژیا، بیری بەلای هیچ شتێکی تردا نەدەڕۆیشت لەم دونیایەدا ئەو نامانە نەبێت، لەوکاتەدا کچە بچکۆلەکە، ئەسرین، بە ڕاکردن و بە شڵەژاوی خۆی کرد بەو ژوورە بچکۆلەیەدا، بە نیوە هەناسکەبڕکێ و نیوە هاوارەوە ووتی:

- پۆلیس هاتۆتە سەرمان!

لەگەڵ ئەو ووشانەدا، مەجید گوێی لە لێدانی بەردەوام و توند بوو لە دیوی دەرەوەی دەرگاکە. ئەمە بە تەواوی لە لێدانی پۆلیسی نهێنی دەچێت کاتێک دەیەوێت دانیشتوانی ئەو خاووە بشڵەژێنێت کە هەڵدەکوتنە سەری و داوایان لێدەکەن بە خێرایی دەرگا بکەنەوە بەر لەوەی بتوانن هیچ شتێک بشارنەوە یان لەناوی ببەن لەو شتانەی بە دەلیلی تاوان

دادەنرێت. مەجید بەدەم کۆکردنەوەی بە پەلەی کاغەزەکانیەوە کە خەریک بوو دەیخستنە ناو کیسێکی پەڕۆوە، پرسی:

- چۆن زانیت ئەوە پۆلیسە؟
- بە چاوی خۆم بینیمن، لە درزی دەرگاکەوە تێمڕوانین.

سەرباری ئەم دڵنیابوونە بنەبڕەی کچە بچکۆلە، مەجید دەیەویست خۆی دڵنیا بێت لەوەی ئەمانەی داویانە بەسەریاندا ئایا پیاوانی پۆلیسن، بە ڕاکردن خۆی گەیاندە دەرگا داخرەکەو لە درزێکی بچکۆلەی دارینەوە دوو پیاوی بینی بە جلی ئۆفیسەری پۆلیسیەوە. بە ڕاکردن بەرەودوا گەڕایەوە، کیسەی نامەکانیش بەدەستیەوە بوو، بە پەیژەیەکی باریکدا سەرکەوتە سەربان، لەوێوە قاچی خستە ئاسمان و بە پێچەوانەی دەرگای دەرەوەی ماڵەکە هەڵهات، لە سەربانێکەوە بۆ سەربانێک، بەسەر ئەو سەربانانەوە کە هیچ ڕێگرێک نەبوو لێکیان جیا بکاتەوە یان ڕێگرێکی سادە بوو کە بە ئاسانی تێدەپەڕیت بە سەریدا. دوای بڕینی چەند سەربانێک، هێرشێکی توندی ناکاوی دوژمنێکی چاوەڕواننەکراوی ڕووبەڕوو بووەوە، عینادو دڕندانە، ئەم دوژمنە دەبێت چی بێت؟ سەگێکی ڕاستەقینە سەرکەوتە سەربان بە هۆکارێک کە مەجید هیچی لێنەدەزانی! یەکەم پەلاماری گازێکی توند بوو کە لایەکی پانتۆڵەکەی ئەو لاوەی دادڕی. ئەویش بەختی باشی هێناو هەر یەکسەر چەکی بەرگری لە خۆیی دۆزیەوە: پارچە تەختەیەکی لەو تەختانە کردەوە کە بەسترابوون بە سەربانەکەوە وەک پاڵپشتێک بۆ ئەو چیغەی کە وەک ستارەیەک بەکار دەهێنرێت لە سەربان لەو شێوەیەی هاوینان خێزانەکان تیایا دەخەون. بەوە بەرپەرچی گازی سەگەکەی دایەوە، بە لێدانێکی ئەوەندە توند کە سەگەکە یەک چرکە لە مەیدانی ئەو شەڕەدا نەمایەوە، بەڵکو بڕیاریدا ئەوی تر بردیەوە.

لە سەربانەکەی دوای ئەوەوە، لاوەکە لە پەیژەیەکەوە دابەزیە گۆڕەپانەکەی بەردەمیەوە. چوار ژن دانیشتبوون خەریکی قسەوباس بوون بە تورکمانی، هەروەک چۆن ئەمە زۆرجار

لە گەڕەکە میللیەکاندا ڕوودەدات کاتێک دەبینن پیاوێک بە ڕاکردن ڕوودەکاتە دەرگای دەرەوە، هەمووشیان بە دەنگێک هاوار دەکەن "خەبەرخز، خەبەرخز"، واتە: دز، دز. یەکێکیشیان هێرشی بردە سەر ئەم بەناو دزە لەکاتێکا ئەو هەوڵی کردنەوەی دەرگاکەی دەدا ڕاکاتە سەر شەقامە لاوەکیەکە، گازێکی لێگرت! ئەوە دووەم گاز بوو هەر لەو ماوە کورتەدا دوای گازی سەگەکە. مەجید هێشتا ئەو تەختە درێژەی بەدەستەوە مابوو کە لە سەریان هەڵیکەندبوو، ناچارە جارێکی تریش بەکاری بهێنێت بۆ ڕزگار بوونی لەدەست ئەم ژنە ئازایەی کە بە دزێکی ڕاستەقینەی دادەنا. ژنەکە، دوای ئەوەی بە لێدانێک وەڵامی وەرگرتەوە، بە ترسێکەوە کشایە دواوە لە "دزەکە". ئەویش بۆی ڕێکەوت دەرگا بکاتەوەو لە مەترسی هەڵبێت.

ئێستا گرنگترین ئەرک گەیاندنی ئەم هەواڵەیە بە هاوڕێیان ڕاضی و ساڵەح هەتا نەچن بەلای ئەو ماڵەدا کە چوونەتە سەری. مەجید بە خێرایی گەیشتە لای ڕاضی، ئەو لە ژوورەکەی خۆی بوو. هەردووکیان بەخێرایی ڕۆیشتن بەرەو ژوورەکەی ساڵەح، داخرابوو. دەبێت ساڵەح لە کوێ بێت؟ ئەی ئەگەر ئێستا بە ڕێگاوە بێت بەرەو ئەو ماڵەی چوونەتە سەری! دەبێت زۆر بە خێرایی خۆیان بگەیەننە سەری ئەو کۆڵانانەی بەرەو ئەو ماڵە دەچێت هەتا ساڵەح نەکەوێتە ئەو کەمینەوە. مەجیدو ڕاضی هەریەکە لەسەری کۆڵانێکەوە وەستان.

مەجید بە دڵەڕاوکێوە وەستاوە لە دوورەوە کچە بچکۆلە دەرکەوت، عەباکەی لە خۆیەوە پێچاوەو بەرەو مەجید دەچێت. کە نزیک بۆوە ناسی –ئەوە نەسرینە! لەوەیش باشتر ئەوە بوو کە بە خۆشی و زەردەخەنەوە هات، ئەو دەستپێشخەری کردو گووتی:

- نە هاتبوونە سەر ماڵی ئێمەو نە سەر ماڵی هیچ کەسێکی تریش.
- ئەی چی ڕوویدا؟ پۆلیس چیان دەویست؟

- ناكۆكیەک هەبوو لە نێوان دوو خێزانی دراوسێماندا، لە لای شارەوانی و پۆلیس شكاتیان لە یەكتر كردبوو، هاتنی ئەوان پەیوەندی بەو ناكۆكیەوە بووەو بەس!
- ئەی بۆچی بەو شێوەیە لە دەرگاكەی ئێمەیان دەدا؟
- پرسیاریان لێكردین و داوای دەلیل و شاهیدیی ئێمەیان دەكرد لەسەر ئەو كێشەیە.

"ئای لەم ڕێكەوتە لەعنەتیە! بەڵام گازی سەگەكە هەزارجار ئەهۆن تر بوو لەوەی پۆلیسی نهێنی بدات بەسەرتا"! ئەمە بیركردنەوەی مەجید بوو بەدەم ڕێگاوە بەرەو ماڵ لەگەڵ كچە بچكۆلەدا. لەوێیش دایكی غەریب بە پێكەنین و خۆشیەوە پێشوازی لێكرد. هەمووشیان دایانە قاقای پێكەنین كاتێک ڕووداوی ڕاكردنەكەی بۆ گێڕانەوە.

ئایا ئەمە دواین ڕێكەوت دەبێت لە چەشنی خۆی لە ژیانی ئەم لاوە شیوعیەدا؟ ئەمە جێی گومانە!

## ڕێكەوتێكی خراپ

مەجیدو راضی وا ڕاهاتبوون پاش نیوەڕوان لە دەوری شار یان لە شەقامە لاوەكیەكاندا پیاسەیان دەكرد. ماوەیەک دەڕۆیشتن، ماوەیەک لە شوێنێک دادەنیشتن، ڕاو بۆچونیان دەگۆڕیەوە. فۆكوسیشیان دەخستە سەر: سیاسەت، حیزب. خەونی ڕاپەڕینیان هەبوو، خەونی ڕۆژێكی نوێ بۆ ئەم ووڵات و گەلە، بۆ ئایندەی ئەم حیزبە مەزنە كە لەژێر سایەیدا كۆبوونەتەوە. لەسەر گردۆڵكەیەک دانیشتبوون لە نزیک دەرگای كۆمپانیای نەوتەوە، تێبینیان كرد گەنجێک لە نزیكیانەوەیە، بەشێوەیەک كە گومانی دروست دەكرد. نایناسن، نایانناسێت، ڕەنگە هەر ڕێكەوتێكیش بێت. بەڵام كەسانی ڕاكردووی خۆشارراوە، هەمیشە هەستیاریەكی گەورەی سروشتیان تێدایە بەرامبەر بە گەنجانی فزولی لەم جۆرە.

- با بڕۆین لەم شوێنە دووركەوینەوە. ئەگەر چاودێری ئێمە بكات، ئەوا دوامان دەكەوێت، بێگومان لە دەستیشی دەرباز دەبین.
- بیركردنەوەیەكی باشە.

هەردوو لاوەكە چەند سەد مەترێك ڕۆیشتن، نێوان ئەوان و پیاوە گومان لێكراوەكە دووركەوتەوە، ئەگەرچی ئەویش شوێنەكەی جێهێشت و دەستی كرد بە جووڵە. ئەوان وایانزانی لەو وون بوون، خۆیان كرد بە مزگەوتێكدا كە شوێنێكی كراوەیە بۆ دەسبەناوگەیاندنی ڕێبواران. كاتێك دوای چەند خوولەكێك دەرچوون، بینیان پیاوەكە لەبەر دەرگای دەرەوەدا وەستاوە، ئەمە هەروەك ئەوەی چاوەڕێی دەرچوونی ئەوان بێت. هەرسێكیان سەرنجێكی یەكترییاندا، وا پێدەچوو وەك ئەم سیخوورە بچكۆلە ووریایە پێیان بڵێت "بەڵێ، لێتان بەشكم و دواتان كەوتووم". هەردووكیان چوونە كۆڵانێكی بەرتەسكەوەو ڕۆیشتنیان خێراتر كرد، سیخووڕیش بەدوایانەوە. توانیان خۆیان لەم ڕاووداووونانە دەرباز بكەن. بڕیاریشیاندا شوێنەكانی پیاسەی ڕۆژانەیان بگۆڕن. هەفتەیەك تێپەڕی بەسەر ئەو ڕووداوەدا كاتێك سەرلەنوێ، لووتیان تەقیەوە بە لووتی ئەو گەنجەدا. لە شەقامێك دەپەڕینەوە لە نزیك باخی گاورباغیەوە، بینیان لە گۆڕەپانێكدا وەستاوە، بەبێ ئەوەی ئەو بەوان بزانێت. بەخێرایی و بەشێوەیەكی ئاسایی گەڕانە دواوە هەتا خۆیان بەدوور بگرن لە هەر شتێكی خراپ كە ڕەنگە لەو بینینەیانەوە ڕوو بدات. بە بیری كەسیان و بیری كەسی تریشدا تێناپەڕێت كە قەدەر لەمە خراپترو مەترسیدارتری لێ شاردبوونەوە كە خۆیان لێ لادەدا. نزیكەی بەر لە خولەكێك لەم شەقامە پەڕینەوە، بەڵام وا دەگەڕێنەوە بەرەو ئەو، دوای نزیكەی یەك خولەك لە پەڕینەوەی دووهەم پێیدەگەنەوە. هەنگاوەكانیان بەسەر قیرەكەدا درێژتر دەكرد، دوای چەند مەترێكیش لەوان، شەش "ئەفەندی" مەدەنی دەڕۆن، بە دەنگێكی هێواش قسەیان دەكرد. چاوی ڕاضی كەوتە سەر چاوی یەكێكیان. ئەوان زۆر باش یەكتر دەناسن، خەڵكی گەڕەكێكن. بەر لە ماوەیەكیش، پەیوەندیی حیزبیشیان هەبووە. هەریەكەشیان بە تێكۆشانی خۆی، پاڵپشتی ئەوی تریانی

کردووە. ئەمە بەر لە کەمتر لە ساڵێک بووە. دواتر پەیوەندیەکانیان بەسەر سەرا هەڵگەڕاوەتەوە. بینینی ئێستایان ئا لەم شەقامەدا لە شاری کەرکوک، بینینی دوو پیاوە دوژمن بەیەک. راضی هەر خەباتگێڕێکی شیوعیە، بە حەماس و هەوڵێکی بەرزەوە هەر کار دەکات، ئەمە لەکاتێکا ئەو کەسەی تر، کازم، بۆتە خزمەتکاری فەرمانگەی پۆلیسی نهێنی. کەسێکی سووک، خۆنەگر لەبەردەم ئەشکەنجەدا لە کاتی گرتنیدا. ئەو بەوەیشەوە نەوەستا کە هەندێک لە گیراوەکانی تر دەیکەن و درۆیش هەڵدەبەستن لەژێر زەبری ئەشکەنجەدا، بەڵام کەمێک دابونەرێت و سۆز هەر دەهێڵنەوە بەرامبەر بەو خەباتە جوانەی ڕابووردوویان. ئەم لەبەردەم ئامێری سەرکوت کردندا بە چۆکا هاتووەو هەڵخزاوەتە ناو لیتاوی خیانەتکاریەوەو بۆتە پۆلیسێکی خۆبەخش بۆ پاکتاو کردنی ئەوانەی دوێنێ هاوڕێی بوون. وە هاتنیشی بۆ ئەم شارە لەگەڵ مەفرەزەیەک پۆلیسی نهێنیدا بووە بە مەبەستی هەستان بە هەڵمەتێکی نوێ دژی شیوعیەکان.

پیاوانی ئەم مەفرەزە نهێنیە هیچ شتێک لە بارەی ماڵ و جووڵەی راضی و مەجیدو هاوڕێکانی تریانەوە نازانن لە کەرکوک، وە هەر ناشزانن ئەوان لەوێ دەژین. دەکرا بێنە کەرکوک بۆ گەڕانێکی بێهودە بەدوای شیوعیەکاندا، پاشان بە شکستێکی تەواوەوە بگەڕانایەتەوە. بەڵام لێرەدا، لەسەر شەقام و هەر بە ڕێکەوت، نێچیرێکی چەوریان دەستکەوتووە کە خەویشیان پێوە نەبینیوە.

ئایا ئەم ڕێکەوتە هەر تەنها ڕێکەوتێک بوو یان کەمی ووریایی ئەو دوو لاوە شیوعیە بوو؟ فەلسەفە دەڵێت ڕێکەوت شێوەیەکە لە شێوەکانی وەدیهاتنی پێویست. من باوەڕم بەم گووتە فەلسەفیە هەیە، بەڵام ناتوانم ئەوەیش دەرنەخەم کە "هاتووچۆی" زۆری ئەم دوو شیوعیە لە ڕۆژدا، هەر دەبێتە هۆی ڕووداوێکی لەم جۆرە.

با ئێستا واز لە فەلسەفە بهێنین .. پرسەکە هەستیارو پڕ مەترسیە .. لەوانەیە هەر دوای ماوەیەکی کەم بگیرێن و ببنە دەستکەوتێکی باش. ئەوان لە بەغداوە بە مەبەستی

چەواشەکردنی پۆلیسی نهێنی و زامنی پاراستنی کادرەکانیان هاتن بۆ ئێرە بۆ ماوەیەک، دوای چەند هەفتەیەکی کەم لە گەیشتنیان، دوانیان لێ بگیرێت.

راضی هەر کە کازم دەبینێت بە چپەوە دەڵێت:

- هاورێ! ئەوە کازمە.
- بەردەوامبە لە رۆیشتن و بایەخیان پێ مەدە –ئەمە وەڵامی مەجید بوو، ئەمە لەکاتێکا ماوەی نێوانیان ئەوەندە کەم بووبۆوە کە بۆ دەستدرێژ کردن بۆ تەوقە دەستی دەدا.
- کورە بوەستە! کازم بە راضی گووت.
- بەردەوامبە لە رۆیشتن –مەجید گووتی. رۆیشتنەکە خێراتر بوو.
- بوەستە! کازم بە دەنگێکی بەرز راضی بانگ کرد.

ووشەی دوایی بە هێرشەوە بوو بۆ سەر ئەو دوو لاوە شیوعیە لە پیاوانی مەفرەزە نهێنیەکەوە کە چەکداریش بوون بە دەمانچە. هەر لەو چرکەساتەدا هەردووکیان بە هیوای دەرباز بوون لە دەستیان رادەکەن. راستە، لە حاڵەتێکی ئاواداو لە شوێنێکی ئاوایشدا، هیوای دەرچوون لاوازە، تەنها چەکی ئەوان "راکردنە"، زۆرجاریش ئەمە چەکێکی باش نیە. بەڵام پەنا بردن بۆ ئەو چەکە، با لاوازیش بێت، لە حاڵێکی وادا باشترە. بێ شک ئەوان دەست بۆ چەک دەبەن، وە لەوانەیشە راکردووەکە بە فیشەکێک بپێکن، بەڵام لەوانەیشە بەر نەکەوێت.

خراپیی ئەم رێکەوتە لەگەڵ ئەم سیخوورانەدا لە ناوەراستی ئەم شەقامەدا هەر تەنها ئەم بینینە چاوەروان نەکراوە نەبوو، بەڵکو ئەوەیش بوو کە، بۆ بەدبەختی، رووداوەکە دەیان مەترێک لەو خانۆچکەیەوە دوور بوو کە لە یەکێک لە سێ ژوورەکەیدا، مەجید خۆی لەگەڵ ساڵەح و خێزانی دایکی غەریبدا دەژیا. ئەگەر مەجید بەتایبەت لەم شوێنەدا بگیرێت، ئەوا دوورنیە لە ماڵەکەیش بە ئاگا بینەوە. ئەوسا کارەساتێکی تریش دەخوڵقێت!

لەو ڕۆژانەدا راضی تووشی بێ خوێنیەکی گشتی و چەند نەخۆشیەک هاتبوو. وەرزیش باران و قوڕوچڵپاوو سەرمایەکی زۆرە. بۆیە جلەکانی ئەستوورو قورس بوو، توانای ڕاکردنی کەم کردبۆوە. ئەو چەترە کۆنەیشی لێ بووبووە بار کە لە مەجیدی قەرز کردبوو، چەترێک کە مەجید بەر لە سێ ساڵ لەوەوبەر لە "کۆنە" کڕی بووی.

جلەکانی مەجید زۆر کەمتر بوون —بەدلەیەکی کرێکاری سووکەڵەو چاکەتێکی کۆن. بەڵام جزمە لاستیکیە گەورەکانی، قاچەکانی قورس کردبوو. ئەو جزمانە ڕێگری ڕاکردنی خێرا دەبن، بۆیە دەبوایە بیری لە دەرباز بوون بکردایەتەوە لە دەستیان کە قوڕیش ئەوەندەی تر قورسی کردبوون.

ئەم دوو لاوە هەروەک ئاسکێکی ترسێنراو کە سەگ دوای کەوتوودو ڕاوی دەکات، هەموو هێزی خۆیان بۆ ڕاکردن کۆکردەوە. چوونە ناو کۆڵانێکی تەنگەبەرەوە کە مەترو نیوێک پانتر نەدەبوو، بە نێو خانۆچکە قوڕینەکاندا تێدەپەڕی و دوای نزیکەی سەد مەترێک، بە بۆشاییەک کۆتایی دەهات کە لەو بەریەوە ژمارەیەک چایخانەی میللی تێدا بوو پڕ بوون لە زەحمەتکێشان. مەجید هەر لە سەرەتاوە چەند هەنگاوێک لە پێش راضیەوە بوو لە ڕاکردندا. کەسیشیان نەیاندەتوانی یارمەتی کەسیان بدەن. چاکتریش وایە هەریەکە خۆی دەرباز بکات.

سیخووڕەکان بەدەم ڕاکردنەوە، بە بەرزی هاواریان دەکرد:

- بیانگرن، شیوعین، بیانگرن جوولەکەن!

بوێری ئەوەیان نەبوو بڵێن "ئێمە بۆیە ڕاویان دەنێین چونکە دژی کۆلۆنیالیزمن، دژی ڕژێمی پادشایەتی بەکرێگراون".

لە کۆڵانە بەرتەسکەکەدا پیاوێکی درێژ لەبەر دەرگایەکدا وەستابوو، دەیتوانی ڕێگاکە دابخات و ڕێگری مەجید بکات. بەڵام بە جیددییەوە خۆی تێهەڵنەقرتاند، بەڵکو هەر تەنها

دەستێکی درێژ کرد ڕێگری بکات، مەجید بە ئاسانی لە دەستی دەرچوو، بە جووڵەیەکی خێرایش خستی بە زەویدا. ڕاضی بەر ئەو کەوت، ئەویش کەوت و گەیشتنە سەری و گرتیان.

کاتێک مەجید گەیشتە بۆشاییەکەو پۆلیسیش لە دوایەوە هاواریان دەکرد " بیگرن، شیوعیە، بیگرن جوولەکەیە ". دەیان کەسی دانیشتووی نێو چایخانەکان هەستانە سەرپێ و وەک ڕێگرێکیان لێهات کە مەحاڵ بوو ئەم لاوە ڕاونراوە بە سەلامەتی پیایا دەرچێت. دەیان دەم بە تورکمانی قسە دەکەن. ووشە حەماسیەکانیشیان لەوە دەچوو بجووڵێن بۆ گرتنی ئەم بەناو تاوانبارە. بۆیە هیچ بۆ ئەو گەنجە ڕانراوە چواردەور گیراوە نەمایەوە: گەڕانەوە نەبێت بە کۆڵانێکی تری بەرتەسکدا بەرەو هەمان ئەو خاڵەی یەکەمجار ڕاکردن لێیەوە دەستی پێکرد. لەو کۆڵانەدا پیاوێکی تر قورس و لەسەرخۆ دەڕۆیشت، پۆلیسێک بوو ساڵەکانی ژیان و کار کردن هیلاکی کردبوو، قوڕوچڵپاویش بێتاقەتی کردبوو. بانگیان لێکرد: پۆلیس، بیگرە، بیگرە!"، بە بیری مەجیددا تێپەڕی پەنا بۆ فێڵێک بیات بەڵکو ئەم پۆلیسەی پێبخەڵەتێنێت، ئەویش بە دەوری خۆی هاواری کرد "پۆلیسە بیگرن، پۆلیسە بیگرن".

پۆلیسە بەساڵاچووەکە لە جێی خۆی وەستا، یان وای پێباش بوو وا نیشان بدات، هیچ هەوڵێکی نەدا ئەو لاوە ڕاکردووە بگرێت، بەڵکو وەستاو هەر ئەوەندە وەڵامی دایەوە "تێناگەم دەتانەوێت من کێ بگرم".

دوای تێپەڕبوون لە پۆلیسەکە، مەجید جزمەیەکی لە قاچێکی داکەند. بە قاچێکی پەتی و بە جزمەیەکەوە ڕایدەکرد. تا لەم دیمەنەداو بەدەم بیرکردنەوەوە، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی چایخانەیەک پەلاماریاندا بیگرن، دوژمنیش لە شەڕێکی بێ بەرامبەردا، هەر بەدوایەوەن، قاچ و زمانە پیسەکەیان و هەڕەشەیان بەکاردەهێناو مەخزەنێکیشیان تیا خاڵی کردبووینەوە. مەجید سەرلەنوێ، بە ڕاکردنێکی خێرا، لە شەقام پەڕیەوە، ڕێک بەردو

ئەو شوێنەی بەر لە چەند خوولەکێک سیخوورە لاوەکەی لێوەستا بوو، لەو شوێنەی لەگەڵ راضی هاورێی تێبینییان کردو گەڕانەوە بۆ خۆبەدوور گرتن لە کێشە! ئایا دەشێت ئێستا ئەم سیخوورە بەدەست بەستراوی بوەستێت بەرامبەر ئەم پرۆسێسە کە دوو کەسی تێدا ڕاو دەنرێت پێشتر خۆی بەدوایانەوە بووە؟ نەخێر، بێگومان ئەمە ناشێت. ئەو کۆمیدیایەی لە چرکەساتەکانی یەکەمدا ڕوویانداو سەرنجی خەڵکە نزیکەکەی ڕاکێشا بۆ شوێنی ڕووداوەکەو بۆ بۆشاییەکەی چایخانەکانی لێیە، سەرنجی ئەم لاوەیشی وەک فزولیەکانی تر هەر ڕاکێشاوە.

مەجید بەدەم ڕاکردنێکی ئێجگار خێراوە، دەبوو یەکسەرو بەبێ وەستان بریار بدات ئایا دوژمنەکانی هەر لەنێو خانووەکانی شارو کۆلانەکانیدا بەدوایەوە بن، یان دەبێت لێیان دەرچیت بەرەو دەوروبەری شار. ڕووی کردە باخی گاورباخی، واتە بریاریدا دەرچیت بەرەو قەراغ شار، شوێنێکە نە ڕێگاوبانی لێیەو نە دانیشتوانی چایخانەکان. بەر لەوەی بە تەلبەنی باخەکەدا هەڵگەڕێت، توانی جزمەکەی تریش لە کۆڵ خۆی بکاتەوەو فرێیدا، وە ئیتر بە دوو پێی پەتیەوە کەوتە ڕاکردن، هەستی وابوو باشتر ڕادەکات. بەڵام هێشتا هەر مەترسی قورسی لەسەرە. دوژمنیش بە هەموو ووزەیانەوە ڕادەکەن، دوودڵیش نین لەبەکارهێنانی دەمانچەکانیان. مەجید ڕۆژێ لە ڕۆژان نەهاتۆتە ئەو باخەوە، نازانێت چی تێدایە جگە لەو دارانەی لووتبەرزانە تیایا وەستاون. مەجید لەناو باخەکەدا چاکەتەکەی جێهێشت تا سووکەڵەتر بێت. هەر چوونەناو باخەکە خۆی، تێپەڕبوونی قۆناغێکی مەترسیە قورسەکە بوو، چونکە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، دەتوانێت خۆی لەبەرچاو وون بکات و نێوانیان دوور بکەوێتەوە. بێگومان ئەوانیش دێنە ئەم باخە بچکۆلەیەوەو بەدوایشیدا دەردەچنە دەرەوە. بەڵام بەمە کات دەستدەخات و لێیان دوور دەکەوێتەوە.

لاوە ڕاونراوەکە لە باخەکە دەرچوو، هەر ڕادەکات و دەیەوێت ئاراستەیەک بگرێتە بەر. ئەو نە دەیویست لێرەوە بچێتەوە ناوشار، نە دەشیەویست زۆر لە شاریش دوور بکەوێتەوە.

بێگومان دەیەوێت لە شوێنێکی ترەوەو لە خاڵێکی گونجاوەوە بگەڕێتەوە ناو شار دوای ئەوەی لە پیاوانی پۆلیسی نهێنی وون دەبێت و ئیتر واز لە ڕاونانی دەهێنن. لە سەرەتای ڕاکردنەوە تا ئێستا، وورده وورده، ماوەیەک کەوتۆتە نێوان ئەوو ئەوان و لەوانەیشە ئیتر بێ هیوا بووبێتن و هیلاکیش بن، ئەویش هەر ڕادەکات هەروەک ئەوەی ئێستا دەستی پێکردبێت. هەموو چرکەساتێکیش ماوەی نێوان خۆی و ئەو ڕووبارە کەمتر دەبێتەوە کە ڕووی تێکردووە. ئەم ڕووبارە لە هاویندا بە تەواوی ووشکە، تەنانەت لە زستانیشدا ئاوی کەمە ئەگەر چەند ڕۆژێک نەبارێت. بەڵام ئێستا، دوای چەند ڕۆژێک لە لێزمەی بەردەوام، بۆتە ڕووبارێکی بەهێزی خووڕ، بەبێ شک ئەو پۆلیسە نهێنیانەی ئەو ڕاو دەنێن خۆیان نادەن بەدەم ئەو ئاوەوە. بەڵام ئەم لاوەی لەژێر هەڕەشەی گرتندایە، هیچ دوودڵ نیە لە پەڕینەوە. ئەو وایدادەنێت ئەمە مەترسی نیە بۆی.

لە ڕووبار پەڕیەوەو کۆتایی فەسڵێکی لە " شانۆگەریی ڕاونان" تۆمار کرد، بەڵام بەبێ ئامادەبوونی هیچ وێنەگرێکی سینەمایی. پاش کەمێک گەیشتە گەڕەکی "شۆرجە"، دڵنیا بوو لەوەی لە ئەماندایە. ئینجا سەیری جلوبەرگە نا ئاساییەکەی کرد، هەتا سەر سنگی تەڕە، دوو پێی پەتی. ئەم دیمەنە دەیکاتە جێی شک و گومان. کاتیش لە خۆر ئاوا بووندایە. کەواتە با بچێتە مزگەوتێکەوەو لە حەوزەکەیدا خۆی پاک بکاتەوەو نیو کاژێرێکیش لە وەخت "بکوژێت" هەتا تاریکی دادێت. خۆی ڕزگار کرد، بەڵام ناتوانێت بیر لەوە نەکاتەوە کە بەسەر ڕاضیی هاوڕێی هات، ڕزگاریشی نابێت لە دڵەڕاوکێی چارەنووسی ئەو ماڵەی لێی دەژی کە دەکەوێتە نزیکی ئەو خاڵەوە پیاوانی ئەو مەفرەزە نهێنیەی تیا بینی. دەبێت ساڵەح و ئامێری ڕۆنیۆکە چیان بەسەر بێت کە لەو ماڵەدان ئەگەر خۆبەخشێک پیاوانی ئەو مەفرەزەیە ئاگادار بکەن و پێیان بڵێن ئەمە ماڵی ئەو کەسەیە کە ڕاوتان دەنا! دەبێت هەر ئێستاو بەبێ دواکەوتن و بەر لەوەی کات بەسەر بچیت، هەموو هەوڵێک بخاتەگەڕ هەتا لەوە زیاتر ڕوونەدات کە ڕوویدا، ئەمە دواین بیرکردنەوەی بوو، بەڵام دەبێت هەر چاوەڕێی تاریکی بکات.

مەجید سەرباری هەموو ئەو هیلاکیە تایبەتیەی، نەیتوانی بێدەنگ بێت بەرامبەر بەو گفتوگۆیەی لە نێو پیاوانی نوێژکەردا دەهات و دەچوو. یەکێکیان گووتی:

- براکەم دوای دوو ڕۆژی تر لە زیندان دەردەچێت، حوکمەکەی تەواو دەبێت. حەوت ساڵی لە زیندان بردە سەر. خوایە گیان سوپاس!
- یەکێکی تری بە تەمەنیان پرسی: ئێستا لە چ بەندیخانەیەکە وا دێتەوە لێرە بژی؟
- لە بەندیخانەی بەغدایە. هەر لە بەغدا دەگەڕێین بەدوای کارێکدا بۆی. کەسێکی زۆر گرنگیشمان هەیە کە دەتوانێت وەک پاسەوانی شەو لە مەخزەنێکدا دایبمەزرێنێت لەوێ.
- ئەگەر کەسێکی ئەوەندە بە توانایەو دەتوانێت خەڵکی دابمەزرێنێت، با یارمەتی کوڕەکەی منیش بدات و وەک پاسەوانی شەوانە دایبمەزرێنێت.

سێهەمیش لە ئامادەبووان، باڵا کورتێکی فزولی سوعبەتچی پرسی:

- ئا توخوا پێم بڵێ ئەمە کێیە ئەم کەسە گەورەیە؟
- سایەقی ئۆتۆمۆبێلە.
- بۆچی سایەقێک دەتوانێت خەڵکی لە فەرمانگەو کارگەدا دابمەزرێنێت؟
- تۆ واز لە پرسیارە هیچ و پووچەکانت ناهێنێت! ئەی چۆنە بەلاتەوە ئەگەر ئەمە سایەقی کەسایەتیەکی گەورە بێت؟
- دەبێت چەندی بدەیێ بەرامبەر بە دامەزراندنی براکەت وەک پاسەوانی شەو؟
- ئەو برادەرمە، بەرتیل لەمن وەرناگرێت، بەڵام چەند دیاریەکم بۆ بردووە.

مەجید تێگەیشت ئەو پیاوەی دوای دوو ڕۆژ زیندانیەکەی تەواو دەکات، بەهۆی ناکۆکی نێوان جووتیارانەوە بووە لەسەر زەوی و ئاو، پیاوێکی تێدا کوژراوەو یەکێکی تێدا بریندار بووەو دوانیشی تێدا گیراوە. ئەم برایەیشی کە بەند نەکراوە، لەو کاتەوە ناچار بووە دێ

بەجێبهێڵێت. بەخت یارمەتی داوە دوکانێکی داناوە لە کەرکوک و بازرگانیەکەیشی سەرکەوتوو بووە.

تاریکی داهات، بە جۆرێک کە ئیتر زەحمەت بوو لە شەقامەکەدا جیاوازی ببینرێت لە نێوان جلی تەڕو ووشکدا. کەواتە ئیتر کاتی ڕۆیشتنی مەجیدە. ڕووی کردە شوێنێک برادەرێکی لەوێیە، قوتابی یەکێک لە قوتابخانەکان. ئەو شوێنە پێیان دەگووت "قسمی داخلی" بۆ قوتابیان، بەڵام لە جۆرێکی تایبەت! بەختی واپهێنا برادەرەکەی لەوێ بوو، بە گەرمی پێشوازی لێکردو پرسیاری ئەم تەڕبوون و پێ پەتیەیی لێکرد. بێدەنگ بوو، بە گونجاوی نەدەزانی باسی ئەو ڕووداوە بکات. پێڵاوێک لەوێدا بوو کە بتوانرێت بە شێوەیەکی وەختی بەکاربهێنرێت. پاشان داوای مۆڵەتی چوونە دەرەوەیەکی کردو دواییش بۆ خەو بگەڕێتەوە بۆ لای برادەرەکەی.

دەبێت بڕوات، هەوڵی دوورخستنەوەی مەترسی بدات لەوەی ئێستا ڕوویدا. بەڵام بۆ کوێ بڕوات و چی بکات؟ ئایا دروستە خۆی بخاتە مەترسیەوەو بگەڕێتەوە بۆماڵەوە؟ ڕەنگە دەرئەنجامەکەی خراپ بێت، ڕەنگە چواردەوری ماڵەکە گیرابێت و کەمینێک بۆ ئەوانە دانرابێت کە دەچن بۆ ئەوێ. کەواتە بە ڕۆیشتن بۆ ماڵەوە "ترنکەیش و سەبەتەکەیش" پێکەوە لە دەستدەدات. کەواتە با لە دوای هاوڕێ قادر بگەڕێت و پرسێکی پێبکات و بزانێت ئەو چی دەڵێت.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر، هاوڕێ قادر هات بۆ "قسمی داخلی"، بۆ ئەو شوێنەی مەجید شەوەکەی لێبردەسەر. مەجید هەر یەکسەر، بەبێ لەدەستدانی یەک چرکە لە کات، دەستی بە قسە کردن کردو بەچپە بە هاوڕێکەیی گووت:

- مەترسیەکی گەورە ڕوو دەکاتە ساڵەح و ئەو ماڵەی تێیدا دەژی. نامێری ڕۆنیۆکەیش لەوێیە.

- جا چی بکەین باشە بۆ ئەوەی مەترسیەکە دووربخەینەوە؟ قادر پرسی. من ئامادەی هەموو شتێکم حیزب پێم بسپێرێت.
- دەچیت بۆ ماڵەوە بەو جۆرەی بۆت ڕوون دەکەمەوە -مەجید گووتی. وێنەی شەقام و ماڵەکەی بۆ کێشا. دەبێت لە پێشدا دڵنیا ببیت لە خانوەکە کە لە پۆلیسەوە چواردەوری نەگیراوە. ئامانج ڕزگار کردنی ساڵەح و ڕۆنیۆکەو پاککردنەوەی ماڵەکەیە لە نووسینە حیزبیەکان.
- هەموو شتێک ڕوونە .. هەر ئێستا دەڕۆم بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە.

قادر بە سەرکەوتوویی ئەرکەکەی ئەنجامدا، هەر دوای کەمتر لە دوو کاژێر، هەموو شتێک کەوتە ئەمانەوە، دوور لەو ماڵەی کەوتبووە مەترسیەوە. ساڵەح خۆیشی، دوای هەواڵەکە، بەشێکی تەگبیرەکانی خۆپاراستن دەگرێتە ئەستۆ. ئامێری ڕۆنیۆکە، قورسترین و بە نرخترین بوو لە ماڵەکەدا.

ئایا دەرئەنجامی چالاکی ئەم مەفرەزەیەی پۆلیسی نهێنی کە لە بەغداوە گەیشتوونەتە ئێرە، هەر ڕاو کردنی راضی بوو بە ڕێکەوت؟ نەخێر، زۆر بەداخەوە. ئەگەر دەربڕین ڕێگە بدا، ڕێکەوتێکی خراپی تریش ڕوویدا. ئەمەیش دەرئەنجامی کەمی وووریایی و کەمی ئەزموون بوو کە بووە هۆی ڕاوی هاوڕێیەکی تریش. قادر دوای هاوبەشی کردن لە ڕزگار کردنی ساڵەح و ماڵەکەدا، ڕۆیشت بۆ ماڵی هەندێک لە خزمانی دایکی غەریب، بە مەبەستێک ڕۆیشت کە هاوپەیوەست بوو بە ئاگاداریی پەیدا کردن و تەگبیری خۆپاراستنەوە. مەفرەزەی پۆلیسی نهێنی، لەکاتی بوونی ئەودا لەوێ، هەمان ئەو ماڵەی نابۆوە کە بدەن بە سەریدا. ئەو لەمەدا ئامانج نەبوو، بەڵکو هەر تەنها بوونی لەوێ لەو چەرکەساتانەدا، بەس بوو بۆ گرتنی. پیاوانی مەفرەزەکە گەنجێک دەبینن لەو ماڵەداو لە سەرەتایشەوە هیچ بایەخێکی پێ نادەن. یەکێکیان لێی دەپرسێت:

- تۆ کێیت، چی دەکەیت لێرە؟

شکی تێدا نیە ئەو لاوە شیوعیە، دەکەوێتە حاڵەتێکی چاوەڕواننەکراوەوەو شڵەژاویشە. گەڕاوە بەدوای شتێکدا بیکاتە بیانووی بوونی لەوێ. وایزانیوە ئەوە بەسە بڵێت کەسانی ئەم ماڵە ناناسێت، هاتووە بۆ کڕینی شتێک- با ئەو شتە مێوژ بێت!

- هاتوویت بۆ ئێرە بۆ کڕینی مێوژ؟
- بۆچی لێرە دوکانێک هەیە مێژو بفرۆشێت؟ یان دەتەوێت درۆمان لەگەڵ بکەیت؟

قادر نەیتوانی بوو چەواشەیان بکات، بەڵکو نەیشیتوانی بوو قەناعەتیان پێبکات وازی لێبهێنن ئەگەر تەنانەت کڕیارێکی ڕاستەقینەی مێوژو دوور لە سیاسەت بووبێت! ئەویش دەبرێت بۆ فەرمانگەی پشکنینی تاوانکاری لە بەغدا.

ئەم بەرکەوتنە نوێیە قورس و چاوەڕوان نەکراو بوو، بەڵام لەو لێدانانە بوو کە لە یەککاتدا دڵخۆشکەریش بوو، ئازاربەخشیش بوو –ئازاربەخش بوو کە هەردووکیان لە کادرەکانی حیزب بوون و کەوتنە دەست دوژمنی چینایەتی، دڵخۆشکەر بوو کە ئەو دوو هاوڕێیە هەردووکیان، راضی و قادر، خۆگر مانەوە لەڕووی جەلادەکاندا، شەرەفی حیزبی خۆیانیان پاراست، نهێنیەکانی حیزبیان پاراست، باوەڕی هاوڕیانیشیان بەهێز کرد. بە تەواوی هەواڵیان نەما، هاوڕێکانیشیان هیچیان لە بارەوە نەدەزانین ئەوە نەبێت کە خۆگر ماونەتەوە.

هەر لەو ڕۆژەدا کە قادر گیرا، مەجید لە گەڕەکێکی میللی لە دوروبەری شار، ژوورێکی نوێی بەکرێ گرت. هەردوو لاوەکە شتەکانیان بە شان گواستەوە بۆ ژوورە تازەکەیان بە ڕۆنیۆکەیشەوە. ژوورێکی بچکۆلەی قوڕینە لە بینایەکی سادەدا لەسەر تەرزێکی دێهاتی، خاوەن ماڵ خۆی دوو ژووری بەکاردەهێنا: کرێکەی گران نەبوو –نیو دینار بوو! کاتێک گواستنەوە تەواو بوو، مەجید بەرە کۆنە سادەکەی ڕاخست و دانیشت بۆ حەوانەوە، ساڵەحیش وەستابوو، زۆر لە قووڵاییەوە پێکەنینێکی هێواشی کردو گووتی:

- ژیانێکی پڕ لە سەیروسەمەرەو شتی کوتوپڕ! دوێنێ لە کوێ بووین و ئەمڕۆ لەکوێین؟ هاوڕێکانمان راضی و قادر ئێستا لە کوێن؟ ئەوان ئێستا درندانە ئەشکەنجە دەدرێن.
- چواردەوری ڕێگای خەبات بە مەترسی گیراوە .. ئێمەیش زامنی ئەوەمان نیە هەتا سبەینێ بمێنینەوە. بەڵام بەردەوامین، ئەگەر دوژمنان سەرنگومیان کردین، هاوڕێیانی تر لە هەمان ڕێڕەودا بەردەوام دەبن. با ئێستا خواردنی نیوەڕۆ ئامادە بکەین هاوڕێ ساڵەح.
- چی خواردنێک ئامادە بکەین؟
- لۆبیاو برنجی ووردەمان هەیە، لە ماوەی نیو کاژێردا چاکترین شۆربا ئامادە دەکەین ئەگەر پەلە بکەیت لە داگیرسانی پرێمزەکەدا.

ئەم پرێمزە نەوتیە دەنگێکی هەیە هەروەک دەنگی دینەمۆی فرۆکە، ووزەیەکی گەرمی ئەوەندە گەورەیش دەدات بەسە بۆ گەرم کردنی ئاو تا پلەی کوڵاندن لە ماوەی چەند خولەکێکدا لەو چەندایەتیە کەمەی مەجیدو ساڵەح پێویستیان بوو. بە ئاسانییش دەداگیرسا. بەڵام ئەو ڕۆژە مانی گرتبوو لە کار، ڕۆژی یەکەمی گواستنەوەیان بۆ ئەو ژوورە نوێیە. ئەم ڕێکەوتانەیش گەلێ کەس تووشی ڕەشبینی دەکەن.

- پرێمزەکە نایەوێت داگیرسێت هاوڕێ –ساڵەح گووتی، بێهودەیش هەر خەریکی چاککردنی بوو.
- چیەتی؟
- پەمپ وەرناگرێت.
- پەمپەکە دەربهێنەو کەمێک چەوری بکە –مەجید وەڵامی دایەوە، دوای ئەوە ئاسایی دادەگیرسێت.

- من هەرگیز مەکینەی پرێمزم نەکردۆتەوە هاوڕێ –ساڵەح بە توونێکی ئاسایی سادە ئەمەی گووت، وەک ئەوەی وایدانابێت مەکینەیەکی ئاڵۆز لەناو پرێمزەکەدا بێت وەک مەکینەی ئۆتۆمۆبێل! یان مەکینەی کاتژمێرێک!
- ئەمە ماقوڵە هاوڕێ ساڵەح؟ چۆن تا ئێستا مەکینەی پرێمزت نەبینیوە؟
- قەت نەمبینیوە.
-

## شەوێک لەژێر باراندا

پەیوەندیەکی خۆش دروست بووبوو لەگەڵ خاوەن ماڵدا، مام رەشیدو خێزانەکەی کە لە دایکی و ژنەکەی و سێ منداڵ پێکهاتبوون، لەگەڵ مەجیدو ساڵەح، ئیتر ئەمە بەبێ ئەوەی بزانن ئەم دوو لاوەی لە یەکێک لە ژوورەکانی خانوەکەدا نیشتەجێ بوون، شیوعین و ڕاونراون لە پۆلیسەوە. دوو هاوڕێکەیش ڕاهاتن لەگەڵ ئەم ژیانە نوێیەدا، بەردەوامیش بوون لە چالاکی حیزبیان و پەیوەندیە حیزبیە کەم و کورتەکانیاندا. پێکیشهاتن لەسەر ئەوەی کە گونجاو ترە بۆ ماوەیەک ئەم شارە جێبهێڵن کە پۆلیسی نهێنی فۆکوسی خستۆتەسەر لە گەڕاندا بە دوایانا. خۆیان ئامادە کرد سبەینێ بەیانی، سەفەر بکەن بەرەو شارێکی تر. کەسیشیان پێناسەیەکیان پێ نیە. ناشتوانن وەک خەڵکی تر بچنە گەراج تا لەوێوە سواری ئۆتۆمۆبێلێکی کرێ ببن. بەڵام سووریشن لەسەر سەفەرو "نەخشەی تایبەتی" خۆیان هەیە لەمەدا –ئەگەر ئەمە بە نەخشە دابنرێت.

ئەوا بەبێ لەشار دووردەکەونەوە، هیچیشیان پێ نیە چوار نان و شخارتەیەک نەبێت بۆ هەڵگیرسانی ئاگر لە کاتی پێویستدا. کات زستانەو خۆر ساردە، ڕێگایش نزیکەی ١٢٠ کیلۆمەتر دەبێت. ئایا دەکرێت ئەم هەموو ڕێگایە بە پێ ببڕن؟ ئەگەر پێویست بێت، ئەوا بەبێ دوودڵی ئەو کارە دەکەن. بەڵام دەشتوانن دوای چەند کیلۆمەترێک دوورکەوتنەوە لە شار، سواری ئۆتۆمۆبێلێک ببن، ئۆتۆمۆبێلی پاسی تەختەی کۆن لە نێوان بیست هەتا

بیست و پێنج کیلۆمەتردا ڕێگا دەبڕێت لە کاژێرێکدا. یەکێک لە کەرکوکەوە هات و نزیک بۆوە لێیان. هەر بە سووکە ئیشارەتێک سایەق وەستا.

- دەتوانیت هەتا چایخانەی تەینالّمان بەریت؟

گەرچی ئۆتۆمۆبێل پڕ بوو، بەڵام هیچ دوودڵیەکی نەبوو لەوەی بڵێت:

- سەرکەون .. جێگایەکیان دۆزیەوە بە: تکایە بەیارمەتی خۆتان.

سەرکەوتن و پاڵێکیان نا بە دانیشتووەکانەوە، هەروەک ئەوەی خۆیان بخەنە فۆرمێکەوە بۆ گۆڕینی شێوەی خۆیان. بەڵام لەم وەستانەدا بۆ ئێمە، مەکینەی ئۆتۆمۆبێل کە یەکێک لەمۆدێلەکانی بەر لە جەنگی جیهانی دووهەم، لە کار وەستا. سەکن دابەزی و بە هەندر هەوڵی دەدا بیخاتەوە گەڕ. دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن وەک ئەو بەساڵاچووەی تەمەن و ئەخۆشی زەفەریان پێ بردبێت. بە دوو کاژێر بەر لە خۆرنشینان، گەیشتە چایخانەکەی تەینالّ، لەوێ وەستا هەتا نەفەرە ماندووەکانی لە دەوری زۆپایەکی ئاسنین دانیشن و کەمێک گەرمیان ببێتەوەو بحەوێنەوە. گڕی دارو پشکۆی گەشاوەی زۆپاکە، گەرمی و دڵنیایی بەدەوری خۆیدا دەڕژان.

دوای ڕۆیشتنی ئۆتۆمۆبێلەکە بە چەند خولەکێک، ئەو دوو لاوە حەزیان بە چوونە دەرەوە بوو لە چایخانەکە، ئۆفیسەرێک لێیان نزیک بۆوە، عەریفی پۆلیس بوو، باڵا مامناوەندیەک، قۆناغی تەمەنی مامناونجی تێپەڕاندبوو، قورسیش دەجووڵا بەهۆی قەڵەویەکی زۆرو وورگێکی ئاوساوەوە، لە شێوەی چپەدا لێی پرسین:

- ئەوە چیتانە؟ خۆ سەربازی ڕاکردوو نین؟

- نەخێر، سەربازی ڕاکردوو نین.

دیار بوو پۆلیسەکە ئاسان بوو، گوێی بە هیچ نەدا، لە شتەکەیشی نەکۆڵیەوە، پشتی تێکردن و ڕووەو سەنتەری پۆلیس کەوتە ڕێ. دووانەکەیش بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن، دەیانەویست هەروەک سەرلەبەیانی، ئۆتۆمۆبێلێک بوەستێنن و سوار بنەوە. دوای نیو کاژێر لە ڕۆیشتن، وە دوای شکستی هەموو هەوڵەکانیان بۆ وەستاندنی ئۆتۆمۆبێلە کەم و دەگمەنەکان، ئیتر کەوتنە حاڵەتێکی ناڕەحەتەوە: بارانی بەخوڕ، نزیک بوونەوەی هەتاو لە وون بوون، سەرمایەکی زۆر، ڕەشەبایش دڵۆپە بارانی دەکێشا بە دەموچاویاندا، جلەکانیشیان شوێنێکی نەما بوو باران تەڕی نەکردبێت. تۆ بڵێی لە چارەیان نووسرا بێت ئەمڕۆ لێرەدا بمرن؟ گەلێ ساڵ لە زستاندا، زریانی بەفر هەڵدەکات و دەبێتە هۆی تێشکاندنی ژمارەیەک لە ڕێبوارانی ئەم شاخ و کێوانە. تا ئێستا زریانی بەفر ڕووی تێنەکردوون، بەڵام ئەمە شێوە زریانێکە، نزیکە لەوەی ببێتە زریانێکی ڕاستەقینە. مردن لێیان نزیکە. بەڵام نەمردن، لەبەر ئەوەی ئیرادەیان لە ئاسن پتەو تردو لە مردن بەهێز تر بوو. هێزو چالاکی لاوێتییان پێوەیە، لە سنگیاندا دوو دڵی پڕ لە خۆشەویستی گەل و دڵسۆزی تێدایە بۆ حیزبەکەیان.

شەو بە تەواوی تاریکی خۆی بڵاوکردەوە، تروسکایی ڕووناکیەک لە شوێنێکی دووری بنار شاخەوە دەردەکەوت. مەجید ئیشارەتی بۆ هاوڕێکەی کرد:

- ئەو ڕووناکیە دەبینیت؟ ئەوە دێیە، دەبێت ڕوو بکەینە ئەوێ.
- پێدەچێت گوندێک بێت. با خێراکەین بەرەو ئەوێ.

ئەو تروسکاییە بۆ چەند خوولەکێک، دڵخۆشی پێبەخشین. بەڵام هەر بە خێرایی وون بوو، ناچار گەڕانەوە سەر ڕێگا قیرەکەو ماوەیەکی تریش ڕۆیشتن. لە تەنیشت ڕێگاکەوە شێوە خانوویەکیان بینی. بڵێی ئەوە چایخانەیەک بێت لەسەر ئەم ڕێگایە؟ نا، چایخانە نیە، لە زەمانێکدا چایخانە بووە، بەڵام خاوەنەکەی، بەختی باشی نەهێناوەو ساڵانێکە جێیهێشتووە بەبێ ئەوەی بیڕووخێنێت. ئێستا ژوورەکە ڕووخاوە، بە تەواوی داتەپیوە،

بەڵام دیوارەکەی هەر بە پێوەیەو دژی هەموو باران و باوبارقتێک وەستاوەتەوە، لە سووچێکی ژوورە داڕووخاوەکەدا، تەختەکان وەک شێوە سەقفێک، لە سەرێکیانەوە بەسەر دیوارەکەوە ماون و لە سەرێکیشیانەوە کەوتوونەتە سەر زەوی.

- مەجید گووتی: ئای لەم شوێنە نایابەی دەستمان کەوت! تا بەیانی ئێرە جێناهێڵین.
- ئەی دەتوانین ئاگر بکەینەوەو خۆمان گەرم بکەینەوە؟
- بێگومان دەتوانین.
- دارمان لە کوێ بوو لەم تاریکی و بارانەدا؟
- ئەم شوێنە خۆی دارو تەختەیشمان دەداتێ.

بەڕاستی داری پێدان. هەر دوای چەند خولەکێک گڕی ئاگر بەرزبۆوەو هەستی ئەو دوو لاوە گۆڕدراو خۆشی و گیانی نوکتەی بۆ گێڕانەوە. هێشتا هەر دەباری، سەقفە ڕووخاوەکە دڵۆپەی دەکرد. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو شوێنە داڕووخاوە بەو ئاگرە گەشاوەیەوە، بۆ ئەوان وەک ژوورێکی گەورەی نێو یەکێک لە ئوتێلە پلە یەکەکان وایە. ژوورێکی کەشخەی ئوتێلێک زیاتر لە شوێنێکی باش نیە بۆ مانەوەیەکی وەختی. بەڵام ئەم وێرانەیە ژیانیانی لە مەترسیەکی گەورە ڕزگار کرد. دەتوانن هەموو شەوەکە لێرەدا بەسەر ببەن بە تەنیشت ئاگرەکەوە. تەنها مەترسیەک کە هەڕەشە بێت بۆ سەریان، مەترسی هەرەسی پاشماوەی ئەم ژوورە داتەپیوەیە کە بۆتە شوێنی ئەمشەویان. بەڵام بۆچی لەناو هەموو شەوەکانی تردا دەبێت بەتایبەتی ئەمشەو هەرەس بهێنێت!

ساڵەح لە پاڵ ئاگرەکەدا کەمێک حەوابۆوەو پرسی:

- لە پۆلیسەکە ڕزگارمان بوو، بەڵام خەریک بوو لە سەرماو باراندا بمرین.
- هەرچۆن بێت سەفەرێکی جیاوازە.

لەگەڵ خۆرهەڵاتندا، هەردوو لاوەکە هەستان و کەوتنەوە ڕێ. ئەمە ئەگەرچی لەو شەوە درێژەدا هیچ نەنووستن، بەڵام هەردووکیان هەستیان بە چالاکیەکی زۆر دەکرد. بە چەند کیلۆمەترێکیش بەر لەوەی بگەنە شار، ڕێگا قیرەکەیان جێهێشت و ڕێگایەکی لاوەکییان گرتە بەر نەکا تووشی ڕێکەوتی خراپ بین. ئەم دوو میوانە لە لای برادەرێکیان دابەزین بەر لەوەی نانی بەیانی خواردبێت. هەروەک چۆن دایکێکی دڵسۆز دوو کوڕەکەی دەگرێتە باوەش، ئەناوا شاری سلێمانی، هەردووکیانی گرتە باوەش. ئەمە "زیارەت" و "تجارەتە" پێکەوە، سەفەرەکەیان بۆ تەگبیری کاروباری حیزبی و بۆ دوورکەوتنەوەیش بوو لە کەرکوک بۆ چەند ڕۆژێک.

سلێمانی کە سەری لەبەردەم شاخی "گۆیژە" دا دانەواندووە، هەروەک عادەتی خۆی، لە ڕیزی پێشەوەی بەرەی دژدا بووە بەرامبەر بە حوکمی پادشایەتی و نیمچە دەرەبەگایەتی بەکرێگیراودا. بەڵام مام مەحمود، بازرگانێکی بەساڵاچوو، لەگەڵ کوڕەکەی، فەتاح، ڕێکنەدەکەوت لەسەر "ئەم کارە شێتانەیە" ی ئەوو کەسانی تر لە گەنجان پێی هەڵدەسن. مەحمود چەندانجار قسەکەی خۆی دووبارە دەکردەوە:

- کوڕەکەم، من ئەم حکومەتەم خۆش ناوێت! داوایش لە خوا دەکەم لەکۆڵمانی بکاتەوە. بەڵام ئێوە شێتن، گەنجی سەرشێت! دەزانیت شێخ مەحمودی حەفید چەند پیاوێکی گەورەو بەهێز بوو؟ ئەو نەیتوانی ئەم حکومەتە بڕووخێنێت، ئیتر مناڵ و مەزمی وەک ئێوە چۆن دەتوانن بیڕووخێنن؟ پرسەکە پێویستی بە سەرکردەیەکی لە شێخ مەحمودیش بەهێزترو بەتواناتر هەیە .. تێگەیشتیت؟
- بەڵام بابەگیان، حیزبەکەی ئێمە لە هەموو تاک سەرکردەیەک بەهێزترە! ئەمە حیزبی چینی کرێکارو جەماوەرە.
- ئەگەر وابوایە ئەوا ناچار نەدەبوون خۆتان لە پۆلیس بشارنەوە!
- ئەمڕۆ خۆمان دەشارینەوە هەتا سبەینێ بە گەورەترین هێزدوە دەرکەوینەوە.

- رۆژو هەفتەو مانگ تێپەڕی، زیاتر لە ساڵیش تێپەڕی، تۆ هەموو ڕۆژێک هەر ئەم چیرۆکە دەڵێیتەوە.
- باوکەگیان! تۆ پێویستت بە چەند ساڵێکە هەتا خانوویەک دروست بکەیت بۆ خۆت و خێزانت، پێویستت بە چەند ساڵێکە هەتا فلسەفلسەی تیا کۆبکەیتەوە کە بۆ خانوویەک پێویستە، ساڵی دواتر ئەو چەند پوولەو زیاتریشی تێدا خەرج دەکەیت. ئەمە هەر تەنها بۆ خانوویەکی بچکۆلە بۆ خێزانێکی بچووک، کەسیش ڕێگات لێناگرێت دروستی بکەیت ئەگەر پارەت بەدەستەوە بێت. بەڵام ڕووخاندنی سیستمێکی کۆن و دامەزراندنی سیستمێکی نوێ، بە ملیۆنانجار سەختترە. ئەم سیستمەی ئێمە دەمانەوێت بیڕووخێنین، لەوە ناچێت کە تۆ بتەوێت دوکانە بچکۆلەکەت بڕووخێنیت. بابەگیان! ئەم سیستمە نوێنەری چینی کۆمەڵایەتیەو هێزێکی زۆری هەیە بۆ بەرگری کردن.
- ئەمە هەمووی چیرۆکی منالانەیە، هێز نیە لە گەردووندا بتوانێت ئەم حکومەتە بڕووخێنێت، ئەگەر خوا خۆی بڕیاری ڕووخانی نەدات. هەزارانجار پێم گووتیت ئێوە ناتوانن هیچ بکەن ئەگەر خوا خۆی سەرتان نەخات، ئێوە منالن زۆر تێناگەن، ئێمە زۆرمان لەم دونیایە بینیوە کە ئێوە نەتانبینیوە، ئێمە لەوە تیدەگەین کە ئێوە تێیناگەن.

ئێستا کاتی ئەوەیە دایکی فەتاحیش بەشداریی بکات لەم ڕاوێژەدا. ئەو حەزی لە بەشداریی کردن نیە، بەڵام عادەتی وایە لە سەرەتاوە بێدەنگ دەبێت. گەرم بوونی ڕاوێژەکە، لە بێدەنگیەکەی دەهێنێتە دەرەوە. دانیشی پێدادەنێت هیچ لە سیاسەت نازانێت، بەڵام هەمیشە لایەنی کوڕەکەی دەگرێت دژی باوکی فەتاح:

- پیاوە پیرەکە، تۆ حەقت بەسەر ئەم شتانەوە چیە؟ تۆ هەر ڕێگای ماڵەوەو دوکان و دوکان و ماڵەوە دەزانیت، دەزانیت دەرگاو پەنجەری خواروخێچیش دروست

بکەیت، هیچی تر نازانیت. ئەمانە لە قوتابخانە خوێندویانە، کتێبیان خوێندۆتەوە، تۆ پیاوێکی نەخوێندەواریت.

- بێدەنگبە بێ عەقڵ! من هەزارجار لە کوڕەکەت زیاتر دەزانم.
- دەباشە، تۆ هەموو شتێک دەزانیت، تۆ فەیلەسوف و زانایت، بەڵام وازمان لێبێنە با بحەسێینەوە!
- بە کوڕەکەت بڵێ ڕەحمێک بە حاڵمان بکات، کە ئامۆژگاری دەکەم، ئامۆژگاریەکانم لە گوێی ڕاستیەوە دەچێتە ژوورەوەو لە گوێی چەپیەوە دەچێتە دەرەوە!

باوکی فەتاح حیدەت گرتی، ئامادەبوو ڕاوێژەکە بگۆڕێت بە شەڕێکی ڕاستەقینە. ژنەو کوڕەکەی پاشەکشەیان کرد لەبەردەمیدا، میوانیش بابەتەکەیان گۆڕی و کەوتنە پرسیار لە مامەی دارتاش دەربارەی بازاڕی دەرگاو پەنجەرەو ئایا کڕیارەکان کارەکەی دەنرخێنن و بە ویژدانەوە قسە دەکەن! ئەم بابەتە خۆش بوو بۆ مامە، بەخێرایی دەمارەکانی ساردبوونەوەو گێڕایانەوە بۆ سروشتی ئاسایی خۆی. کاتێک مەجید ماڵەکەی بەجێهێشت، مامە بە گەرمیەوە خواحافیزی کردو پێی گووت:

- لێم زویر نەبیت، من خۆشمدەوێن و دوعای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم.
- تۆ مامێکی ئازیزی ئێمەیت و ئێمەیش خۆشمان دەوێیت وەک تۆ چۆن ئێمەت خۆش دەوێت، خواحافیز!

* * *

سەفەرەکە هەفتەیەکی خایاند، پاشان هەردوو لاوەکە گەڕانەوە ژوورەکەیان لە خانووەکەی مام ڕەشید لە کەرکوک. هەریەکەشیان چالاکی حیزبی خۆیانیان دەستپێکردەوە. چەند ڕۆژێکیش ئاسوودەییەکی ڕێژەییان هەبوو. بەڵام ئەمە درێژەی نەکێشا. ڕۆژێک ساڵەح دەرچوو بۆ بینینێکی حیزبی ئاسایی لەگەڵ هاوڕێیەکیدا. ئەم بینینە

نزیکەی دوو کاژێرێکی دەخایاندو پاشان دەگەڕایەوە ماڵەوە. ئەمجارەیان دواکەوت. کاژێرێک و دوان و زیاتر تێپەڕی، ساڵەح شوێنەواری نەبوو، ئەمە بووە جێی دڵەڕاوکێ لەلای هاوڕێکەی. بڵێی ساڵەحیش بووبێتە دەستکەوتێکی باش بۆ دوژمن؟ پێدەچێت کەوتبێتە دەستیان! هاوڕێی سەیەمیشمان لەدەستچوو لەم شارە شوومەدا. هیوایەکی لاواز، زۆر لاواز هەیە بە سەلامەتی بگەڕێتەوە، ڕەنگە دواکەوتنی هۆکارێکی تری هەبێت نەک گرتن. دەبێت پەنا بۆ ئەم تاڵە باریکە ببرێت لە هیوا هەتا سبەینێ و هەڵوێستی پێویست وەرنەگیرێت بۆ خراپترین ئەگەر. بێگومان ووریایی پێویستەو نابێت پشتگوێ بخرێت، ئیتر هەرچەند باوەڕت بە هاوڕێ بەندکراوەکەت هەبێت.

مەجید ئەو شەوەی لە میوانداریی برادەرێکدا بەسەر برد، شەوێکی قورس و درێژو هیلاککەر. سبەینێ بەیانییش، کاتێک دڵنیابوو لە نەگەڕانەوەی هاوڕێکەی بۆ ماڵەوە، بڕیاریدا بگوێزێتەوە بۆ خانوویەکی تر. هەر لە ماوەی دوو کاژێردا، ژوورێکی تری بە مانگانەی ڕوبعە دینارێک بەکرێ گرت لە خانوویەکی قوڕینەدا لە بەری ئەو بەری هەمان ئەو گەڕەکە میللییەدا. بەر لە هەموو شتێک ڕۆنیۆکەی بەشان گواستەوە، پاشان "شتەکانی تر" ی بردە خانوە تازەکەیەوە.

لە هەمان کاتی دیاریکراودا، نامەبەرە تایبەتیەکەی بەغدا، کرێکارە شیوعیەکە، سەبار، نامەو هەواڵی خۆشی هێنا. لەوێ کار بە هەنگاوی گەورە دەڕوات، پێگە میللییەکەی حیزب هەر زیاد دەکات و خەڵکی لە دەوری کۆدەبنەوە، ئەمە سەرباری ئەو لێدانەی بەریکەوت. ڕاستە هێشتا "برینەکە" سارێژ نەبووەو هەر خوێنی لێدەچۆڕێت، بەڵام "برینندارەکە" بە سۆزو خۆشەویستیەکی زۆرەوە نووسێنراوە بە سنگی دایکیەوە –میللەت. هەر بەو هۆیەیشەوە ئەم میحنەتە تێدەپەڕێنێت.

شیوعیە بەندکراوەکان شەوو ڕۆژ هەر باسی حیزب دەکەن، باس لە ڕابووردووی و حازری و ئایندەی، باسی کاروباری گشتی ووڵات. هەر هەلێکیان دەستبکەوێت، سوودی

لێوەردەگرن دەنگی خۆیانی لێوە بگەیەننە حیزب، هونەرمەندانەیش داهێنان دەکەن لە شێوازی شاردنەوەی نامە نهێنیەکانیاندا بۆ حیزب. ئەوە نامەیەکە بە خەتێکی ووردو جوان لەسەر کاغەزی جگەرە نووسراوەو زۆر چاک شاردراوەتەوە، لە خێزانی هاوڕێیەکەوە هێنراوە، بە سەلامەتی گەیشتۆتە بەغداو لەوێیشەوە بۆ کەرکوک.

"هاوڕێ ساڵەح ئێستا تۆ لە کوێیت؟"، مەجید هەر خۆبەخۆ، ئەو ڕستەیەی لەبەر خۆیەوە دەگووتەوە، بەوەیش ئەو هەستەی دەردەبڕی بەرامبەر بە وون بوونی هاوڕێکەی هەیبوو لە دوودڵی و نازارو هیواخواستن. بەڵام تێپەڕبوونی کات لەلایەک و مەشغەڵەتی زۆر لەلایەکی ترەوە، وورده وورده دەیگێڕایەوە بۆ نێو ئەو ژیانە نوێیەی، تاک و تەنها لە خانووە نوێکەیدا .. بێگومانیش بایەخی دەدا بە دروستکردنی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ خاوەن ماڵە نوێکەیدا کە لەگەڵ خێزانەکەیدا لە یەکێک لە سێ ژوورەکەیدا نیشەتەجێ بوون.

خاوەن خانوو دەیەویست ژووره چۆڵەکەی تریش بدات بە کرێ بە هەرکەس دەیەوێت. ئەمە شتێکە دەبێت بیری لێبکرێتەوە هەتا گرفت بۆ مەجید دروست نەکات. ڕەنگە وا باشتر بێت کرێچیەکی تازە نەیەتە ئێرە. کەواتە با مەجید کرێی هەردوو ژوورەکە بدات، بۆ هەردووکیان مانگانە نیو دیار، ئەمەیش بە بیانووی ئەوەی هاوڕێیەکی دەگوازێتەوە بۆ ئەم شارە، ئەویش دەیەوێت ئەم ژوورەی بۆ ئامادە بکات. خاوەن ماڵ، عەبدوڵلا، ئەم پێشنیارەی مەجیدی بەلاوە باش بوو، یەکسەر ڕازی بوو.

بەخێرایی پەیوەندی دراوسێیەتی و دۆستایەتی نێوان مەجید لەگەڵ عەبدوڵلاو ژنەکەی و دوو مناڵەکەی بەهێز بوو کە لە بنەڕەتدا خێزانێکی جووتیاری بوو، چەند ساڵێکە وەک هەزاران خێزانی جووتیاری تر کە ڕێچکەیان بەستووە بەرەو شارەکان و لە دەست زوڵم و زۆری دەرەبەگ و مەینەتی و برسێتی هەڵاتوون و هاتوونەتە شار. بەخێوکەری خێزانەکە، عەبدوڵلا، پیاوێکی ئەسمەری چوارگۆشە، قژێکی پڕ، دوو چاوی ڕەش. ئەو لە دەیەی

چوارهەمی تەمەنیدایەو بە سەختییش ئەو ماوەیەی تێپەڕاندووە، لە نێوان ڕەنجکێشانی لادێ و نەبوونیدا، لە نێوان چوار دیوای بەندیخانەو نارەحەتیەکانی زینداندا، لە نێوان کۆڵانەکانی ئەو گەڕەکە میللییانەدا لە کەرکوک کە پڕن لە زەحمەتکێشان. ئەو دوای دەرچوونی لە زیندان لە کەرکوک جێگیر بووە، ئەمەیش بۆ خۆبەدوورگرتن لە مەترسی تۆڵەسەندنەوە بە دەستی دوژمنەکانی لە گوندەکەیانەوە، جووتیارێکی نەخوێندەواری سادە، هیچ پیشەیەکی نەدەزانی، سەرکەوتوویش نەبوو بۆ وەدەستخستنی کارێک لە دامودەزگایەکی حکومی یان ئەهلیدا. بەڵام دەیتوانی هێزی ماسولکەکانی وەک کاڵایەک بخاتە بازاڕەوە بۆ هەرکەس کە پێویستی بە کرێکارێکی بینا هەبوایە. ئەم "پیشەیە" پێویستی بە هیچ شارەزاییەک نەبوو، بە شێوەیەکی پچڕپچڕیش، چەند درهەمێکی لێدەست دەکەوت. بەڵام مەبلەغی نیو دینار کە مانگانە وەریدەگرێت، سەرچاوەیەکی بژێویە بۆ خێزانەکەی! ئەو مەبلەغە، بەسە بۆ پێداویستی شەکرو چاو چەند پێویستیەکی بچووکی تریش!

منداڵەکان، عەزیزو کەریم لە قوتابخانەن، لە پۆلی یەک و دوو. ئەوانیش لەگەڵ مەجید ڕێکبوون و وایان لێهاتبوو مەجید هەر کارێکی پێبسپاردنایە دەیانکرد، ڕۆژانەیش زۆر چاوەڕێی ئەو خولەکانە بوون کە بە یاری یان باسی چیرۆک و داستان دەیبردە سەر لەگەڵیاندا. بەڵام دایکیان، حەلیمە، ئەو ژنە ساویلکە باشەی لە خۆی ڕازی بوو، بەختیار بوو بە ژیانە خێزانیەکەی سەرباری هەژاری و نەبوونی، ئەویش ڕێزی لە کرێچیە تازەکەیان دەگرت، بەڵام لە ڕۆژانی یەکەمەوە زۆر حەزی بە بینینی نەبوو. هەر کە دەیبینی، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسک، چونکە چاوەکانی مەجید چاوەکانی برا گەنجەکەیی یاد دەخستەوە کە بەر لە دوو ساڵ مردن ڕفاندی. وەک حەلیمە دەیگووت، لاوێکی جوانی باشی ئازا، دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی و سۆز بۆ کەسوکارەکەی و بۆ هەموو کەسێکی باشیش.

ڕۆژ بەڕۆژ دۆستایەتی مەجیدو ئەم خێزانە هەر پتەوتر دەبوو. حەلیمە لەنێو دراوسێکاندا بڵاوی دەکاتەوە کە ئەم لاوەی لە خانوەکەیاندایە، نزیکترین خزمێتی و هەروەک تاکێکی خێزانەکە سەیری دەکات. هەر لەوەیشەوە ئەو لاوە بە دەوری خۆی، کەوتە چاودێریی ڕەفتاری عەبدوڵڵاو پەیوەندیەکانی، ئەمەیش بۆ ئەوەی تێبگات ئایا دەتوانێت باوەڕی تەواوی بداتێ یاننا. پێدەچێت عەبدوڵڵایش لەلای خۆیەوە، چاودێریی ڕەفتاری ئەم کەسەی کردبێت. هەردوولا باوەڕیان بە یەک هێنابوو.

"کەواتە ئایا دەتوانم ڕاستیەکانی خۆم لای ئەم پیاوە ئاشکرا بکەم کە من شیوعیم، ڕانراوم لە لایەن دەسەڵاتە حکومیەکانەوە، خۆم شاردۆتەوەو لەوانەیە تووشی مەترسییش ببم - ئەمە بیرکردنەوەی مەجید بوو". ئەمە پرسێک نیە بە کاژێرێک و دوان یەکلا بکرێتەوە، بەتایبەت شتێکی پەلەیش نیە. دەبێت لە ڕۆژانی داهاتوودا، لە هەموو ڕوویەکەوە لێی ووردببێتەوە. دواجار ڕای مەجید جێگیر بوو، بە تەنها عەبدوڵڵای بینی هەتا باسی شتێکی گرنگی بۆ بکات:

- مەجید گووتی: چەند هەفتەیەکم لەگەڵدا بەسەر بردوون، لەو ماوەیەشدا هەلی ئەوەمان دەستکەوتووە یەکتر بناسین و باوەڕ بدەینە یەکتر.
- ئێمە باوەڕمان پێتە وەک چۆن باوەڕمان بە برایەکمانە، بگرە زیاتر لەوەیش – عەبدوڵڵا وەڵامی دایەوە.
- ئەی چیت لە بارەی منەوە زانیوە وا ئەوەندە باوەڕت پێمە؟
- دەزانم مرۆڤێکی چاکیت لە ڕەفتارو ڕەوشتتدا، دۆستێکی بە وەفایشی بۆ هەرکەس دۆستایەتیت بکات.
- ئەی هیچ شتێکی تر لە بارەی منەوە دەزانیت؟
- گووتم زۆر باش دەتناسم و باوەڕیشم پێتە وەک چۆن باوەڕم بە برای دایکی و باوکیی خۆم هەیە.
- ئەی چی دەڵێیت ئەگەر من بوومە هۆی ڕاکێشانی مەترسی و نارەحەتی بۆت؟

- جا بۆچی دەبێتە هۆی ناڕەحەتی بۆم؟ هیچ شتێکی خراپت کردووە هەتا ببێتە هۆی ناڕەحەتی بۆ من؟
- لەوانەیە ناڕەحەتیت بۆ بهێنم، بەڵام لەبەر ڕق و خراپە نا، یان بمەوێت زیانت پێبگەیەنم. من هیچم ناوێت چاکەی تۆ نەبێت، بەڵام ڕەنگە بارودۆخەکەم ناڕەحەتیت بۆ بهێنێت.
- باوەڕ ناکەم، تۆ هیچ ناڕەحەتیەک بۆ ئێمە ناهێنیت.
- ئەگەر پۆلیس بزانێت من لە ماڵەکەی تۆدام، ئەمە ناڕەحەتیت بۆ دەهێنێت.
- جا بۆچی؟
- چونکە پۆلیس بەدواما دەگەڕێت، خۆم لە دەسەڵات شاردۆتەوە.
- ئێستا هەموو شتێک تێگەیشتم، تێگەیشتم، هەموو شتێک تێگەیشتم.
- چی تێگەیشتیت؟
- تێگەیشتم پۆلیس بەدواتەوەیە، لەدوات دەگەڕێن و دەتگرن ئەگەر بتدۆزنەوە.
- بەڵام بۆچی ڕاوم دەنێن و دەیانەوێت بمگرن؟
- نازانم .. ڕەنگە سەربازێک بیت و لە خزمەت هەڵاتبێتیت.
- نەخێر، سەربازی ڕاکردوو نیم.
- کەواتە شتێک لە دەست قەوماوە لەگەڵ هەندێ کەسدا .. مەبەستم ئەوەیە شتێکی خراپ لێی ڕوودەویت و تۆیش ناچاربوویت بەرگری لە خۆت بکەیت.
- مەبەستت ئەوەیە یەکێکم کوشتبێت؟
- بەڵێ، مەبەستم ئەوەیە.
- نەخێر، کەسم نەکوشتووە، لەگەڵ کەسیش نەکەوتوومەتە ناکۆکی تاککەسی و خێزانی.
- ئەی لە قەرزێک ڕاتکردووە کەڵەکەبووە بەسەرتا؟
- نەخێر ..

- نازانم و ناتوانم ئەمە هەڵبهێنم.
- پۆلیس ڕاوم دەنێت لەبەر ئەوەی شیوعیم.
- ئاه! تۆ شیوعیت! جا با شیوعی بیت. یەکێک لە خزمەکانیشم شیوعین.
- خزمە شیوعیەکەت کامەیە؟ چی دەڵێت؟
- جەمال ڕۆژبەیانیە.
- ئەی شیوعیەکانت خۆش دەوێت یان ڕقت لێیانە؟
- جا بۆ ڕقم لێیان بێت؟ ئەو خزمەم کە هەر ئێستا ناوم هێنا، شیوعیە.
- حکومەت ڕقی لە شیوعیەتەو دژێتی.
- با حکومەت بڕوات بۆ لای شەیتان .. من ڕقم لەم حکومەتەیە .. خەڵکی هەموو ڕقیان لێیەتی و داوای خێری بۆ ناکەن.
- ئێستا زانیت من شیوعیەکی ڕاکردووم. لەبەر ئەوە ڕەنگە نارەحەتیت بۆ بهێنم ئەگەر لێرە بمێنمەوەو لای پۆلیس ئاشکرا ببم. ئایا ڕازیت لێرە بمێنمەوە؟
- من ڕازیم و ئامادە هەموو دەرئەنجامێکیش بخەمە سەرشانم.
- یەکەم شتێک کە داوات لێبکەم ئەوەیە پەیمانم بدەیتێ ئەم نهێنیە بپارێزیت لێم ئاشکرا کردیت، وە لەلای خۆت بمپارێزیت، وە پێشم بڵێیت ماڵەکەت جێبهێڵم هەرکات حەزت کرد، لە هەردوو حاڵەکەدا من هەر سوپاست دەکەم.
- تۆ لە ئەماندایت، ئەم ماڵەیش ماڵی خۆتە .. لەگەڵماندا بژی بەبێ دڵەڕاوکێ، ئێمە دەتپارێزین، هەروەک چۆن برا برای خۆی دەپارێزێت.
- تکا دەکەم ئەم نهێنیە بۆ کەس مەدرکێنە کە بۆم ئاشکرا کردیت.
- سوێند بە شەرەفم ئەم نهێنیە ئاشکرا ناکەم.

باسەکە لە نێوان ئەو دوو پیاوەدا کۆتایی هات. ڕۆژی دوایی، دەلیلەکان وایان نیشاندەدا عەبدوڵلا نهێنی ئەو لاوەی لە لای ژنەکەی دەرخستبێت کە لە خانووەکەیاندا دەژی. ئایا دەیتوانی ئەم نهێنیە نەدرکێنێت لای ئەو؟ نەخێر، توانای ئەمە نیە. ئەو پیاوە سنگی

ئەوەندە فراوان نەبوو جێی ئەم نهێنیەی تێدا ببێتەوەو تەنانەت لەلای هاوسەری ژیانیشی باسی نەکات.

- ئەرێ دایکی عەزیزت لەو قسانە ئاگادار کردووە کە باسمان کرد؟ –مەجید لە عەبدوڵلای برادەری پرسی.
- ئەو ئەمینیشەو نهێنی هەڵگریشە.
- ئەی ئەگەر ئەویش بە دەوری خۆی ژنێکی تر یان خەڵکی تری ئاگادار کرد؟
- جا چۆن ئەوە دەکات و ئەو شتە بڵاودەکاتەوە ئەگەر نهێنی هەرکس بێت؟ زمانی دەبڕم هەرچی شتێک لەو بارەیەوە ڕووبدات. دڵنیابە لەوە.

لە ڕاستیدا حەلیمە ئەو نهێنیەی ئاشکرا نەدەکرد هەتا مەجید تووشی ترس و دڵەڕاوکێ نەکات. ئەو ژنە پارچەیەک چاکە بوو، ئەمە جگە لەوەی ئەو لاوە، وەک تاکێکی ئەو خێزانەی لێهاتبوو. ئەمەیش هەمیشە جێی دڵخۆشی و دڵنیاییە. بەڵام لەگەڵ هەموو خۆشیەکدا ناخۆشیەکیش هەیە.

## دابەشبوونێکی تر

ئەمجارە ناخۆشیەکە لە سلێمانیەوە هات. لە گیرفانی هاوڕێ (دارا) و زمانە لووسەکەیەوە هات.

- هاوڕێ دارا، باسی بارودۆخی لای خۆتانمان بۆ بکە.
- بارودۆخی حیزب لەوێ زۆر سەخت و ئاڵۆزە، بەتایبەتی دوای دروستبوونی بلۆکێکی هەلپەرستی دابەشکاری نوێ بە ناوی "الاتحاد".
- ئەی بۆچی "بەتایبەتی دوای دروستبوونی بلۆکێکی دابەشکاری نوێ"؟

- چونکە ئەم بلۆکە زۆر لە هاوڕێ و دۆستانمانی ڕاکێشاوەو خۆی لەسەر حیسابی ئەوانی تر بەهێز کردووە.
- ئەی چۆن توانیویەتی بەو خێراییەو بەو ئاسانیە لایەنگرانی حیزبمان ڕابکێشێت بەلای خۆیدا؟

هاوڕێ دارا کەمێک دوودڵ ڕاما لە وەڵامی ئەم پرسیارەی دوایی .. لەوە دەچوو بەدوای وڵامێکدا بگەڕێت ئەو دیاردەیەی پێ شیبکاتەوە. پاشان گووتی:

- دامەزرێنەری ئەو بلۆکە نوێیە نەجیبە، هاوڕێیانی شارەکە دەناسێت و خۆی خەڵکی ئەوێیەو ساڵانێکیش پراکتیزەی چالاکی تێدا کردووە.

"مەجید لەگەڵ خۆیدا بیری دەکردەوە: نەجیب شیوعیەکی چاک، دڵسۆز، سوور لەسەر کاری خۆی. جێگای ئەو نێو ڕیزەکانی حیزبە نەک بلۆکێکی ئینشقاق .. بۆیە دەبێت نامەیەکی بۆ بنێرین و ئاگاداری بکەین ئەم ڕێڕەوە خوارە ڕاست بکاتەوەو بگەڕێتەوە نێو ڕیزی هاوڕێکانی و .. هتد".

- مەجید گووتی: جێی داخە نەجیب ئەم هەڵوێستەی هەبێت .. ئەمە جێی سەرسوورمانە.

مەجید بەم شێوەیە بیری لە شتەکە دەکردەوە. بە کردەوەیش دەستپێشخەری کرد لە نووسینی نامەیەکداو ناردی بۆ ڕێکخەرەکەی جارانی، نەجیب، لەوێشدا ڕای خۆی بە باشی دەربڕی بوو لەسەر ئەوو هەوڵی گێڕانەوەیشی، دژی ئەو ڕێبازە دابەشکارییە. لە نامەکەیشیدا، ڕووی کردۆتە ڕێکخەرەکەی ڕابووردووی و ئەوەی یاد خستبۆوە: هاوڕێی ئازیز، من وەک هاوڕێیەکی دڵسۆز تۆم ناسیوە! زۆر باوەڕمان بە دڵسۆزیتە، وە وا دەبینین جێگای تۆ نێو هاوڕێ شیوعیەکانتە .. داوات لێدەکەین هەوڵەکانی خۆت لە پێناوی

خزمەتی حیزبدا بەکاربهێنیت نەک بۆ زیان گەیاندن بە حیزب .. داوات لێدەکەین بگەڕێیتەوەو ڕۆڵی خۆت وەک کادرێکی حیزبی پێشکەوتوو ببینیت.

نەجیب لە جیهانێکی تردا دەژیاو جۆرێکی تر بیری دەکردەوە. وازی لە ڕێکخراوەکە هێنا. ئەو لەکاتی گرتنیدا لەگەڵ حیزب بوو، دوای بەردانی لە بەندیخانە، لەگەڵ خۆیشیدا دابەش بووبوو. وادیار بوو لە هۆکاری ڕاستەقینەی جیابوونەوەکەیشی تێنەگەیشتبوو، ئەمە دوای گێڕانەوەی ئازادییش بۆی .. تێنەدەگەیشت لە گەشەی ئەو بارودۆخەی بووبووە هۆی ئەو دابەش بوونە .. بۆیە ئەمەیش و ئەوەیشی دەکرد، وایشی دادەنا خۆی تەنها شیکەرەوەی بارودۆخەکەیە، ئاراکانی و حوکمە بنەبڕەکانیشی لەسەر حەقە.

- ئەوان دان بەوەدا دەنێن ئێمە هاوڕێی بەلشەفیستی دڵسۆزین –نەجیب بە یەکێک لە کادرەکانی بلۆکەکەی خۆیانی گووت، بەڵام ئێمە ئەوان بە بەلشەفیست نازانین، بەڵکو بە هەلپەرستیان دەزانین.
- ڕاستە ئەوان بە بەلشەفیستمان دادەنێن، بۆیە لەسەریانە دوامان بکەون و لەسەر ئاگاداریەکانی ئێمە کار بکەن.
- ئێمە دەمانەوێت ئەوان ڕێکخراوەکەی خۆیان هەڵبوەشێننەوەو یەک یەک داوای گەڕانەوە پێشکەش بکەن .. ئینجا بریار دەدەین کامیان قبوڵ دەکەین و کامیان ڕەتدەکەینەوە. قبوڵ کردنەوەی ئەو کەسانە ڕەتدەکەینەوە کە بوونەتە هۆی دابەش بوون لە ڕێکخراوەکەدا.
- ئێمە نوێنەری حیزبی شیوعین، سەرکەووتویش دەبین بەسەر هەموو بلۆکە دابەشکارەکاندا.
- ئەرکمان پاکتاوکردنی بلۆکەکانە نەک شیوعیەکان .. هەر لەو بۆچوونەیشەوە، ئەو دروشمەمان بەرز کردۆتەوە کە بریتیە لە پیرۆزیی یەکێتی هەموو شیوعیەکان لە یەک ڕێکخراودا.

نەجیب وای بۆدەچوو بەرپرسی ئەو دابەش بوونە لە کاتی بوونی ئەودا لە زیندان، دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسانی هەردوولا .. ئەگەر ئەو، نەجیب، بەند نەکرایە، هیچ جیابوونەوەیەک رووی نەدەدا، لەبەر ئەوە، ئەو دوای ئەوەی بەربووە، دەتوانێت کۆتایی بەو دابەش بوونە بهێنێت و یەکێتی پتەو بکاتەوە لە رێگای گردکردنەوەی شیوعیەکانەوە لە دەوری خۆی و پەرگیرخستنی مەجیدو مسعودو هاوشێوەکانیان.

ئەژمارکردنەکانی هەڵە دەرچوون، لەسەر بۆچوونی هەڵە دەربارەی واقیعی مەوزوعی و موبالەغە کردن بە دەوری تاککەسی خۆیەوە، یان کە خۆی دەتوانێت هەستێت پێی، بونیاد نرابوون. ئەو توانی بە هۆی نفوزو سومعەیەوە لە نێوان شیوعیەکانی شارەکەیدا، زۆرینەی هاورێیانی حیزب لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. بەڵام ئەمە بۆشاییەکەی پڕ نەکردەوە، بەڵکو خراپتری کردو دابەش بوونەکەی قووڵتر کردەوە. دەیەویست هیچ رێکخراوێک نەبێت بەناوی شیوعیەتەوە، بەڵام دەرئەنجام بووە سێ رێکخراو، بە دەربڕینێکی ووردتر، دوو بلۆکی دابەشکاریی دروست بوو دژی حیزبی شیوعی لە بری یەک بلۆک!

ئەمجارە ئەو پۆستانەی حیزب کە لە سلێمانیەوە دەهاتن، پڕ بوون لە شتی ناخۆش: سەرهەڵدانی بلۆکی دابەشکاریی نوێ و سەرکەوتنیان لە خەباتدا دژی لایەنەکانی تر. لاوازیە دیارەکانی کادرانی حیزب، کاریگەریەکی جیددیی لەسەر باری رێکخراوەکە جێهێشتبوو لەو رووەوە کە کامیان نوێنەری بزووتنەوەی راستەقینەی شیوعیەتن لەوێ. جگە لەمە، هاورێ سالەح، کە پێشتر وادانرابوو لە هاورێ گیراوەکانە، لەناو ئەو بلۆکە دابەشکاریە نوێیەدا کاری دەکرد! ئەمە جێگای دڵخۆشیە سەلامەتەو نەگیراوە، بەڵام پەیوەندیی ئەو بەو بلۆکە دابەشکاریەوە، جێگای هیچ دڵخۆشیەک نەبوو، بەڵکو جێی داڵگرانی بوو.

- تۆ دڵنیایت لەوەی پەیوەندیی بەوانەوەیە کاریان لەگەڵ دەکات-مەجید پرسی، یان هەر تەنها دەنگوباسە؟

- نەخێر، هەر دەنگوباس نیە –دارا لە وەڵامدا گووتی، هەواڵەکە بە تەواوی دروستە.

هەواڵەکە تەواو دروست بوو، ساڵەح لە ڕیزی ئەو ڕێکخراوەدا کاری دەکرد. بەڵام هەر بەزوویی دەکەوێتە چەند ناکۆکیەکەوە لەگەڵیاندا، ئەوەیش دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی، یان دوورخستنەوەی.

* * *

پەیوەندیی دۆستایەتی نێوان مەجید لەگەڵ عەبدوڵلاو هەموو خێزانەکە هەر گەشەی دەکردو بەهێزتر دەبوو. لەو کاتەوە کە مەجید پێناسەی سیاسی خۆی ئاشکرا کردووە کە شیوعیە، ئیتر پەیوەندیە دۆستایەتیەکە گەشەی دەکرد بۆ پەیوەندیی سیاسی و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی فیکری و سیاسی برادەرەکەی. شتەکەیش باش دەچووە پێشەوە لەلای ئەو پیاوە زەحمەتکێشە، عەبدوڵلا، وە بووە یاریدەدەرێکی باشی حیزبی شیوعی نەک هەر تەنها دۆستێکی مەجید. وە ئەگەر پێداگریی نەبوایە لەسەر بە ئەندام بوون لە حیزبدا، عەبدوڵلا هەر زوو دەپاڵێورا بۆ ئەندامێتی حیزب. ئەو وەک هەموو شیوعیەکی تر، لە خزمەت کردنی حیزبدا بوو، ئەگەرچی بە فەرمی هەروەک ناحیزبیەک مابۆوە. ئەو خۆیشی و ژنەکەیشی، دوو پاسەوانی وورِیا بوون پارێزگاریی ئەو پیاوە شیوعیەیان دەکرد کە لە ماڵەکەیاندایە.

ڕۆژێک دایکی عەزیز خۆی کرد بە ماڵا، پاشان خۆی کرد بە ژوورکەی مەجیددا، دڵەڕاوکێیەکی پێوە دیار بوو، هەر ڕاستەوخۆ وەک کەسێک کە هەواڵێکی مەترسیداری پێ بێت ڕایگەیاند:

- دەبێت خۆت و سەبار هەر ئێستا لە ماڵ دەرچن بۆ ماوەی چەند کاژێرێک، دەترسم لەوەی شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕووبدات.

- چی ڕوویداوە؟
- دراوسێکەمان دەڵێت پۆلیس دێت بۆ پشکنینی هەموو ماڵەکانی ئەم گەڕەکە، ئەمەیش بەهۆی ئەوەوە کە خەبەر دراوە تووتنی قاچاخ لە چەند ماڵێکدا هەیە.
- دایکی عەزیز! جا خۆ ئێمە قاچاخچی تووتن نین، لەم ماڵەیشدا تووتن هەر نیە، بۆیە پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکات. ئەوا لە ماڵیش دەردەچین.
- ئەترسم بێن بۆ تووتن بگەڕێن، بەڵام ئێوە بدۆزنەوەو کارەساتێک بخووڵقێت.

دایکی عەزیز حەق بوو بترسێت، هیچ دوور نیە گەڕان بەدوای تووتنی قاچاخدا، ببێتە هۆی دۆزینەوەی خەڵکی تر کە لە عەدالەت هەڵاتوون!

ڕۆژی دواتر ژنێکی گەنج هاتە ماڵەکەوە، لەو کاتەدا مەجیدو سەبار لە ژوورەکەیاندا بوون، قسەی لەگەڵ دایکی عزیز دامەزراند. دوو لاوەکە نەیانزانی چی لە نێوان ئەو دوو ژنەدا هاتوو چوو، بەڵام دەلیلەکان لە شتێکی "مەترسیدار" نزیک بوون! دایکی عەزیز خۆی کرد بە ژوورەکەی ئەو دوو لاوەدا، بە توونێکی نەشڵەژاوەوە گووتی:

- ئەو ژنە دراوسێمانە، دەیەوێت بتانبینێت.
- بۆچی دەیەوێت بمانبینێت؟ چی شتێکی تێدایە؟
- ئەم سەرلەبەیانیە، پیاوێکی "حەماڵ" هاتۆتە ماڵەکەیان و گووتوویەتی لە مێردەکەیەوە، باوکی فەرەج، نێردراوە –ئەویش خاوەن دوکانە لە بازاڕو پەیوەندیی جیاوازجیاوازی هەیە بە چەند دێهاتیەکەوە- بۆ هێنانی ئەو ڕۆنەی لە ماڵەکەدایە بۆ دوکانەکە.
- ئەی دوای ئەوە چی ڕوویداوە؟
- ژنەکە ڕۆنەکەی داوە پێی و بردوویەتی بۆ شوێنێکی نادیار نەک بۆ دوکان.
- ئەی چۆن دەزانیت ئەو نەیبردووە بۆ دوکان؟

- مێردەکەی گەڕاوەتەوە بۆماڵەوە بۆ نان خواردنی نیوەڕۆو گووتوویەتی کە ئەو هیچ کەسێکی نەناردووە بۆ داوای ڕۆن و ڕۆنیشی پێنەگەیشتووە.
- کەواتە هەموو شتێک ئاشکرایە! ڕۆنەکە چەندێک بووە؟
- دوو کیسەی پێستە بوون پڕ بوون لە ڕۆن.
- مەجید پرسی: باشە، ئەی ئەو ژنە بۆچی دەیەوێت ئێمە ببینێت؟ -ژنە دراوسێ لە حەوشەکەدا وەستاوەو چاوەڕێ دەکات.
- شکی لە ئێوەیەو دەپرسێت ئەو دوو گەنجە کێن لە ماڵی ئێوە؟ لەوانەیە "دز" بن.
- ئەی ئایا ئەو بەدەموچاو ئەو کەسە دەناسێتەوە کە هاتووە ڕۆنەکەی لێوەرگرتووە؟
- دەڵێت باش دەموچاوی دەناسێتەوەو هەڵە ناکات.
- دەی کەواتە با بچینە دەرەوە بۆ لای —بەدەم ئەم قسەیەوە، هەردوو لاوەکە لەگەڵ حەلیمەدا چوونە دەرەوە تا ئەو ژنە ببین کە لە چاوەڕوانیدا بوو. مەجید سڵاوی لێکردو ڕووی تێکرد:
- ها خوشکە، ئەوە ئێمە لەبەردەمتاین، باش سەیرمان بکە، ئێمە لۆمەت ناکەین لەسەر ئەمە، بەڵکو حەقت پێدەدەین، چونکە خەڵەتێنراویت.
- ژنە بە خێرایی و بە ووردی پیایا هەڵڕوانین، پاشان بە دەنگێکی گڕو توونێکی بنەبڕ ڕایگەیاند:
- ئێمە ئەمڕۆ زیندووین و سبەینێ مردوو، نابێت درۆ بۆ بێخەتا هەڵببەستین. ئەشهەدوبیللا من هەرگیز ئەم دوو پیاوەم نەبینیوە، ئەوەی هات و ڕۆنەکەی دزی، لە هیچ شتێکیدا لەمان نەدەچوو.
- دایکی عزیز بە توونێکی پڕ لە خۆشی و سەربەرزیەوە وەڵامی دایەوە: پێم نەگووتیت، ئەمانە لەم کارانە دوورن، باشت کرد داوات کرد بیانبینیت هەتا شک و گومانت نەمێنێت.

باوکی عزیز لەم پشکنین و لێپرسینەدا لە ماڵ نەبوو. دوای گەڕانەوەی، هەر کە ئەمەی لەبارەی ژنە دراوسێوە بیست، دەمارەکانی کرژ بوون، وەک چەخماخە کەوتە هەڕەشە لەوانەی کە دەوێرن ئەم دوو لاوە تاوانبار بکەن بە دزی کە لە ماڵەکەی ئەودان.

- ئەوانە هیچ و پووچ و نزمن، ئەوانەی پاگەندەی ئەوە دەکەن لە ماڵی مندا دز هەیە.
- مەجید گووتی: باوکی عەزیز لەسەرخۆ! هیچ شتێک ڕووینەداوە کە تۆی پێ شکا بێت.
- ئەمە گەورەترین شکاندنە بۆ من کە ئەو ناکەس بەچەیە پاگەندەی ئەوە بکات من دزم لە ماڵەکەمدا حەشارداوە. ئەوەی لەم خانووەدا دەژی، پاک و خاوێنە وەک فریشتە.
- باوکی عەزیز! ئەم دەنگەدەنگە دەبێتە هۆی کێشە بۆمان و لەوانەیشە ببێتە مەترسی بۆ سەرمان.

عەبدوڵلا بەخۆیدا هاتەوەو یەکسەر بێ دەنگ بوو.

## گەڕانەوە بۆ پایتەخت

یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێ، ساڵی ١٩٥٠، هەروەک هەموو ڕۆژەکانی مانگی ڕابووردوو تێپەڕی. موسڵمانەکانی عێراق، ئەو ڕۆژە بە جەژن دانانێن و بۆنەیەکیش نیە بایەخی پێبدەن. ئەوەی ڕوودەدات هەر ئەوەیە بەرواری سەر نامەو نووسراوە فەرمیەکانی فەرمانگە حکومیەکان دەگۆڕدرێن، بۆ نموونە ژمارەی ١٩٥٠ دەنووسرێت لە بری ١٩٤٩. بەڵام ڕۆشنبیرانی کریستیانیتی لە بەغدا، لە سەری ساڵدا جەژن دەگێڕن وەک سەری ساڵی زاینی، یان بە بەستنەوەیەوە بە جەژنی لە دایک بوونی مەسیحەوە.

کەسێکی تر لە خانووەکەی عەبدوڵلادا جێگیر نەبوو لە کەرکوک هەتا ساڵێک ڕۆیشت و ساڵێکی تر هات. بەڵام مەجید شتێکی لەبارەی ڕووداوەکانی ساڵی ڕابووردوودوە لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندبۆوە، ئەمە دوای چەند ڕۆژێک بوو لە تێپەڕبوونی ساڵی نوێ. ئەوکاتە ساڵێک تێپەڕ بووبوو بەسەر هەوڵە شکسخواردووەکانی نوێکردنەوەی ڕاپەڕینی کانووندا. ئای لەو ساڵە سەختە! حیزب هەموو ئەو سەختیانەی تێپەڕاند، برینەکانی دەستی کرد بە سارێژ بوون.

"ئایا کاتی گەڕانەوە نەهاتووە بۆ بەغدا دوای ئەم ساڵە سەختە؟ بێگومان سەختیەکان کۆتاییان نەهاتووە، بەڵکو بە مانایەک هەر کۆتایی نایەن، بەڵام نارەحەتیەکانی ئەمڕۆ جیاوازن لە دوێنێ. دەبێت بگەڕێنەوە بەغدا. هیچ بیانوویەک نەماوە بۆ نەگەڕانەوە".

گرنگترین شتێک کە پێویست بێت دابین بکرێت لە بەغدا، جێگایەکی ئەمینە بۆ نیشتەجێ بوونی مەجیدو چەند کادرێکی حیزبی. پێدەچێت ئەرکی پەیدا کردنی شوێنێکی لەو جۆرەیش، بکەوێتە ئەستۆی مەجید خۆی، بەڵام بە یارمەتی چەند هاوڕێیەک. کاتی خۆی دەرچوون لە بەغدا پرۆسەیەکی ئاسان و سادە بوو. دەبێت گەڕانەوەیش ئاسان و سادە بێت.

ئەم بیرە لای مەجید گەڵاڵە بوو. کاتی سەفەر نزیک بۆوە. ئۆتۆمۆبێلێکی پاسی تەختەی کۆن لە کەرکوکەوە کەوتە ڕێ بەرەو هەولێر، مەجیدو سەبارو عەبدوڵلایش لە نێو نەفەرەکانیدا بوون. ئەوانیش لەڕێی هەولێرو موسڵەوە بۆ بەغدا دەڕۆن. مەجید باوەڕی وابوو ئەو ڕێگایە سەلامەت ترو ئەمین ترە، ئەگەرچی دوور ترو نارەحەت ترە لە ڕێگای کەرکوک-بەغدا. ئۆتۆمۆبێلەکە لە هەولێر وەستا، ئەو شارەی دەتتوانی پێی بڵێیت شارێکی بچووک یان "دێیەکی گەورە". ئەم سێ گەشتیارە لە ئۆتۆمۆبێلێکی تردا جێگایان دەستکەوت بەرەو موسڵ. لە هەمان ڕۆژدا، قۆناغی دووهەمی سەفەرەکەیان بە سەرکەوتوویی بڕی.

- ئەمشەو لە کوێ بخەوین، مەبەستم ئەوەیە لە ئوتێل؟

- لە یەکێک لە ئوتێلە هەرزانەکاندا. ئێمە ئێستا لە شاری موسڵین، دەبێت بە ڕەزیلی پارە خەرج بکەین هەروەک خەڵکی ئەم شارە خۆی.

سێ گەشتیارەکە لە شێوە ئوتێلێکی میللییدا دابەزین کە پێیان دەگووت "ام الربیعین". ڕۆژی دوایی مەجید بینینێکی لەگەڵ سکرتێری ڕێکخراوی پارێزگاکە ڕێکخست. ئەم بینینە، دوای ماوەیەک لە نامە گۆڕینەوە، یەکەم بینینی ڕاستەوخۆ بوو لە نێوان ئەو دوو هاوڕێیەدا. بینینەکە لە هەوایەکی کراوەدا بوو نزیک بە دەرەوەی شار لە بەشی خۆرهەڵاتی شارەکە، هەردوو هاوڕێکە نزیکەی سێ کاژێر پیاسەیان کردو باسیان لە جۆرەها بابەتی ڕێکخراوەیی و سیاسی کرد، ئیتر ئەمە بەبێ لیستی کار یان نووسینی کۆبوونەوە.

هاوڕێ تاریق، سکرتێری ڕێکخراوە حیزبیەکە، لاوێکی لەسەرخۆی جیددیی، باڵا مامناوەندی، زیرەکیەکی مامناوەندی، ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە پارێزگاریی ڕێکخراوی حیزب و بەردەوام بوونی چالاکی سیاسی ئەو ڕێکخراوەدا. ئەو لێدانانەی لە ١٩٤٩ دا بەر ئەو ڕێکخراوە کەوتبوو، کەمتر بوو لەوەی بەر ڕێکخراوە حیزبیەکانی تر کەوتبوو. لەوێ لیژنەیەکی حیزبی نەبوو بۆ سەرکردایەتی کارەکان، تاریق بە تەنها هەر خۆی بەرپرسی کار بوو.

کاتێک وەختی جووڵەی شەمەندەفەرەکە نزیک بۆوە لە موسڵەوە بەرەو بەغدا، سێ کەسەکە لە فارگۆنێکی پلە سێدا جێگای خۆیان گرت. لەو فارگۆنەدا دەنگەدەنگێک هەبوو بێ پچڕان. دانیشتوانەکەی پیاوو ژن و پیرو گەنج و چەند منداڵێک بوو. لە کورسیەکەی بەردەم مەجیدیشدا، دوو ژن کەوتنە قسەی "جدیی" لەگەڵ یەکتر. پێدەچوو بابەتەکەیش لە دانیشتووەکان نەشارنەوە:

- ئەو لە موسڵ هەر دەچوو بۆ لای دکتۆر، بەڵام دەرئەنجامی نەبوو .. چووە سەر مەزاری پێغەمبەران و ئەولیاکان، چووە لای کتێبگرەوەیش .. هیچی دەستنەکەوت.

- لە موسڵدا دکتۆری باش نیە خوشکەکەم! هەموو دکتۆرە باشەکان لە بەغدان، یەکێکیان نەبێت کەوتۆتە کەرکوکەوە، ئەوەیان باشترین دکتۆرە. نەخۆشێک نەچۆتە لای چاک نەبووبێتەوە.

- چووە کەرکوک و بەغدایش بۆ سەردانی دکتۆر.

- ئەی لە بەغدا چیان پێگوتبوو؟

- گووتبوویان ئەمە شتێکی سروشتیە؛ هۆکاریش ئەوە نیە کە منداڵی نابێت.

- بێگومان ئەوە هۆکارەکە نیە .. بوونی منداڵ هەر بەدەست یەزدان خۆیەتی.

- دادە! (لێرەدا ژنەکە دەنگی نزم کردەوە) دکتۆر پێی گووتووە: با مێردەکەت بچێتە لای دکتۆر پشکنینێک بکات، ڕەنگە هۆکارەکە ئەو بێت کە منداڵی نابێت.

- ئەی چووە لای دکتۆر؟

- نەخێر، ئەوەی پێ قبوڵ نەبوو .. دەڵێت ئەو پیاوێکی ئاساییە وەک هەموو پیاوانی تر، وە وەک پیاوانی تریشی پێدەکرێت، پێویستی بەوە نیە بچێتە لای دکتۆر .. هەر ژنەکە هۆکارە، هیچ هۆکارێکی تر نیە.

- ئەمەی کردبووە بیانوو بۆ ئەوەی کچێکی تر بهێنێت.

- پێنج ساڵ لەگەڵ ژنی یەکەمدا ژیا منداڵی نەبوو. ژنی دووهەمی هێناو سێ ساڵ لەگەڵی بوو؛ هەر منداڵی نەبوو. ویستی سێهەم ژن بهێنێت، بەڵام برادەرەکەی، حەمدی، ناچاری کرد بچێتە لای دکتۆر. ئەو ئەفەندیە چووە لای دکتۆر، دوو دیناریان لێسەندبوو، پشکنینیان بۆ کردبوو، دەرکەوتبوو کە جەنابی منداڵی نابێت.

- ئەوە بە جددیێتە؟

- بەڵێ، ئێستا هەردوو ژنەکەی وەک دوو خووشک لە ژوورێکدا دەژین پێکەوە!

مەجید گوێی نا لەم قسە خۆشانە گرتبوو کاتێک گەنجێکی گەنم ڕەنگی درێژو باریک و خۆڕێکخستوو بە دوو چاوی زەقەوە. لە جل و بەرگێکی مەدەنیدا، لەپشتیشیەوە پیاوێکی تری مەدەنی و دوو پۆلیس لە تەنیشتیەوە پەیدا بوون. گەنجەکە ڕاستەوخۆ ڕوویکردە مەجیدو عەبدوڵلا کە بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون:

- پێناسەکانتان!

هەردووکیان دەفتەری نفوسەکانیان دەرهێناو دایانەدەست ئەو لاوەی دواتر دەرکەوت ئەمە مفەوەزی فەرمانگەی پۆلیسی نهێنیە. لە پێناسەکەی مەجید وورد بۆوەو گووتی:

- ئەمە دەفتەر نفوسی تۆیە؟
- بێگومان دەفتەر نفوسی منە.
- تۆ گەنجێکی مناڵکارەیت، ماقوڵ نیە ئەمەی لەم دەفتەرەدا نووسراوە تەمەنی تۆ بێت.
- دەتوانیت ئەو پرسیارە لە باوکم بکەیت.
- ئێوە بۆ کوێ دەچن؟
- بۆ بەغدا.
- بۆچی؟
- بۆ سەردانی دکتۆر –مەجید وەڵامی دایەوە، من نەخۆشم. هاتینە سەردانی دکتۆر لێرە، هیچمان نەدۆزیەوە، بۆیە ئێستا دەچین بۆ بەغدا بۆ سەردانی دکتۆری تایبەتی.
- خۆ جوولەکەی ڕاکردوو نین؟
- مەجید لە وەڵامدا گووتی: اشهد ان لا اله الا الله.

- ئەم وەڵامە بۆ مفەوەزەکە چاوەڕواننەکراو بوو. وا هەستی کرد خەتایەکی کردبێت. کەمێک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی بیەوێت هەنگاوی دوای ئەوە بڕیار بدات کە چی بێت. ئینجا بە شێوازە لووتبەرزیەکەیەوە گەڕایەوە:
- سەربازی ڕاکردوو نیت؟
- نەخێر، سەربارزی ڕاکردوویش نیم —مەجید وەڵامی دایەوە.
- کوا کەسی سێهەم کە لەگەڵ ئێوە بوو؟

ئەم پرسیارە سەرنجدانێکی جیددیی دەوێت .. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەم سێ هاوڕێیە لەژێر چاودێریدا بووبێتن بەر لە ئامادەبوونی ئەم مفەوەزە ئێنیە، یان بەر لە هاتنیان بۆ ناو وێستگەی شەمەندەفەرەکە. مەجید بە شریتی ئەو یادەوەریانەدا ڕۆیشتەوە کە ئەو ڕۆژە بەسەریاندا تێپەڕی بوو، ئیتر لە بینینەکەی تاریقەوە هەتا هەر شتێکی تر کە بە نائاسایی دادەنرێت. هەموو ئەمانە بە ئێنی بە زیهنیدا تێپەڕین و لەگەڵ هەوڵی شاردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێکەیدا، وەڵامی دایەوە:

- کەسی ترمان لەگەڵ نیە. ئێمە هەر ئەم دوانەین.
- یەکێکی ترتان لەگەڵ بوو، بۆ کوێ چوو؟
- سوێند دەخۆم کەسمان لەگەڵ نەبوو.
- بیانپشکنن —مفەوەزەکە فەرمانیدا بەوانەی لەگەڵیدا بوون.

پشکنینێکی وورد کران. بە ووردی ئەو پشتیە پەڕەیش بۆ پشکنینی ناواخنەکەی هەڵوەشێنرا کە مەجید هەڵیگرتبوو .. پیاوانی پۆلیسی ئێنی هیچیان نەدۆزیەوە سەرنجڕاکێش بێت بۆیان.

- مفەوەزەکە فەرمانی بە پۆلیسێک کرد کە جێگری عەریف بوو -لێرەدا بوەستە لەلایاندا، خۆیشی لەگەڵ هەموو پیاوەکانیدا ڕووی کردە فارگۆنێکی تر، ڕەنگە بۆ گەڕان بووبێت بەدوای کەسی "وون بووی" سێهەمدا. ئەو سێهەمەیش سەبار

بوو کە نزیک بوو لە هاوڕێکانیەوە، لە سەرەتاوە لەسەر کورسیەکی نزیک دانیشتبوو، بەڵام کاتێک مەفرەزەی پۆلیس لەبەردەمیاندا وەستا، جێگاکەی جێهێشت و خۆی وون کرد.

هەر کە مفەوەز لەچاو وون بوو، نائب عەریف لەسەر کورسیەک دانیشت. پیاوێکی ئەسمەر، چاو بچکۆلە، سمێڵ زل، باڵا مامناوەندی، ئێسقان ئەستوور، بە ڕووخساریشیەوە دیار بوو گوێ بەهیچ نادات و گەمژەیشە. ئەمەیش بۆ ئەم دوو کەسە گومانلێکراوە باشە.

- شتێکمان پێویستە ئەم برسێتیەمانی پێ بکوژین، برام ڕەنگە تۆیش وەک ئێمە برسیت بێت –مەجید ئەمەی بە نائب عەریف گووت، بەڵام ئەم وێستگەیە هیچ خواردنێکی لێنیە بیکڕین.
- چۆن هیچ نیە بخورێت؟ هەموو شتێک هەیە –ئەمە وەڵامی نائب عەریف بوو.
- گەڕام شتێک بکڕم، هیچم نەدۆزیەوە.
- ئا لێرە. لەسەر شۆستەکە، فرۆشیارەکان وەستاون.
- مەجید گووتی: دە تکایە یارمەتیەکمان بدە هەتا شتێک بکڕین و ئێمەیش تۆیش بیخۆین –بەدەم قسەیشەوە نیو دیناری درێژ کرد بۆ پۆلیسەکە، ناتوانین هەموو شەوەکە بە برسێتی بمێنینەوە.

پۆلیسەکە بەر لەوەی وەڵامی ئەو داوایە بداتەوە کە ئاراستەی کراوە کەمێک دوودڵ بوو. ئینجا لە دەرگای شۆستەکەوە دابەزیە سەر شۆستەکە بۆ کڕینی "خۆراک"، مەجیدو عەبدوڵلایش، هێواش و لەسەرخۆ، بە دوایدا دابەزین، بەبێ لەدەستدانی چرکەیەک، وێستگەکەیان جێهێشت و گەڕانەوە بۆ ناوشار هەتا ئەو شەوەیشی تێدا بەسەر ببەن. بێگومان نەدەبوو لە هەمان ئەو شوێنە بخەون کە دوێنێ شەویان لێبردبووە سەر!

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووەمەم، هەردووکیان لە خانووە قوڕینە بچکۆلەکەی گەڕەکی شۆرجە لە شاری کەرکوک دانیشتبوون. تەنها شتێک کە تووشی دڵەڕاوکێی کردبوون، چارەنووسی هاوڕێی سێهەمیان بوو، سەبار، لە دوێنێ شەوەوە لێیان دابڕاوە.

دوای ڕۆژێک، سەباریش لە هەمان خانوودا لەگەڵیان دانیشتبوو، ئەو لە بەغداوە هاتبۆوە. بۆی گێڕانەوە مەفرەزەکەی پۆلیس، بەدرێژایی ئەو شەوە، فارگۆنەکانی شەمەندەفەرەکەیان بۆ دەگەڕان.

* * *

مەجید چەند گۆڕانکاریەکی لە پرۆژەی سەفەرەکەدا کرد بەرەو پایتەخت. گەڕانەوە بۆ پایتەخت پێویستیەکی گرنگەو ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت. باشترین ڕێگا ڕێگای کەرکوک- بەغدایە. لە هەموو شت گرنگتر ئەوەیە بەشێک لە خێزانەکەی عەبدوڵڵا لەگەڵمان بن بۆ بەغدا بە مەبەستی جێگیر بوون لەگەڵیان لە خانوویەکدا بە شێوەیەکی وەختی، هەتا شتەکە بە شێوەیەکی باشتر ڕێکدەخرێت. بەڵام ئایا عەبدوڵڵا قبوڵی پێشنیارێکی لەم چەشنە دەکات؟ ئایا بەشێک لە خێزانەکەی دەنێرێت بۆ بەغدا بۆ ئەرکێکی پڕ مەترسی لەم جۆرە؟

شکی تێدا نیە بەبێ دوودڵی ڕازی دەبێت. ئەم لێکدانەوەیەیش لەوەوە هاتووە کە ئەو پیاوە زۆر لەچاو جارانیدا گۆڕراوە. ئەو بۆتە یەکێک لە خەباتگێڕە شۆڕشگێڕەکان، هۆشیاریەکی باشی هەیە، ئامادەی جێبەجێ کردنی هەرچی شتێکە کە حیزب دەیخاتە ئەستۆی. پێشتر بۆ خۆی و خێزانەکەی دەژیاو بەس، بەڵام ئەمڕۆ بۆ شتێکی گەورەترو مەترسیدارتر دەژی، دەژی بۆ چینێک بە گشتی، بۆ هەموو گەل، بۆ هەموو نیشتمان .. بۆیە دوودڵ نابێت و ڕازی دەبێت لەسەر هەرچی کە حیزب داوای لێبکات.

- مەجید گووتی: باوکی عزیز پێشنیارێکم هەیە! زەحمەتە خۆت بتوانیت هەڵیهێنیت، بەڵام ناهێڵم زۆر بیری لێبکەیتەوە، بەڵکو خۆم بۆت ئاشکرا دەکەم.
- فەرموو، هاوڕێ!
- ڕات چیە ئەگەر لە سەفەری داهاتووماندا بۆ بەغدا، ئەنکی عەزیزو یەکێک لە منداڵە بچووکەکان لەگەڵمان بێن بۆ بەغداو لەوێ ماوەیەکی وەختی لەگەڵماندا بژین، بۆ مانگێک یان زیاتر، هەتا کاروبارمان تەگبیر دەکەین.
- بەسەر سەرم، چۆنت دەوێت ئاوا دەبێت.
- ڕات چیە سبەینێ دەرچین؟
- وای بە باش دەزانم جارێکی تر ڕێی موسڵ نەگرینەبەر.
- لە ڕێگایەکی کورت ترەوە دەڕۆین.
- زۆر باشە. ئەمڕۆ لەگەڵ پیرە قسە دەکەم. بێگومان فیکرەکەی بەدڵ دەبێت، دێت لەگەڵتدا ئەگەر تەنانەت بەپێ هاتووە.

ڕۆژی دواتر "کەژاوە" کەوتە ڕێ بەرەو پایتەخت. سەبار هەر لە پێشدا خانوویەکی ئامادە کردبوو ئەم "خێزانە نوێیە" ی تێدا جێگیر ببێت. ئەو خانووە، یان ئەو نیمچە خانۆچکەیە، لە جێگایەکی نزیک بەو شوێنە بوو کە مەجید بەر لە جێهێشتنی پایتەخت لە کۆتایی ١٩٤٩ دا تێیدا دەژیا.

ئەوە چیە، پایتەخت گۆڕاوە لەم ماوە کورتەدا دوای ڕۆیشتنی مەجید؟

چاو گێڕانێک تێبینی دەکات. شەقامەکان و بازاڕەکان و چایخانەکان هەروەک خۆیانن، ئۆتۆمۆبێلەکان هەروەک ڕابووردوو بە شەقامەکاندا دێن و دەچن، فرۆشیارە گەڕۆکەکان لەسەر شۆستەی شەقامەکان دەوەستن یان بە کۆڵانەکاندا دەڕۆن و بە دەنگی بەرز هاوار دەکەن بۆ کاڵاکانیان .. نە شەقامێکی نوێ، نە بینایەکی تازە، نە حیزبێکی سیاسی نوێ، نە

ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی نوێ لە دایک نەبووە .. ڕژێمی سیاسی هەروەک خۆیەتی، ئەو کێشە سەرەکیەکانی وولات بەدەستیەوە دەناڵێنێت بەبێ چارەسەر ماونەتەوە.

چاو تێبینی گۆڕانێک ناکات لە پایتەختدا یادی بخەیتەوە. دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەکی کورتیش وەک ئەم ماوەیە، ئەمەیش زۆرجار شتێکی لۆژیکیە. بەڵام گۆڕانێک نیە یادی بخەیتەوە، لە هیچ جۆرێک، ئەمە هەرگیز قبوڵ نیە، پایتەخت گۆڕراوە بەبێ شک، لای کەم سەبارەت بەو کارانەی مەجیدو کەسانی وەک ئەو بایەخیان بۆی هەیە زیاتر لە کەسانی تر. ڕێکخراوی شیوعی لە پایتەخت لەم ماوە کورتەدا گۆڕراوە، فراوانتر بووە، پتەوتر بووە لەچاو بەر لە چەند مانگێکدا .. شانەی نوێ پێکهاتووە لە نێوان کرێکاران و خوێندکاران و گەڕەکە میللیەکاندا .. گەشەیەکی نوێ لە ئەندامێتیدا ڕوویداوە، مەعنەویەت ژیاوەتەوە، گەرچی تا ئێستایش داکشان سەروەرە لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیدا، بەڵام هێشتا دەستپێشخەریەکان لە دەستی دوژمناندان.

ئەوەی جێی بایەخە ئەوەیە بەندیخانە سیاسیەکان کە هەزاران تێکۆشەریان هەڵلوشی بوو، لە ماوەی ئەم ساڵ و نیوەدا کە تێپەڕی، دەستی کردووە بە گێڕانەوەی هەندێکیان بۆ ڕیزەکانی سیاسیەکان لە شارە جیاوازەکاندا، بەتایبەت لە پایتەخت، لەبەر ئەوەی حوکمە سووکەکانیان تەواو کردووە.

"ئەمرۆ، کاتێک دەێمەوە پایتەخت، کەسم لەگەڵ نیە لەو هاوڕێیانەی بەر لە چەند مانگێکی کەم، ڕاستەوخۆ خەباتم لەگەڵ دەکردن. هەموویانمان وون کرد، ئیتر ئەمە لە نێوان گیراوو ڕۆیشتوو بۆ شوێنەکانی تر، لە نێوان ئەوانەیشدا خەریکی ئاژاوە نانەوە بوون و بەرگەی هیلاکییان نەدەگرت و ئەوەیان پێ باشتر بوو لەسەر گردێک دانیشن .. هتد". ئەو بیرکردنەوەیە ناخۆشی و ڕەشبینی دەهێنا. بەڵام شتێکی تریش هەیە خۆشی و گەشبینی دەژێنێتەوە. چونکە دەموچاوە نوێکان، پڕ لە حەماس و زیندوویەتی، پڕ لە خۆگری و باوەڕ، زیاتر بوون لەوانەی وون بووبوون. بزووتنەوەی شیوعی وەک ئەو دیاردەیە وایە ژیان

خۆی پێویستێتی، کۆمەڵگا خۆی پێویستێتی. لە کۆمەڵگادا خەڵکی هەن هەموو ڕۆژێک سەریان تیا دەچێت، خەڵکی تریش هەن بەر ڕەحمەتی دایکیان دەکەون و جارێکی تر ڕووناکی دەبینەوەو دەژین.

"کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەتا ئێستا بە پێنج قۆناغدا تێپەڕیوە: کۆمۆنەی سەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداریی، سۆشیالیزم. ئەوەی ئێمە بەختەوەرترین ئەوەیە کە ڕێی لەوە کەوت ئاڵای پیرۆزی خەبات بەرزبکاتەوە بۆ بە ئامانج گەیاندنی حوکمی مێژوو بۆ سەرنگون کردنی سیستمی ئێستا کە لەسەر چەوساندنەوەو سەرکوتکاریی وەستاوە. ئێوە ئەی چەوسێنەرە ستەمکارەکان، لە سزای مێژوو دەرباز نابن .. ڕەنگە زاڵ بوونتان بەسەر وولاتەکەمان و وولاتانی تریشدا چەند دەیەیەک درێژە بکێشێت، بەڵام هەرچۆن بێت کۆتاییتان نزیکە .. ئێوەیش ئەی خەباتگێڕە پاڵەوانە بەندکراوو دوورخراوەکان، میللەت جەزای ئەوەتان دەداتەوە کە بۆتان کردووە .. تۆیش ئەی ڕاسپێردراوی بەکرێگیراوی سەر تەختی عەرش لە ئینگلیزەوە، لەسەر گڕکانێک وەستاویت کە دەبێت هەر بتەقێتەوە! ئێوەیش ئەی جەللادەکانی پشکنینی تاوانکاریی، ئەو قامچیە پیسەی بەکاری دەهێنن لە شکەنجەدانی ڕۆڵەکانی ئەم میللەتەدا، ئەم حوکمە هەڵوەشاوەیەی پێ ڕزگار ناکرێت کە ناچارن بەرگری لێبکەن، هیچیشتان بۆ ناهێنێت سەرشۆڕی و سووک بوون نەبێت .." — مەجید لە ژوورە بچکۆلە قوڕینەکەیدا دانیشتبوو، پشتی نابوو بە دیوارەکەوە، نیوە خەواڵوو نیوە بێدار کاتێک تەقەی دەرگا بە ئاگای هێنایەوە. ئەوە سەبار بوو، بە ئامەو هەواڵەوە خۆی کرد بەژوورا.

تا ئێستا سەبار تەنها هاوڕێیە کە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەو دەزانێت، ئەو ئەڵقەی پێکگەیاندنی نێوان ئەوو هاوڕێیانی ترە.

بەڵام ئەوەی لەم بینینەدا لە نێوان ئەو دوو لاوە شیوعیەدا باسکرا، وە ئەو کێشانەیشی ئەوان و هاوڕێکانیان لە ڕۆژانی داهاتوودا تووشیان بوو، وە ئەو ئەرکانەیشی هەوڵەکانیان

